
الدار العربية للعلوم ناشرون
Arab Scientific Publishers, Inc.

# به دەم ڕێگاوە گوڵچنین

www.iqra.ahlamontada.com
منتدى اقرأ الثقافي

نەوشیروان مستەفا ئەمین

## کتێبی یەکەم

نەوشیروان مستەفا ئەمین

# بە دەم ڕێگاوە گوڵچنین

## کتێبی یەکەم



الدار العربية للعلوم ناشرون ش.م.ل
Arab Scientific Publishers, Inc. SAL

چاپی یەکەم

٢٠١٢ زاینی

ISBN: 978-614-01-0519-5

بە بێ پرسی نوسەر لە چاپدانەوە و کۆپیکردن و لە بەرگرتنەوەی قەدەغەیە

الدار العربية للعلوم ناشرون
Arab Scientific Publishers, Inc.

الدار العربية للعلوم – ناشرون

بناية الريم، شارع ساقية الجنزير، عين التينة، ص ب 5574–13

بيروت–لبنان

تەلەفون: 785107–785108–786233–860138–(+9611)

فاكس: 786230 (+9611)

پۆستی ئەلەکترۆنی: asp@asp.com.lb

نوسەر: نەوشیروان مستەفا ئەمین

دیزاینی هونەری: کاروان مەحمود

بەرگ: علي محمد القهوجي

# رونکردنەوەیەکی پێویست

هەر کەس لە ژیان دا رێگەیەکی گرتوە و. کارێکی کردۆتە پیشەی سەرەکی خۆی، لە پاڵ ئەو کارەدا رەنگە هەندێ کاری لاوەکی تر بکا، یا هەندێ سەرگەرمی تری هەبێ کاتە بۆشەکانی ژیانی تێدا بە سەر بەرێ. یەکێ حەزی لە وەرزشە، یەکێکی تر لە گۆرانی و هەڵپەرکێ، یەکێ حەزی لە سواریە و یەکێکی تر لە راو، یەکێ حەزی لە سینەمایە و یەکێکی تر لە کۆڕی شەوان...
بەندە، رێبواری رێگەی کاری سیاسی بوم، بە هەمو لایەنە جیاوازەکانیەوە: کاری رێکخراوەیی، پێشمەرگەیی، میدیایی... رێگایەک کە خۆم هەڵم بژارد، رێگایەک بو دژوار و سەخت، پڕ لە روداوی خۆش و ناخۆش، پڕ لە گلان و سەرکەوتن، رێگای هات و نەهات، چونی هەبو گەڕانەوەی نەبو، بەڵام بە دەم بڕینی ئەو رێگایەوە، ئەوەندەی بوارم بوبێ و، کاری سەرەکی ماوەی دا بم، خەریکی جێبەجێکردنی سەرگەرمیەکانی خۆم بوم، کە بەشێکی گوڵچنین بوە لە گوڵزاری ئەدەبی کوردی.
رەنگە کەسێ کە لە دورەوە من بناسێ بە لایەوە سەیر بێ، من و بابەتی لەم چەشنە "کوجا مەرحەبا؟"، بەو هیوایەی بەم رونکردنەوەیە توانیبێتم ئەو "گومان" ە بڕەوێنمەوە، بەڵێ ئەمە: چەپکێکە لەو گوڵچنینە!

# بەشی یەکەم: گەڕانەوە بۆ دواوە

# سەرەتاکانی ئەدەبی نوسراوی کوردی

ئەو سەرزەمینەی ئێستا ناوی کوردستانە، لایەکی زنجیرە چیاکانی زاگرۆس و لایەکی میزۆپۆتامیا بوە، یەکێکە لە مەڵبەندە هەرە کۆنەکانی ژیان و نیشتەجێ بونی مرۆڤ. بەردەوام شوێنەواری چەرخە جیاوازەکانی تەمەنی مرۆڤایەتی تیا ئەدۆزرێتەوە. لە هەر یەکێ لەم چەرخانەدا شارستانێتی گەورەی تیا خوڵقاوە. لەوانە شارستانێتیەکانی سۆمەری، بابلی، ئەکەدی، ئاشوری، ئیلامی، حیتی، میدی، ئەشکانی، هەخامەنشی، ساسانی، ئیسلامی. لە ناوچەکەدا، لە ناو جەرگەی ناوچەکەش دا، روداوی گەورەی وەرچەرخێنەری تیا قەوماوە.

کوردستان یەکێکە لە مەڵبەندە کۆنەکانی نیشتەجێ بونی مرۆڤ.

کوردستان چەندین ناوەندی گرنگی شوێنەواری دێرینەی تێدایە کە هەزاران خشتی نوسراوی تێدا دۆزراوەتەوە.

ئەبێ شوێنەوارەکانی کوردستان پاشماوەی کێ بن؟ پاشماوەی گەلانێکن لە ناوچون و کورد هاتۆتە جێگایان یاخود کوردی ئەمڕۆ نەوەی ئەو گەلانەن کە ئەو شارستانێتی‌یانەیان بەرهەم هێناوە؟

ئەگەرچی ئەتەوە دەسەڵاتدارەکانی ئێستا خۆیان ئەکەن بە خاوەنی شارستانێتی ناوچەکە:

عەرەب لە عیراق دا خۆیان بە میراتگری سۆمەری و ئەکەدی و بابلی دائەنێن.

فارس لە ئێران دا خۆیان بە میراتگری هەخامەنشی، ئەشکانی و ساسانی دائەنێن.

تورک لە ئەنەدۆڵ دا خۆیان بە میراتگری حیتی و تورکمان دائەنێن.

کورد کە لە ناو جەرگەی ناوچەکەدا ژیاوە، ئەبێ جێگەی لەم شارستانێتی‌یانەدا کوێ بوبێ؟ پشکی لە دروستکردن و شوێنەواری ئەمانەدا چی بوبێ؟ لە دەرەوەیدا بوە یان ئەویش نەوەی ئەم گەلانە و میراتگری ئەو شارستانێتی و فەرهەنگانەیە؟

گەلانی تر دەوڵەتیان هەبوە، لە بەر ئەوە توانیویانە مێژوی خۆیان بنوسنەوە.

کورد لە بەر ئەوەی دەوڵەتی نەبوە، نەک نەیتوانیوە مێژوی خۆی بنوسێتەوە، بەڵکو مێژوەکەی شێوێنراوە ئەگینا:

کورد و عەرەب کامیان نزیکترن لە شارستانێتی میزۆپۆتامیا؟

کورد و فارس کامیان نزیکترن لە شارستانێتی ساسانی؟

شارستانێتی میزۆپۆتامیا بەرهەمی گەلانی دانیشتوی ناوچەکە بوە، بەر لەوەی شەپۆلی ناری لە قافقاس و شەپۆلی سامی لە جزیرەی عەرەبیەوە بەرەو ناوچەکە بکشێن، بەرهەم هاتوە. باووباپیری کوردیش، کە بە ناوی جیا جیاوە، یەکێ بوە لە گەلە نیشتەجێکانی ناوچەکە بەشی هەبوە لە بەرهەمهێنانی ئەو شارستانێتیەدا.

مخابنە تا ئێستا شوێنەوارناس و مێژونوس و زمانەوانی کورد، بە شێوەیەکی زانستیی و سیستەماتیک، خەریکی لێکۆڵینەوەی پەیوەندی نێوان کورد و گەلانی زاگرۆس و گەلانی میزۆپۆتامیا و گەلانی ئێران نەبون، زۆرتر خەریک بون بە دوبارە وتنەوەی تیۆری هەندێ رۆژهەڵاتناسی ئەوروپایی سەبارەت بە رێچەڵەکی میدیایی کورد و، هاتنی شەپۆل بە دوای شەپۆلی تیرە ناریەکان. بۆ ناوچەکە.

لە کوردستانی عیراق، لە بەرامبەر ساڵی زاینی دا ئێستا بە شانازیەوە ساڵێک دەنوسن، لە ساڵی هیچ میللەتێکی ئەم دنیایە ناچێ، گوایە ئەوە ساڵی کوردیە. لە کاتێک دا ئەگەر یەکێ بە وردی بچێتە بنجوبناوانی مێژوی ئەو ساڵە ئەک داهێنێ ئەوە بکرێتە ساڵی لە دایکبونی کورد، بگرە ئەبو مێژونوسانی کورد خۆیان ئە کردایە بە خاوەنی چونکە ئەوە ساڵێکە وەکو مێژوی ناوچەکە دەیگێرێتەوە، لەو ساڵەدا چەند تیرە و هۆزی درندە و دواکەوتوی ناوچە شاخاویەکان هێرشیان کردۆتە سەر دەینەوای پایتەختی ئیمپراتۆری ئاشوری و، یەکێ لە پێشکەوتوترین شارستانێتیەکانی ئەو سەردەمەیان بە جۆرێ وێران کردوە کە ئیتر هەڵنەساوەتەوە.

سەیر ئەوەیە کورد خۆی بکا بە خاوەنی کارەساتێکی لەو بابەتە و بیکا بە ساڵی لە دایکبونی خۆی کەچی خۆی بە بێگانە بزانێ لە شارستانێتیە گەورەکانی میزۆپۆتامیا و زاگرۆس و ئێران، خۆی بە بێگانە بزانێ لە شارستانێتی سومەری، بابلی، ئاکەدی و خوری و گوتی و لولوبی... لە کاتێک دا، تەنیا لە کوردستانی عیراق دا، هەزاران خشتی نوسراو دۆزراونەتەوە و، سەدان شوێنەواری گرنگ لە هەولێر و کەرکوک و دهۆک و سلێمانی، لە هەورامان، شمشارە، بێتواتە، دەربەندی گاور، بەمۆ، پەیکولێ، پیرەمەگرون، حەوزی حەمرین، کێلەشین، زاخۆ... دۆزراونەتەوە و هەزارانیش لە ژێر خاک دا ماون هێشتا کنە و پشکنینی زانستیان تێدا نە کراوە. ئەگەر دەسکردی خەڵکی ناوچەکە نەبوبێ، داگیرکەر هەرگیز نەیتوانیوە تاشەبەردی ئەو شاخانە هەڵکۆڵێ، پەیکەری لە سەر بنەخشێنێ و نوسینی لە سەر تۆمار بکا.

(بۆ ئاگاداری زیاتر لە سەر شوێنەوارە دێرینەکانی کوردستانی عیراق بروانە:

مديرية الاثار العامة: المواقع الاثرية في العراق، بغداد 1970.

مديرية الاثار العامة: اطلس المواقع الاثرية في العراق، بغداد 1976.

## چاخی ساسانی

پێش هاتنی ئیسلام زۆری سەرزەمینی کوردستان بەشێ بوە لە شاهانشاهێتی ساسانی و، بەشێکی کەمی سەروی رۆژئاوای لە قەڵەمرەوی بیزەنتی دا بوە.

لە ژێر دەسەڵاتی ساسانی دا، ئەگەرچی بەڵگەیەکی ئەوتۆ بە دەستەوە نیە، کە کورد یەکەیەکی رەگەزیی یا بەرێوەبەرێتی کارگێری (ساتراپ) ی جیاوازی هەبوبێ، بەڵام پایتەختی دەوڵەتەکە لە شوێنانی نزیکی ژیانی ئەم دا بوە و هەندێ لە رێگە و وێستگە سەرەکیەکانی وڵاتەکە لە ناو سەرزەمینی ئەم دا بە جێ ماوە. هەمو نیشانەکان وای پیشان ئەدەن کورد بەشێ بوە لە گەلی ساسانی و، بەشێ بوە لە داوودەزگای حوکمرانی و، بەشێ بوە لە سپای ساسانی. زمانی پەهلەوی زمانی کاروباری حوکمرانی و، زمانی سرودە دینیەکانی زەردەشتی و، زمانی نوسینی بابەتی ئەدەبی و بازرگانی و قانونی بوە.

بۆ یەکێ بیەوێ لە سەر ڕوداوەکانی ئەم چاخە و زمانی پەهلەوی و ئەدەبی پەهلەوی و، گۆڕان و پوکانەوەی زمانی پەهلەوی ساسانی، بە تایبەتی لقی خۆر ئاوایی کە کوردیشی گرتۆتەوە ئەتوانێ لەم سەرچاوانەدا بگەڕێ:
محمد تقی بهار: سبک شناسی، تاریخ تطور نثر فارسی، 3 جلد
..............: سبک شناسی، تاریخ تطور شعر فارسی، 3 جلد
دکتر جلیل دوستخواه: اڤیستا کهن ترین سرودها و متنهای ایرانی (جلد اول و جلد دوم)، چاپ پانزدهم، 1389، انتشارات مروارید.

## چاخی سەدری ئیسلام

ئیسلام لە زنجیرەیەک شەڕدا کۆتایی بە حوکمی ساسانی هێنا و، تەواوی ناوچەکەی داگیر کرد. داوودەزگای حوکمڕانی ئیسلامی سەرەڕای لایەنی کارگێڕی و سیاسی، ڕەنگی دینیی بە هەمو دامەزراوەکانی پاشماوەی سەردەمی پێشو و، بە دامەزراوە تازەکانی سەردەمی نوێ بەخشی.
ئیسلام هەروەک کەوتە گرتنەوەی جێگەی دینی ڕەسمیی جارانی زەردەشتی، زمانی عەرەبی زمانی قورئان، کتێبی پیرۆزی خوایی، کەوتە هەوڵی جێگرتنەوەی زمانی پەهلەوی و سڕینەوەی بەرهەمی ئەدەبی ئەو زمانە و، ئەلفبای عەرەبیش کە ئاسانتر بو لە ئەلفبای پەهلەوی جێگەی پێ چۆڵ کرد.
ناوی "کورد" و "الأکراد" وەکو گەلێکی جیاواز لە گەلانی تر، جیاواز لە عەرەب و فارس، لە ڕوداوەکانی ئەم چاخەدا ئیتر ئەنوسرێ و دوبارە ئەبێتەوە.

## چاخی ئەمەوی (661–750 ز)

عەرەب، بەر لە فەتحی ئیسلامی، خاوەنی شارستانی بون، بەڵام شارستانێتی عەرەبی لە دواوەی شارستانێتیەکانی ساسانی، بیزەنتی، قیبتی بو. زەمانێکی ویست تا بتوانێ ئەم شارستانێتیە گەورانە هەڵ لوشێ. بۆیە بە درێژایی ماوەی فتوحات و، تەنانەت دوای جێگیربونی دەسەڵاتی عەرەبی– ئیسلامی، سەردەمی ئەمەوی، کە بە معاویەی کوڕی سوفیان دەس پێ ئەکا (661-680 ز) لە هەمو ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا ئەیانتوانی، دەس لە بەکارهێنانی زمانەکانی گەلانی ناوچەکە هەڵبگرن:
لە عیراق و ئێران زمانی پەهلەوییان لە دیوانەکانیان دا بە کار هێناوە.
لە شام زمانی یۆنانییان بە کار هێناوە.
لە میسر و سەروی ئەفەریقا زمانی قیبتییان بە کار هێناوە.
بۆ یەکەم جار لە سەردەمی عەبدولمەلیک کوڕی مەروان بڕیاری گۆڕینی زمانی ڕەسمیی دیوانەکان درا و تەعریب کرا.

### تەعریبی زمان

عەبدولمەلیک کوڕی مەروان (65-86 ک) دیوانەکانی تەعریب کرد و، تا ئەوسا بە دینار و درهەمی ڕۆمی و ئێرانی سەودا و مامەڵە کرا، مەروان ئەمەشی گۆڕی و، ئیتر سکەش بە زمانی عەرەبی لێ درا و، دراو بە زمانی عەرەبی ئایەت و ناوی خەلیفە و شوێنی دارشتنی لێ ئەنوسرا.
ساڵی 81 ک لە شام و ساڵی 82 و 83 ک لە عیراق، حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی (41-95 ک) دیوانەکانی تەعریب کرد.

ساڵی 142 ک لە خوراسان زمانی دیوانەکان تەعریب کرا. پرۆسەی تەعریب لەوێ دواکەوت بو چونکە دورەدەست بو.
هەروەک دیوانەکانیان تەعریب کرد، ئەلفباکەشیان گۆڕی. ئەلفبای پەهلەوی ژمارەکانی زۆرتر و فێربون و نوسینی گرانتر بو، ئەلفبای عەرەبی کە ئاسانتر و حەرفەکانی بە ژمارە کەمتر بو، جێگەی گرتەوە و ئەویان لە بواری بە کار هێنان دا ئەما و، لە بیر چوەوە. ئەمیان خرایە بواری بە کارهێنانەوە، ساڵ لە دوای ساڵ زیاتر گەشەی کرد و پێشکەوت. ئیتر زمانی عەرەبی بو بە زمانی رەسمی، زمانی دەسەلاتی "فاتیح". کارمەندانی دەزگای حوکمڕانی و، خوێندەوار و ڕۆشنبیرەکان هەوڵیان ئەدا فێری بن و، پێی بنوسن و، بەو هۆیەوە خۆیان لە دەسەلاتدارانی سەردەم نزیک بخەنەوە.

## شعوبیه

فتوحاتی ئیسلامی ناوچەیەکی زۆر فراوانی هێنایە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە. نەتەوەی جیاواز و دینی جیاواز و کۆمەڵی جۆراوجۆری کەوتە ژێر دەست.
لە ژێر سایەی خەلافەتی ئەمەوی دا چەند جۆر خەڵک هەبون:
قەبیلەکانی عەرەب، کە موسوڵمان بون و، ئیسلامەتییان بڵاو ئەکردەوە، خۆیان بە خاوەنی دین و دەوڵەت ئەزانی و، گەورە کاربەدەستان لەمان بون.
مەوالی، ئەو ڕەگەزانە بون عەرەب ئەبون، ئیسلامەتیان بە زۆر یان بە خۆشی قبوڵ کرد بو. ئەمانە چ وەکو تاک یان بە کۆمەڵ وەکو عەشیرەت ئەبو وەلانی خۆیان بۆ عەرەب دەربڕن و، ناوی یەکێ لەو قەبیلە یا بنەماڵە عەرەبانەیان هەڵ ئەگرت.
ئەهلی زیمە، پێڕەوانی دینی یەهودی، مەسیحی و هەندێ جار سابیئەی مەندایی و مەجوس. ئەمانە "جزیە" یان لێ ئەسەندن، کە باجی سەر بو، بەرامبەر بەوەی لە دار ئەل ئیسلام دا بە سەلامەتی ئەژین.
ئەگەرچی ئەمەویەکان بە بێ کارمەندانی ئێرانی کاروباری وڵاتەکەیان بۆ بەڕێوە ئەچو، بەڵام بە چاوی سوک لە موسوڵمانانی ناعەرەبیان ئەڕوانی و، لە پلەی دوەمی هاوڵاتی دا بون. تەنانەت دوای ئەوەی موسوڵمان بوبون جزیە لە سەر ئەمان ئەبو. جزیە تەنیا لەوانە وەرئەگیرا کە لە سەر دینەکانی خۆیان مابونەوە. بەڵام لە سەردەمی ئەمان دا لەگەڵ زیادبونی مەسرەفی خێزان و بنەماڵە و دەربار و داوودەزگای حوکمڕانی ئەمەوی، پێویستیان بە داهاتی زۆرتر بو، لە بەر ئەوە سەرانەیان خستە سەر هەمو مەوالی، کە بریتی بون لە هەمو ئەو قەبیلە و قەومانەی عەرەب ئەبون و ئیسلام بوبون. ناکۆکی نێوان هەستی خۆبەزلزانی عەرەب لە لایەک و خوازیارانی یەکسانی موسوڵمان، عەرەب و ناعەرەب لە لایەکی ترەوە کە پشتیان ئەبەست بە " انا خلقناکم شعوبا و قبائل" و "لا فرق بین عربي و عجمي الا بالتقوی" و "ان اکرمکم عندالله اتقاکم." قوڵایی سیاسی، ئابوری و لایەنی ئایدیۆلۆجی گرتەوە و زەمینەی فیکری، سیاسی، کۆمەڵایەتی چەندین جوڵانەوەی خوڵقاند، لە بابەتی بزوتنەوەی شعوبیه، کە بزوتنەوەیەکی فکری بو بە بەرگی سیاسیەوە.
هەمو موسوڵمانێ، عەرەب بوبێ یا لە ڕەگەزێکی ناعەرەب، ئەبو پیرۆزی و گەورەیی زمانی عەرەبی، کە "زمانی قورئان و گفتوگۆی مەلائیکەتەکان و ئەهلی بەهەشتە"، بسەلمێنێ. "انا انزلناکم قرآنا عربیا". هەمو موسوڵمانێ ئەبو شایەتمان، کە یەکەمین مەرجی باوەڕهێنانە و نوێژکردن، کە هەمو ڕۆژێ پێنج جار دوبارە ئەبێتەوە و هەندێ دوعای زەروری بە زمانی عەرەبی لە بەر بکا و فێربێ.
تەنیا جێگەی کە خەڵک ئەیتوانی تیا بخوێنێ، مزگەوت و مەدرەسە دینیەکان بو. ئەویش بە عەرەبی تیا ئەخوێنرا. هەر بۆیە لە ماوەیەکی زۆر کەم دا زمانی عەرەبی، کە بو بە زمانی دین و دەسەلات، بڵاو بوەوە و،

گەشەی کرد. لە سەر زانستەکانی زمان و دین سەدان کتێبی گرنگ نوسران. هەزاران وشەی عەرەبی تێکەڵاوی زمانی رۆژانەی گەلە ناعەرەبەکان بو.

لە چاخی دەوڵەتی ئەمەوی دا هیچ تێکستێکی ئەدەبی کوردی لە بەر دەس دا نیە. فارسیش جگە لە هەندێ بەشی ئاوێستا کە ئەوەی ساڵانێکی دواتر نوسراونەتەوە، شتێکی ئەوتۆ بە دەستەوە نیە.

ئیبن ئەل موقەفەع (106-142 ک) کە سەرەتا ناوی روزبەی کوری دادوێ بو. دوای ئەوەی موسوڵمان بو، ناوی خۆی گۆڕی بۆ عەبدوڵا. موقەفەع واتە دەست گێڕ. چونکە حەجاج دەستی باوکی شکاند بو. ئیبن ئەل موقەفەع چەندین کتێبی لە زمانی پەهلەویەوە کردوە بە عەرەبی لەوانە: کلیلە و دمنە، تاجنامەی ئەنوشیروان، ئایین نامە، سوخەنوەری بزورگ (الادب الکبیر)، سوخەنوەری خورد (الادب الصغیر).

لەم سەردەمەدا چەندین کتێب بە عەرەبی نوسراون. باسی شەڕوشۆڕی کورد و ئەمیر و سەرداره جەنگیەکانی ئەکا. بەڵام ئاماژەی بۆ ئەدیب و ئەدەبی نوسراوی کوردی، چ شیعر بێ یان پەخشان، تێدا نیە. بەڵام لە ناو ئەو سەدان کتێبەدا کە لەو سەردەمەدا و دواتر بە عەرەبی نوسراون، هەندێکیان کورد نوسیونی، بەڵام بە زمانی عەرەبی. لەوانە:

ابو حنیفة الدینوري (828 - 896 ز/ 288 ک)

ابن قتیبة الدینوري (828 - 889 ز/ 213 - 276 ک)

ابن الاثیر الجزري (1160- 1233 ز/ 555 - 630 ک)

ابن الصلاح الشهرزوري (577 - 643 ک)

ابن خلکان (1211- 1282 ز/ 608 - 681 ک)

## چاخی عەباسی (750 – 1258 ز)

بە هاتنی مەغۆل و کوشتنی خەلیفە کۆتایی دێ (656 ک/ 1258 ز)

لە سەردەمی عەباسی دا، کە ئیمپراتۆرەکە لە بەر فراوانی لە کەنارەکانی دا هەندێ بنەماڵەی بومی بوژانەوە و دەسەڵاتی خۆجێیی دروستبون. لەم ناوچانەدا زمانی فارسی کەوتە بوژانەوە.

خەلافەتی عەباسی بە جۆرێ فراوان بوبو لە باکوری ئەفەریقاوە تا سنوری چینی گرتبوەوە. خوراسان کە ناوچەیەکی دورەدەستی دەسەڵاتی بەغداد بو لە لایەن خەلیفەکانی عەباسیەوە سپێردرا بو بە بنەماڵەی سامانی.

ئەمارەتی سامانی (279 - 389 ک/ 892 - 999 ز) کە لە خوراسان دا دامەزرا، زیاتر لە سەدەیەک مایەوە. لە سەردەمی ئەم بنەماڵەیەدا ئەدەبی ئێرانی سەرلەنوێ هەستایەوە. لە دەرباری ئەم ئەمیرانەدا ژمارەیەک شاعیر و نوسەر کۆبونەوە سەروەریەکانی رابوردوی ئێرانیان زیندو کردەوە. رودەکی (329 ک/ 941 ز مردوە) کە بە باوکی شیعری فارسی دائەنرێ لێرەوە سەری هەڵدا. کلیلە و دمنەی لە پەهلەویەوە بە شیعری دوبەیتی مەسنەوی وەرگێڕاوە بۆ سەر فارسیی دەری، هەروەها سندبادنامەشی هەر وەرگێڕاوە. جگە لە شیعری ستایشی ئەمیرەکانی سامانی.

لە چاخی ساسانی دا پەهلەوی زمانی رەسمی، لە هەمان کات دا، زمانی شیعر و ئەدەب بو، بەڵام لە چاخی سامانی دا زمانی پەهلەوی و ئەلفبای پەهلەوی باوی نەما بو. زمانی "فارسیی دەری" کە زمانی دانیشتوانی ناوچەکە و یەکێ لە لقەکانی زمانی پەهلەوی بو، بە ئەلفبای عەرەبی، بو بە سەرەتای دەس پێ کردنی ئەدەبی فارسی دوای دەسەڵاتی عەرەبی - ئیسلامی لە خوراسان دا و، زۆری نەخایاند سەرانسەری ئێرانی گرتەوە.

بۆ یەکێ بیەوێ لە سەر مێژوی ئەدەبی فارسی ئاگاداری وەربگرێ ئەتوانێ لەم سەرچاوانەدا بگەڕێ:
ادوارد براون، تاریخ ادبیات ایران، ئەم مێژوە چوار (جلد) ە:
جلد اول. از قدیمترین ایام تا عصر فردوسی، ترجمه علی پاشا صالح، انتشارات مروارید.
جلد دوم، از فردوسی تا سعدی، ترجمه و حواشی بقلم فتح الله مجتبائی، انتشارات مروارید.
جلد دوم، از فردوسی تا سعدی، نیمه دوم، ترجمه غلامحسین صدری افشاری، انتشارات مروارید.
ئەم مێژوە چەند جارێ تەرجومە کراوە و چەندین جار چاپ کراوە.
هەروەها
ذبیح الله صفا، تاریخ ادبیات ایران، جلد 1 و 2.

بۆ یەکێ بیەوێ لە سەر مێژوی ئەدەبی عەرەبی ئاگاداری وەربگرێ ئەتوانێ لەم سەرچاوانەدا بگەڕێ:
جرجي زيدان، تاريخ اداب اللغة العربية، اربع مجلدات.
حنا الفاخوري، تاريخ الادب العربي.
حنا الفاخوري، الجامع في تاريخ الادب العربي، الادب القديم. منشورات ذوي القربى.
حنا الفاخوري، الجامع في تاريخ الادب العربي، الادب الحديث. منشورات ذوي القربى.

# نیگایەکی تر لە
# بەردە نیگارینەکەی دەربەندی گاور

لە چەند جێگەی سەختی کوردستانی عیراق لە سەر تاشەبەردی شاخەکانی نیگاری جۆراوجۆر نەخشێنراوە. هەندێ لەمانە کەموزۆر بابەتیان لە سەر نوسراوە. بەڵام تا ئێستا شوێنەوارناسی شارەزای کورد لێکۆڵینەوەی زانستی نەکردوە و، هەلومەرجی نائارامی سەدەی بیستەم زەمینەیەکی لە بار نەبوە بۆ کاری پشکنین و گەڕانی ئارکیۆلۆجی. بۆیە زۆری ئەو بابەتانە ئەوی دیارن و دۆزراونەوە هەندێکیان هێشتا وەکو مەتەڵی هەڵنەهێنراو ماونەتەوە، چ جای ئەوانەی هێشتا لە ژێر گڵ دان، یا بە نەناسراوی فەرامۆش کراون.

لە ناو بەردە نیگارینەکان دا، ئەوەی لێرەدا قسەی لە سەر ئەکرێ نەخشەکەی "دەربەندی گاور" ی ناو شاخەکانی قەرەداخە کە بە ناوی "نارام سین" ەوە ناوی دەرکردوە.

نارام سین ئەوەی سەرجۆنی ئاکەدی بوە. لە سەدەی بیست و سێیەمی پێش زاین دا شای وڵاتی ئاکەد بوە. لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەم دا لە چەندین ناوچەی وڵاتەکەی دا یاخیبون و هەڵگەڕانەوە و شۆڕش روی داوە. چەند جارێ هێرشی کراوەتە سەر. ئەویش زنجیرەیەک لەشکرکێشی کردوە بۆ سەر رۆژهەڵات و رۆژئاوا و، باشور و باکوری وڵاتەکەی لەوانە بۆ سەر مەڵبەندی ژیانی گەلی لولوبی. لە شەڕێک دا لە گەڵ گوتیەکان سەری تێ دا چوە (2201 – 2202 پ ز)[1]

نارام سین گۆیا لولوبیەکانی لە شەڕێک دا شکاندوە کە شاکەیان، ساتونی، سەرکردایەتی کردون. سەرکردەکانی بە دیل گرتون و وڵاتەکەی داگیر کردون. بە پێی لێکۆڵینەوەی شوێنەوارناسەکان، بۆ یادەوەری پیرۆزیی ئەم روداوە گەورەیە "کێلی سەرکەوتنی" لە بەرد داتاشیوە و لە پایتەختەکەی دا چەقاندویەتی. لەو کێلەدا خۆی وەکو قارەمانێکی خاوەن زۆر و توانا هەنگاو ئەنێ و لولوبیەکانیش بە شکاوی لە بەر پێی دا کەوتون.

کێلەکە نزیکەی دو مەتر بەرزە. لە بەرد داتاشراوە. نارام سین خۆی کەوایەکی کورتی لە بەردایە، سنگی روتە، تیر و کەوان و تێڵای پێیە. کڵاوێکی لە سەردایە کە دو شاخی پێوەیە، ئەوەش بە پێی لێکدانەوەی شوێنەوارناسەکان نیشانەی "خوایاندن: تألیه" ی نارام سین بوە.

له هێرشێک دا که ئیلامیەکان کردویانه بۆ سەر "سیپار" و ئاکەدیەکانیان شکاندوه و شار و ئاواییەکانیان تالان کردون، یەکێ له دەسکەوتەکانی ئەو تالانیه ئەم کێله بوه که لەگەڵ خۆیان بردویانەتەوه بۆ وڵاتەکەی خۆیان. تیمێکی ئارکیۆلۆجی فەرەنسی به سەرپەرشتی دومۆرگان ساڵی 1901 له "سوسه" دۆزیویانەتەوه و بردویانەتەوه بۆ فەرەنسا له "مۆزەی لوڤەر" دایان ناوه.(2)
(بڕوانه نیگاری ژماره 1: کێلی سەرکەوتنی نارام سین)

## لولوبیەکان کێ بون؟

زنجیرەی چیاکانی زاگرۆس و بنارەکانی و داوێنەکانی چەندین گەل و خێڵی تێدا ژیاوه. یەکێ لەو گەلانه لولوبیەکان بوه. مەڵبەندی ژیانی لولوبیەکان شارەزور بوه. لولوبیەکان هاوزەمانی سومەری و ئاکەدی و بابلیەکان بون. ئەوەی ساغ بۆتەوه لولوبیەکان له رەگەزی "سامی" نین.
مێژونوس و شوێنەوارناسەکانی عەرەب، به تایبەتی ئەوانەی عیراق، هەروەها ئەوانەی که جولەکەن، هەوڵێکی زۆریان داوه بۆ ئەوەی شارستانێتی میزۆپۆتامیا، به تایبەتی ئاکەدی و بابلی و ئاشوری، بکەن به شارستانێتیەکی "سامی". تا ئێستا نەیانتوانیوه رەگەزی سۆمەری بیەنەوه سەر گەلانی سامی و نەیانتوانیوه رەگەزی گەلانی زاگرۆس دیاری بکەن. که باسی گەلانی زاگرۆس ئەگێڕنەوه به شەڕاوی و دواکەوتوی دور له شارستانێتی باسیان ئەکەن. زۆر لەو مێژونوسانەش که باسی لولوبیەکان ئەکەن به گەلێکی شەڕانی و دواکەوتوی دائەنێن که سەرومڕ له کێشه و ئاکۆکی دا بون له گەڵ شارستانێتی میزۆپۆتامیا و، به یەکێ له هۆکانی هەرەس و کۆتایی ئەو شارستانێتیەیان دا ئەنێن.
هەواڵی لولوبیەکان، چەند جارێ، له لاوژه و داستان و بەڵگەکانی ئەو سەردەمەدا هاتوه: له کێلی سەرکەوتنی نارام سین دا، له هەندێ له خشته نوسراوەکانی شمشارەدا، له مۆنۆمێنتی ئانو بانینی سەرپولی زەهاودا، له بەرده نوسراوەکانی بێتواته و هەڵەدنی دا، هەروەها له لاوژەی لوگالباندا و مەلی ئانزود و، له لاوژەی نارام سین دا، ناوی لولوبی باس کراوه.
دانەری "لاوژەی نارام سین" روخساری لولوبیەکانی به قەلەڕەش و بیچمیانی به داڵ شوبهاندوه. گوایه شاکەیان و باوکیان ناوی "ئانو بانینی" و شاژنەکەیان و دایکیان ناوی "مالیلی" بوه. حەوت برا سەرکردایەتی لەشکرەکەیان کردون. له چیاکانەوه هاتونەته خوارەوه هێرشیان هێناوه. باسی چەند شەڕێ ئەکا که لولوبیەکان به جۆرێکی ئەوەنده سەخت لەشکرەکەی نارام سینیان شکاندوه گەیشتۆته ئەو باوەڕەی لولوبیەکان مرۆڤ نەبن و شەیتان بن. ئەفسەرەکانی راسپاردوه چەند کەسێکیان لێ به دیل بگرن تاقیکردنەوەیان له سەر بکەن. به تیر کەللەسەریان کون بکەن بزانن خوێنیان لێ دێ یا نا. ئەگەر خوێنیان لێ بێ ئەوا دیاره ئەوانیش مرۆڤن و ئەتوانرێ بشکێنرێن و له ناو ببرێن، ئەگەر خوێنیان لێ نەیەت ئەوا ئەوان دێو و درنج و شەیتانن، چار ناکرێن و ئەبێ له دەستیان را بکەن. له بەر ئەوەی که سەری دیلەکانیان بریندار کردوه و خوێنیان لێ هاتوه بۆیان دەرکەوتوه ئەوانیش وەکو ئەمان مرۆڤی ئاسایین ئەوسا پەلاماریان داون و شکاندویانن.(3)
تا ئێستا، ئەوەندەی بەنده ئاگاداری بێ، لێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەنەی تێروتەسەل تایبەت به گەلی لولوبی نەکراوه. زانیاریەکانی هەن کەم و ناتەواون. ئەوانەش که له سەریان نوسیون هەمان زانیاریەکانی پێش خۆیان دوباره کردۆتەوه. رەنگه لێکۆڵینەوەی ئارکیۆلۆجی و ئەنترۆپۆلۆجی و فیلۆلۆجی له پاشەرۆژدا بتوانێ هەندێ لایەنی تاریکی مێژوی گەلی لولوبی زاگرۆسی رون بکاتەوه.
لولوبیەکان، یەکێکن لەو گەلانەی نەتەوەی کوردی ئێستایان پێک هێناوه.

ناو، بە تایبەتی ناوی کۆن، بۆ لێکۆڵینەوەی مێژویی گرنگیەکی تایبەتی هەیە. ساخکردنەوەی و چونە بنجوبناوانی رەنگە هەندێ جار یارمەتیدەر بێ بۆ روناک کردنەوەی هەندێ لایەنی تاریکی قۆناغەکانی رابردو.
ناوچەی قەرەداغ، وەکو زۆر ناوچەی تری کوردستان، کە بە درێژایی زەمان، مەڵبەندی ژیانی مرۆڤ بوە، ناوچەیەکی دەوڵەمەندە لە بواری ناوی کۆن دا. ناوی شاخ و لوتکە و بەشەکانی، ناوی کانی و چەم و روبار و کارێز و ئەستێڵ و بیرەکانی، ناوی گوند و زەویەکانی و ناوایی و کاولەکانی... تۆمارکردن و ساخکردنەوە و لێکدانەوەیان، دۆزینەوەی رەگ و بنجەکانیان بە یارمەتی فەرهەنگی زمانە زیندوەکان و، بە یارمەتی فەرهەنگی زمانە مردوەکان... ئەشێ هەندێ مەتەڵی هەڵنەهێنراو بۆ توێژەرەکان رون بکەنەوە.
زنجیرەی شاخەکانی قەرەداغ کە سەرێکی دەربەندی بازیانە و سەرێکی تری دەربەندی خانە، چەندین دەربەندی تێدایە، لەوانە: دەربەندی باسەرە، دەربەندی سەگرمە، دەربەندی ئەستێڵ، دەربەندی گۆشان، دەربەندی گاور...
باسەرە: وەکو (فرهنگ فارسی، دکتر محمد معین) لێکی داوەتەوە، وشەیەکی پەهلەویە واتە: "زەویەک کە بۆ کشتوکاڵ ئامادە کرابێ. کشت زار". جگە لەم دەربەندە گوندێکیش لە بناری کۆسرەت ناوی باسەرەیە. ئێستا ئەم وشەیە لە زمانی گفتوگۆی جوتیارانی کورد دا لە بیرچۆتەوە و، بە کار ناهێنرێ، بەڵام لەم دو ناوەدا ماوە.
سەگرمە: وەکو (فرهنگ فارسی، دکتر محمد معین) لێکی داوەتەوە، وشەیەکی کۆنە، واتە: "ناوچەوان، تەوێڵ، جەبهە، هەروەها خەتی ناوچەوان". ئێستا ئەو وشەیە لە زمانی گفتوگۆی کوردی دا لە بیر چۆتەوە، بە کار ناهێنرێ. بەڵام لەم ناوەدا ماوە.
گاور: ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ وشەی "گبر" ی زەردەشتی یا هەر مەبەستێکی تر. کورد لە بەکارهێنانی وشەی "گاور" مەبەستی "کافر" بوە، ئێستاش هەروایە. بە زۆری بە شوێنەوارە دێرینەکانی پێش ئیسلام وتراوە: "گاورکرد" واتە دەسکردی کافرەکان. بەم تێگەیشتنە کە زۆرایەتی گەلی کورد موسوڵمان بون تێکدان و خراپکردنی شوێنەوارە کۆنەکانیان بە کارێکی ئاسایی زانیوە.

ئەو دەربەندەی قەرەداخیش ناو نراوە "دەربەندی گاور" چونکە لە سەر روی لایەکی شاخەکەی ناو دەربەندەکە نەخشی کەسێ کێشراوە کە بە پێی تێگەیشتنی دانیشتوانی ناوچەکە کافر بوە. زۆر لەوانەی لەوێوە تێ پەڕیون ئەگەر بۆیان کرابێ زەرەرێکیان پێ گەیاندوە، بە تایبەتی لەو کاتەوە کە تفەنگ پەیدا بوە. یەکەم کەسی کە بایەخی بە نەخشەکەی دەربەندی گاور دابێ ئەدمۆندس بوە. ئەدمۆندس زانای شوێنەوارناسی نەبوە. ئەدمۆندس لە بیستەکانی سەدەی بیستەم دا بۆ راونانی شێخ مەحمود ئەفسەری سیاسی هێزەکانی بەریتانیا بوە لە ناوچەی سلێمانی و، دواتریش راوێژکاری سیاسی وەزارەتی ناوخۆی حکومەتی عیراق بوە. ئەدمۆندس خۆی لە کتێبەکەی دا بە ئینگلیزی: "کورد و تورک و عەرەب" چیرۆکی سەردانی بۆ ئەم نەخشە ئەگێڕێتەوە.
ئاغایەکی جافەرانی سەیرانێکی بۆ ئەدمۆندس ساز کردوە. لە سەر خوانێکی رازاوە میوانداریی ئەو و کۆمەڵێ کەسایەتی ناوچەکەی کردوە. ئەدمۆندس لە پەراوێزی ئەم سەیرانەدا داوای لێ کردون بیبەن بۆ سەیری بەردە نیگارینەکەی دەربەندی گاور. لە بەر ئەوەی رێگەی ئۆتۆمۆبیلی نەبوە بە سواری بە رێ کەوتون و بەشێکی رێگەکەشیان بە پێ بریوە تا گەیشتونەتە شوێنی مەبەست. ئەو کاتە هێشتا تفەنگ و چەکی ئاگربار لە ناو خەڵکی ناوچەکەدا زۆر نەبوە و، هاتوچۆی رێبواریش بە ناو دەربەندەکەدا کەم بوە، لە بەر ئەوە گەیاندنی زەرەری مرۆیی بە نەخشەکانی بەردەکە لە چاو گەیاندنی زەرەری سروشتی دا کەمتر بوە، ئەوسا سیمای کەسەکانی نیگارەکە لە ئێستا زەقتر دیار بوە.

ئەدمونس بەرزیی باڵای قارەمانە راوەستاوەکەی ناو مۆنۆمێنتەکەی بە دە پێ خەمڵاندوە، هیچ نوسینێکی بە "خەتی مێخی" لە سەر نەدیوە. بە دەستی چەپ کەوانی هەڵگرتوە و دەستی راستی لە سەر شیرێکی شاهانە داناوە. پەنجەکانی موستیلەیان تێدایە و پشتێنێکی لە پشت دایە چوار قەدە. سنگی روتە و کەواکەی تا سەر ئەژنۆیە. زۆر و توانا لە لەش و بازوی دا بینراوە. قاچی چەپی بەرز کردۆتەوە وەکو بە شاخ دا سەر بکەوێ، چەند کەسێ لە بەر پێی دا کەوتون. گەورەیی لەشی کەوتوەکان چواریەکی لەشی قارەمانەکەیە.[4]
پێ ئەچێ ئەدمۆنس وێنەکانی نەخشەکەی دەربەندی گاور، کە بە دەزگای فۆتۆگراف گرتویەتی، و زانیاریەکانی لە سەر شێوەی مۆنۆمێنتەکە، دابێ بە سێر سدنی سمیس، کە ئەوەدەم دامەزرێنەر و بەڕێوەبەری گشتی شوێنەواری عیراق بوە، ئەویش لێی کۆڵیوەتەوە و، بە پێی لێکدانەوەی خۆی هەندێ لە یەکچونی دیوە لە نێوان ئەم نەخشە و ئەو کێلەی نارام سین کە لە سوسە دۆزراوەتەوە و لە مۆزەی لوڤەر لە فەرەنسا دانراوە. بە بیانوی ئەم لە یەکچونەوە سمیس وای داناوە ئەمیش پەیکەری نارام سینە بە بۆنەی شکاندنی لولوبیەکانەوە لەم دەربەندەدا نەخشاندویەتی. بە دوای ئەودا ئیتر هەرکەس، لە بێگانە و لە کورد، باسی ئەم نیگارەی کردبێ هەمان قسەی دوبارە کردۆتەوە. یەکێ لەوانە خانمێکی ئەڵمانیە، د نیڤا شترۆمنکر، کە ساڵی 1960 بە ئاگاداری فەرمانگەی شوێنەواری عیراق سەردانی دەربەندی گاوری کردوە و وێنەی بەردەکەی گرتوە و نیگاری کێشاوە. بۆچونەکەی ئەویش نزیکە لە هەمان بۆچونەکەی سمیس بە هەمان بیانوی ئەوەی کە سەروسەکوتی قارەمانی نیگارەکەی دەربەندی گاور و قارەمانەکەی کێلی سەرکەوتنی نارام سین لە یەک ئەچن.[5]
(بڕوانە نیگاری ژمارە 2: مۆنۆمێنتی دەربەندی گاور)

نیگایەکی ورد لە نیگاری گاورەکەی قەرەداخ و بەراوردکردنی لە گەڵ هەندێ نیگاری هاوشێوەی دا سەیرکەر ئەخاتە گومانەوە، گومان لە دروستیی ئەو لێکدانەوەیەی کە نەخشەکەی دەربەندی گاور نەخشی نارام سین بێ، لە بەر ئەوەی:

یەکەم، لە سەر بەردە نیگارینەکەی دەربەندی گاور هیچ نوسینێ، بە خەتی مێخی یا بە خەتێکی تر، نیە تا بکرێتە بەڵگەی ئەوەی بێ دوڵی بوترێ ئەم نەخشە هی نارام سینە یا هی کەسایەتیەکی ترە.

دوەم، هاوشێوەی ئەم نەخشە، کە قارەمانێ بە پێوە راوەستاوە و، چەند دیلێ لە بەر پێی دا بە کەساسی کەوتون، چەندین نەخشی تر لە تاشەبەردەکانی ئەو ناوچەیەی کوردستان دا تاشراون، کە هی نارام سین نین، لەوانە:
نەخشێ لە سەرپولی زەهاوی سەر بە ئوستانی کرماشان، لە کوردستانی ئێران، کە نوسینی لە سەرە و دوای خوێندنەوەی دەرکەوتوە کە نەخشی شای لولوبی "ئانو بانینی" ە. ئەم نەخشە بە پێچەوانەی کێلی سەرکەوتنی نارام سینەوە، ئانو بانینی، شای لولوبی، دوژمنەکانی شکاندوە و لە بەر پێی دا بە کەساسی کەوتون و، پێی لە سەر سنگی یەکێکیان داناوە و، دوانیش بە دەستبەستراوی خۆیان خزاندۆتە پشتی ماخوا نینی و، شەشی تریش بە روتوقوتی لە ژێر پێیەوە ریز کراون. بە خەتی مێخی و بە زمانی ئاکەدی لە تەنیشتیەوە نوسراوە: "ئانو بانینی شای لولوبوم نیگاری خۆی و نیگاری نینی لە کێوی باتیر کێشاوە. ئەو کەسەی ئەم تەختە بسڕێتەوە گرفتاری نەفرینی ئانو، ئانونوم، بەل، بلیت، رامان، ئیشتار، سین و شاماش بێ و وەچەکانی تەفروتونا بن."[6]
(بڕوانە نیگاری ژمارە 3: مۆنۆمێنتی سەرپولی زەهاو)

نەخشێ لە دەربەندی بێلولە (هۆرین و شێخان) لە قەزای دەربەندیخانی پارێزگای سلێمانی، قارەمانەکە کە ڕەنگە یەکێ بێ لە سەردارەکانی ناوچەکە بە پێوە ڕاوەستاوە دیلێکی لە بەر پێ دایە و دیلێکی تریش دەستی پارانەوەی بۆ بەرز کردۆتەوە. ستونێ نوسینی بە "خەتی مێخی" لە سەرە، هێشتا بە تەواوی لێکۆڵینەوەی لە سەر نەکراوە.(7)

(بڕوانە نیگاری ژمارە 4: مۆنۆمێنتی دەربەندی بێلولە)

جگە لەمانە چەندین نەخشی تر هەن کە هێشتا لێکۆڵینەوەیان لە سەر نەکراوە، یان لێکۆڵینەوەیان هێشتا ناتەواوە، لەوانە:

نەخشێ لە بێتواتەی قەزای ڕانیەی پارێزگای سلێمانی کە هەندێکی براوەتە بەغداد و هەندێکی براوەتە ئیسرائیل و، هەندێ بەردی نوسراوی بە "خەتی مێخی" و بە "زمانی ئەکەدی" لە نزیکەوە دۆزراوەتەوە. هەندێ لێکۆڵینەوە لە سەر کراوە.(8)

نەخشێ لە دەربەندی ڕەمکان لە قەزای ڕانیەی پارێزگای سلێمانی کە هێشتا لێکۆڵینەوەی لە سەر نەکراوە.

دو نەخش لە شاخی پیرەمەگرون لە قەزای دوکانی پارێزگای سلێمانی کە هێشتا لێکۆڵینەوەیان لە سەر نەکراوە و، بەردێکی نوسراو بە "خەتی مێخی" و بە "زمانی ئەکەدی" لە نزیکیانەوە دۆزراوەتەوە.(9)

(بڕوانە نیگاری ژمارە 5: نەخشی چیای پیرەمەگرون)

نەخشێ لە چیای هەریری قەزای سۆرانی پارێزگای هەولێر کە هێشتا لێکۆڵینەوەی لە سەر نەکراوە.(10)

(بڕوانە نیگاری ژمارە 6: نەخشی چیای هەریر)

نەخشێ لە دەربەندی باسەرە، کە ئەویش یەکێکە لە دەربەندەکانی زنجیرەی شاخەکانی قەرەداخ، هێشتا لێکۆڵینەوەی لە سەر نەکراوە.(11)

سێیەم، نەخشی نارام سین کە لە دوسە دۆزراوەتەوە شاخدارە، ئەوەش کە بە پێی لێکدانەوەی شوێنەوارناسەکان، نیشانەی "خوایاندن" ی نارام سینە، لە کاتێک دا نەخشەکەی سەرپولی زەهاو و نەخشەکەی دەربەندی بێلولە و نەخشەکەی دەربەندی گاور، کڵاوی ئاسایی‌یان لە سەردایە و شاخدار نین.

چوارەم، بۆ هەڵکۆڵینی مۆنۆمێنتێکی گەورەی لەو ئەندازەیە لە سەر بەردی ڕەق و، لە لاپاڵی شاخێکی ناو قوڵایی ناوچەیەکی سەختی شاخاوی، کە نیشانەی سەرکەوتنی داگیرکەری بێگانە بێ بە سەر دانیشتوانی بومیی ناوچەیەک دا، کە بە شەڕانی و شەڕکەر ناسرابن، کارێکە پێویستی بە ژمارەیەکی زۆر وەستا و کرێکار و پاسەوان و، پێویستی بە کەرەستە و دەسکەلا و ئامراز و کەلوپەلی تایبەتی و، پێویستی بە مانەوەی ماوەیەکی درێژی تەواوکردن هەیە، کە ئەگەر خەڵکی ناوچەکە خۆیان ئەو پێویستییانە ئامادە نەکەن، کارێکی سەختە داگیرکەر بتوانێ بە ئاسانی ئەنجامی بدا و بڕوا و بە جێی بهێڵێ و، هەزاران یا سەدان ساڵ بە بەر چاوی خەڵکی ناوچەکەوە بە ساغی بمێنێتەوە.

## وشەی ناناشنا

بومیی: محلی، له زمانی کوردی دا ئەم وشەیه لەم وشه لێکدراوانەدا به کار ئەهێنرێ: بومەلەرزه، بومەلێل، مەرزوبوم.

پەیکەر: ئەنێ که له بەرد بتاشرێ یا له قور، تەخته، مەعدەن، یا هەر کەرەستەیەکی تر دروست بکرێ بتوانرێ به قنجی دابنرێ و هەر چوار لای بۆش بێ. ئەگەر له بەر رێگریی دینیی نەبێ رەنگە گونجاوترین دەستەواژه بۆ ئەم جۆره هونەره وشەی "بت" بێ.

نیگار: نەخشی مرۆڤ یا هەر شتێکی تر که به دەست، نەک به دەزگای فۆتۆگراف، له سەر بەرد، قور، تەخته، چنراو، یا هەر شتێکی تر کێشرا بێ.

وێنه: بۆ فۆتۆ گراف.

نیگارین: تابلوی نەخشێنراو. نالی ئەڵێ: "دیدەم هەمو شۆراوه به شۆراوی سوروشکم/ لەم لەوحه نیگارینه نه عەین و نه ئەسەر ما"

کێل: بەردێکی ئەستونی بۆ ناسینەوەی جێیەک به قنجی دانرا بێ، وەکو: کێله شین، له نێوان سنوری سیدەکان – شنۆ دا. یا لوتکەی کێوێک که به ئەستونی بەرز بوبێتەوه، وەکو: کێلی بابل له چیای ئاسۆس. کێل کێل له چیای کۆرەک. یا گوندێ بەوەوه ناو نرابێ، وەکو: کێلێ، له قەڵادزێ. کێله سپی، له قەرەداخ. ناو کێلەکان، له چۆمان.

### سەرچاوه


1. ا. م. دیاکونوف، تاریخ ماد، ترجمه کریم کشاورز، شرکت انتشارات علمی و فرهنگی، تهران 1345. ص 104. (به فارسی)

دیاکونوف، ل 108.

طه باقر، مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، دار الوراق، بيروت 2009. ص 401 – 406. (به عەرەبی)

د فوزي رشيد، نرام سين ملك جهات العالم الاربعة، بغداد 1990. (به عەرەبی). پێ ئەچێ د فەوزی ئەم کتێبەی بۆ مەبەستی سیاسی نوسی بێ، چیرۆکی بلیمەتی و قارەمانێتی نارام سین به جۆرێ ئەگێرێتەوه، که وەکو یەکێ بێ له کەسایەتیه هەڵکەوتوەکانی زەمان و زەمینی سەردەمی دەسەڵاتی بەعس.

2. کێلی سەرکەوتنی نارام سین

3. طه باقر، مقدمة في ادب العراق القديم، دار الوراق، بيروت 2010. ص 174 – 175. (به عەرەبی)

4. وەرگێرانەکەی:

(به عەرەبی)، ادموندز، كرد وترك وعرب، ترجمة جرجيس فتح الله، بغداد . ص 321 – 322.

(به فارسی)، ادموندز، کرد وترک و عرب، ترجمه ابراهیم یونسی، تهران، ص 391 – 392.

5. بۆ نیگاری دەربەندی گاور بروانه:

طه باقر و فؤاد سفر، المرشد الى مواطن الاثار والحضارة (الرحلة الرابعة. بغداد – كركوك - السليمانية)، بغداد 1966. الشكل 6. (به عەرەبی)

ايفا شترومنكر، المنحوتة الصخرية (دربندي كاور في قرداغ)، ترجمتها عن الالمانية شاري كاظم السماوي، (گۆڤار) هەزارمێرد، ژماره 15، سلێمانی، ئازاری 2001. بەشی عەرەبی، ل 22.

لەم ساڵانەی دوایی دا هەندێ له شوێنەوارناسەکانی کورد کەوتونەته گومان لەوەی بەردە نیگارینەکەی دەربەندی گاور هی نارام سین بێ. بۆ نمونه بروانه:

کەمال نوری مەعروف، تیشکێک بۆ سەر نەخشه هەڵکەندراوەکەی دەربەندی گاور، (گۆڤاری) هەزارمێرد، ژماره 4، سلێمانی، حوزەیرانی 1998. ل 4 – 14.

6. بۆ نیگاری سەرپولی زەهاو بڕوانە:
دیاکونوف، تاريخ ماد، ترجمة كريم كشاورز، ص 103.
طه باقر و فؤاد سفر. المرشد الى مواطن الاثار والحضارة (الرحلة السادسة. بغداد - حلبجة)، بغداد 1966. الشكل 5. (بە عەرەبی)
7. بۆ نیگاری دەربەندی بێلوله بڕوانە:
دیاکونوف، تاريخ ماد، ترجمه كريم كشاورز، ص 116.
طه باقر و فؤاد سفر، المرشد الى مواطن الاثار والحضارة (الرحلة السادسة. بغداد - حلبجة)، بغداد 1966. الشكل 6.
کەمال نوری مەعروف، تیشکێک بۆ سەر نەخشە هەڵکەندراوەکانی دەربەند بێلوله. (گۆڤاری) هەزارمێرد. ژمارە 9، سلێمانی، ئەیلولی 1999. ل 5 – 17.
8. د عبدالهادي الفؤادي، نەخش و نوسینەکانی بێتواتە، (مجلة) سومر، الجزء الاول والثاني– المجلد الرابع والثلاثون، بغداد 1978. بەشی ئینگلیزی، ل 122.
9. زەردەشت، شاخی پیرەمەگرون: شوێنەوارە دێرینەکانی لە پارێزگای سلێمانی. (گۆڤاری) هەزارمێرد، ژمارە 1، ئابی 1997. ل 32 – 40.
رافدة عبدالله عبدالصمد و كوزاد محمد احمد، صخرة غريب هەڵەدنی.. حقائق ومعلومات وثائقية، (گۆڤاری) هەزارمێرد، ژمارە 1، سلێمانی، بەشی عەرەبی، ئابی 1997، ل 115 – 123.
کوردستان کەمال، دۆزینەوەی نەخشێکی هەڵکۆڵراوی دیکە لە چیای پیرەمەگرون. (گۆڤاری) هەزار مێرد، ژمارە 10. سلێمانی، کانونی یەکەمی 1999. ل 142 – 148.
كمال رشيد رحيم، مشروع استنساخ منحوتتي جبل بيرمكرون المقدس في موقعي (ميرقولي) و (ربنه)، (گۆڤاری) هەزارمێرد، ژمارە 18، کانونی یەکەمی 2001. بەشی عەرەبی، ل 153 – 163.
کۆزاد محەمەد ئەحمەد، کوردستانی ناوەڕاست لە نیوەی یەکەمی هەزارەی دوەمی پ. ز . دا، چاپی دوەم، بنکەی ژین، سلێمانی 2008. ل 141 - 187.
"میرقولی" و "رەبەنە" کە ناوی شوێنی دو بەردی نیگارینن لە چیای پیرەمەگرون و، "تابین" کە ناوی گوند و چەم و یەکێ لە تەنگەکانی پیرەمەگرونە، هەندێ شیکردنەوەیان بۆ کراوە، ئەمێنێ قسەی زیاتریان لە سەر بکرێ. بە چاکم زانی لێرەدا، بە پێی ئاگاداری خۆم، بەشدارییەک لە رونکردنەوەیان دا بکەم:
میرقولی: بەنـدەی مـیر. کۆیلەی مـیر. قول (قل) وشەیەکی تورکیە بە واتای بەندە یا کۆیلە، لە باتی وشەی (عبد) ی عەرەبی بە کار هاتوە، وەکو "محمدقلی: عبدالمحمد – کۆیلەی محەمەد"، "حسینقلی: عبدالحسین – کۆیلەی حسەین"، "رضاقلی: عبدالرضا – کۆیلەی رەزا"... بڕوانە: دهخدا، لغت نامه.
رەبەنە: رهبنة، رهبان، راهب، وشەیەکی عەرەبیە بۆ کەسێ بە کار هێنراوە کە لە ترسی خوا ژنی نەهێنابێ، دەستی لە دنیا هەڵگرتبێ، بە تەنیا لە کونجی پەرستگایەک دا خەریکی خواپەرستی بوبێ. بڕوانە: المنجد، هەروەها دهخدا، لغت نامه.
لە زمانی ئێستای کوردی دا "رەبەن" بە کەسێ دەوترێ کە بەلەنگاز و تەنیا و گۆشەگیر بێ، یا سەڵت بێ.
تابین: سەربازێ کە پلەی نەبێ. بڕوانە: دکتر محمد معین، فرهنگ فارسی.
10. بۆ نیگاری چیای هەریر بڕوانە:
طه باقر و فؤاد سفر، المرشد الى مواطن الاثار والحضارة (الرحلة الخامسة. بغداد - اربيل)، بغداد 1966. الشكل 4. (بە عەرەبی)
11. کەمال نوری مەعروف، نەخشە هەڵکەندراوەکەی دەربەندی باسەرە، (گۆڤاری) هەزارمێرد، ژمارە 8، سلێمانی، حوزەیرانی 1999. ل 61 – 67.
كمال رشيد رحيم، انقاذ منحوتة دربند باسرة، (گۆڤاری) هەزارمێرد، ژمارە 20، حوزەیرانی 2002. بەشی عەرەبی، ل 208 – 213.



نیگاری ژمارە 1: کێلی سەرکەوتنی
نارام سین



نیگاری ژمارە 2: مۆنۆمێنتی دەربەندی گاور



نیگاری ژمارە 3: مۆنۆمێنتی سەرپولی زەهاو



نیگاری ژمارە 4: مۆنۆمێنتی دەربەندی بێلولە



نیگاری ژمارە 5: نەخشی چیای پیرەمەگرون



نیگاری ژمارە 6: نەخشی چیای هەریر

# خوێندنەوەیەکی تری

# ئاناباسیس

شاهانشای ئێران، ئەردەشیر، لە زنجیرەی شاهانی هەخامەنشی، کە چوە سەر تەختی شاهێتی توشی کێشە بو لە گەڵ کورشی برای. کورشی دوەم بۆ ئەوەی شایەتی لە دەس ئەردەشیری برای دەربهێنێ کەوتە کۆکردنەوەی هێز. لە ناو هێزەکەی دا لەشکرێکی یۆنانی بە کرێ گرتوە سیازدەهەزار جەنگاوەر بون. لە شەڕێک دا لە نێوان ئەردەشیر و کورش دا، لە جێگایەک دا بە ناوی "کوناکسا" لە نێوان دیجلە و فورات دا کورش کوژراوە. یۆنانیەکان لە کێشەکەوە گلاون، بۆ ئەوەی خۆیان دەرباز بکەن بڕیار ئەدەن بگەڕێنەوە بۆ یۆنان. جەنەراڵ و ئەفسەرەکانیان، بۆ دیاریکردنی ڕێگەی گەڕانەوەی هێزەکەیان و هەڵبژاردنی سەرکردەکەیان، لە ناو خۆیان دا کەوتونەتە کۆبونەوە و پرسوڕا.

لە ناو خۆیان دا پێک هاتون زەینەفۆن هەڵبژێرن بە ڕێبەری ڕێپێوانەکەیان و بۆ گەڕانەوەیشیان چەند ڕێیەکیان لە بەر ئەبێ، پاش پرسین و کۆکردنەوەی زانیاری بڕیار ئەدەن لە روباری دیجلە بپەڕنەوە و بە ناوچە شاخاویەکانی کەناری رۆژهەڵاتی روباری دیجلەدا بەرەوژور بڕۆن بۆ سەر دەریای رەش، کە بە لای ئەوانەوە کورتترین ڕێ بوە. بەڵام پێش ئەوەی بە ڕێ بکەون شارەزاکان هوشیاریان کردونەتەوە کە ئەو ڕێگەیە پڕ مەترسیە، چونکە: دانیشتوانی ئەو ناوچەیە قەومێکن پێیان ئەڵێن کاردوخی، ئەوانە ژێردەستەی شای ئێران نین، هەروەها ملکەچی شای ئەرمەنستان نین. جارێکیان شای ئێران زیاتر لە سەد هەزار جەنگاوەری ناردۆتە سەریان کەسیان لێ نەگەڕاوەتەوە. گەلێکی شەڕاوی و شەڕکەرن. بەڵام سەرەڕای هەمو ئەو مەترسییانە یۆنانیەکان بڕیار ئەدەن بۆ گەڕانەوەیان ئەو ڕێگایە هەڵبژێرن.

لە تاریکی شەودا بە ڕێ ئەکەون بەرەو ناوچە شاخاویەکان بە روناکی ئەگەن، بەڵام دانیشتوانی دێهاتەکان، لە باتی ئەوەی پێشوازییان لێ بکەن، یان بە لەشکرێکی ڕێکوپێک بەرەنگارییان بکەن، خانوەکانیان بە جێ ئەهێڵن، ژن و منداڵەکانیان هەڵئەگرن و رائەکەن بۆ چیاکان. یۆنانیەکان چەندی هاواریان لێ ئەکەن قسەیان لە گەڵ بکەن وەڵامیان نادەنەوە و، هیچ نیشانەیەکی دۆستایەتییان پیشان نادەن. زەینەفۆن و یۆنانیەکان، وەکو خۆی نوسیویەتی، ناچار ئەبن بە "شەڕ و راکردن" بە ناوچەکەدا تێ بپەڕن. حەوت رۆژیان پێ چوە تا مەڵبەندی

کاردوخیەکانیان بە جێ هێشتوە و، گەیشتونەتە مەڵبەندی ئەرمەن. گەڕانەوەکەیان ساڵی 399 – 401 پێش زاین بوە.
لە گێڕانەوەکەی زەینەفۆن دا، چوار سەدە پێش زاین، ئەشێ چەند ئەنجامگیریەک دەربارەی بەشێ لە کۆمەڵی ئەوسای کوردستان بکرێ:

یەکەم، لە روی شێوەی ژیانەوە، کاردوخیەکان خانوی دروستکراو و ماڵیان هەبوە، ماڵەکانیان ئاسنجاوی برۆنز و کوپەی گەورەی تێدا بوە شەراب و خواردەمەنییان تێدا هەڵگرتوە، واتە کۆچەر نەبون و نیشتەجێ بون.
تەنانەت، کاتێ چەند یۆنانیەک ئەکوژرێن و زەینەفۆن لە ڕێگەی موتەرجیمەوە گفتوگۆ لە گەڵ کاردوخیەکان ئەکا، داوای ڕاگرتنی شەڕ و گێڕانەوەی لاشەی جەنگاوەرە کوژراوەکانیان ئەکا، لە بەرامبەردا کاردوخیەکان داوا ئەکەن خانوەکانیان نەسوتێنن. ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە ئەوانە لە ئاوەدانی دا ژیاون و گوندنشین بون.

دوەم، لە روی پەیکەرەی کۆمەڵایەتیەوە، پەیوەندی خزمایەتی‌یان بە هێز بوە و، نەریت و ڕێسای تایبەتی خۆیان هەبوە بۆ دروستکردنی خێزان. یۆنانیەکان دو کاردوخییان بە دیل گرتوە داوایان لێ کردون ڕێگەیان پیشان بدەن. داوا لە یەکێکیان ئەکەن ڕێگەیان پیشان بدا ئامادە نابێ چاوساغی‌یان بکا. ئەوەیان بە بەرچاوی دوەمەوە ئەکوژن. لەوی تریان ئەپرسن بۆچی ئەم کابرایە ڕێگەکەی پیشان نەدان، ئەویش ئەڵی کچێکی تازە داوە بە شو ماڵی زاواکەی کەوتۆتە سەر ئەو ڕێیەی ئەبێ ئێوە لێی تێ بپەڕن، ترساوە لەوەی ئەگەر ئێوە لەوێوە ڕێنمایی بکا ئەوان شتێکیان لێ بە سەر بێ.

سێیەم، لە روی هونەری جەنگیەوە، کاردوخیەکان لەشکری "نیزامی" یەکگرتو و پیشەییان نەبوە. گروپی پچوک بون. پێڕەوی تاکتیکی "لێدە و هەڵێ" یان کردوە. بۆسەیان داوەتەوە، سودیان لە تۆپۆگرافی ناوچەکە وەرگرتوە. کتوپڕ پەلاماریان داون و خێرا ئاوا بون، لە کشانەوەی یۆنانیەکان دا دوایان کەوتون و دەستیان لێ وەشاندون، لێیان کوشتون و لاشە و کەلوپەلیان پێ بە جێ هێشتون.
چەکی کاردۆخیەکان بریتی بوە لە تیر و کەوان و قۆچەقانی و بەرد، بەم چەکانە شەڕیان کردوە. کەوانەکانیان ئەوەندە گەورە بوە لە کاتی هاویشتنی دا پێی چەپیان لە سەر داناوە و، تیرەکانیان ئەوەندە درێژ و کاریگەر بوە مەتاڵی یۆنانیەکانی سمیوە و لە هەر جەنگاوەرێکی دابێ کوشتویەتی. بە قۆچەقانیەکانیشیان بەردبارانیان کردون و، لە کاتی تێپەڕین و مۆڵخواردنیان دا لە بەرزایی شاخەکانەوە بەردیان بە سەردا خل کردونەتەوە. بەمەش ئازاری دەرونی و گیانی‌یان داون.
هەر بۆ تۆقاندنی ئەوان، شەوانە لە بەرزایی شاخەکان، لە دەوری ئەو شوێنانەی ئەوانی تێدا ماونەتەوە، ئاگریان کردۆتەوە و بە دەنگی بەرز و ترسێنەر گۆرانی شەڕیان وتوە و هاواریان کردوە.
بە پێی قسەی زەینەفۆن، ئەو حەوت ڕۆژەی بە مەڵبەندی ژیانی کاردوخیەکان دا ڕۆیشتون ئەوەندەی هەمو ئەو ماوەیەی لە قەڵەمڕەوی شای ئێران دا بە سەریان بردوە، توشی زەرەر و زیان بون.

چوارەم. لە ڕووی ڕێکخستنی دەوڵەتیەوە، کاردوخیەکان نە لە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆری ئێران دا بوون و نە لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی ئەرمەن دا. خۆیشیان دەوڵەتێکی ناوەندی یا ناوچەییان نەبوە. دەسەڵاتی بە سەر هەمو ناوچەکەیان دا هەبوبێ. لە گەڵ ئەوەش دا پێ ئەچێ دانیشتوانی ناوچەکە بە شێوەیەکی ئاسایی پێکەوە ژیابن. ئەمەش ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ هەبونی جۆرێکی سەرەتایی لە سیستەمی "میرایەتی: ئەمارەت" کە ناوکەکەی خێزان و چوارچێوەکەی بنەماڵەی گەورە بوە و، لە دوای هاتنی ئیسلامیشەوە، لە سەردەمی دەوڵەتی ئەمەوی و دەوڵەتی عەباسیەوە تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم لە کوردستان دا چ لە قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانی و چ لە هی ئێرانی دا بە شێوەی جۆراوجۆر بەردەوام بوە.

## تێوەردان

**یەکەم.**

ئاناباسیس (Anabasis)، کتێبێکە بە زمانی یۆنانی، زەینەفۆن (Xenophon) نوسیوێتی. باسی گەڕانەوەی دەهەزار جەنگاوەری بەکرێگیراوی یۆنانی ئەکا لە ئێرانەوە بۆ یۆنان. لە نزیک بابلەوە کەوتونەتە ڕێ بۆ ناوچە شاخاویەکانی کوردستان، لەوێوە هەڵکشاون بەرەو ئەرمەنستان ئینجا بۆ سەر دەریای ڕەش، لە دەریای ڕەشەوە بە کەشتی گەیشتونەتەوە یۆنان.

ناوی نوسەر کە "ئێکسەنەفۆن: Xenophon" ە حسەین حوزنی بە "کسەنەفۆن" و حەسەن فەهمی بە "گەزەنەفۆن" ناویان بردوە و لە ناو خەڵکی سادەی کورد دا گۆکردنی ناوەکەی بە "زەینەفۆن" ڕۆیشتوە.

"ئاناباسیس"، بە زمانی یۆنانی واتە "گەڕانەوە" یا "لەشکرکێشی".

بۆ خوێندنەوەی دەقی تەواوی کتێبەکە بە ئینگلیزی بڕوانە:

Xenophon, The Persian Expedition, Translated by Rex Warner, Penguin Books, 1972.

بۆ خوێندنەوەی دەقی تەواوی کتێبەکە بە عەرەبی بڕوانە:

حملة العشرة الاف – الحملة على فارس، للمؤرخ الاغريقي زينوفون، ترجمها عن الانكليزية يعقوب افرام منصور، موصل 1985.

وەرگێڕ، وەکو خۆی نوسیوێتی، لە دەقەکەی وارنەرەوە تەرجومەی کردوە.

لە وەرگێڕانەکەدا ناوی "Carduchi: کاردوخی" گۆڕیوە بۆ "کورد" و وڵاتی کاردوخیەکان بۆ "کوردستان".

بۆ خوێندنەوەی دەقی تەواوی کتێبەکە بە کوردی بڕوانە:

حسن فهمی جاف، کوردوستان شوێنی گەڕانەوەی دەهەزار یۆنانی لە 401 ی پێش میلاد دا، بەغداد 1961.

وەرگێڕ، وەکو خۆی نوسیوێتی، لە فارسیەوە تەرجومەی کردوە.

لە وەرگێڕانەکە دا ناوی "کاردوخی" گۆڕاوە بۆ "کورد" و "وڵاتی کاردوخیەکان" کراوە بە "کوردستان". وەرگێڕ ئاماژەی بەوە نەداوە ئەم گۆڕینە خۆی کردویەتی یا لە دەقە فارسیەکەدا بەو جۆرە تەرجومە کراوە.

**دوهەم،**
"ئاناباسیس" پێکهاتوە لە چەند کتێبێ. کتێبی چوارەمی تەرخان کراوە بۆ گێرانەوەی ڕێپێوانی یۆنانیەکان بە ناو مەڵبەندی ژیانی کاردوخیەکان دا، کتێبەکانی تری باسی قۆناغەکانی تری هاتن و مانەوەیان لە ئێران و گەڕانەوەیان بۆ وڵاتەکەی خۆیان ئەکا. پەیوەندییان لە گەڵ کاردوخیەکان نیە.
بۆ خوێندنەوەی دەقی کوردی ئەو بەشەی پەیوەندی بە کوردستانەوە هەیە، بڕوانە:
حوزنیی موکریانی، شکان، وە گەڕانەوەی کسەنەفۆن لە کوردستانا، گۆواری "دەنگی گێتیی تازە"، خولی یەکەم، بەرگی یەکەم، ژمارە 5، بەغداد، شوباتی 1944. ل 18 - 23.
وەرگێڕ، وەکو خۆی نوسیوێتی، لە "جغرافیای نظامی ایران" لە فارسیەوە تەرجومەی کردوە.
لە وەرگێڕانەکەدا لە باتی ناوی "کاردوخ" ناوی "گردوک" ی بە کار هێناوە. وەرگێڕ ئاماژەی بەوە نەداوە ئەم ناوە خۆی دایڕشتوە یا لە دەقە فارسیەکەدا بەو جۆرە تەرجومە کراوە.

**سێیەم،**
یەکێ لە شاخە بەرزەکانی کوردستانی عیراق ناوی "کاروخ" ە. کاروخ کەوتۆتە نێوان رانیە و ڕەواندز و، بەشێکە لە زنجیرەیەکی درێژی چیاکانی کوردستانی عیراق. تا ئێستاش دەیان گوندی ئاوەدان لە دەوری چیای کاروخ دا هەیە. ئەبێ ئەم دو ناوە: "کاردوخ" و "کاروخ" پەیوەندییان لە گەڵ یەک هەبێ. کەچی پێش زەینەفۆن و دوای ئەویش ناوی "کاردوخ" وەکو گەلێکی ناسراو لە بەڵگەکانی ناوچەکەدا نەهاتوە. بەڵام زەینەفۆن لە ئاناباسیس دا کە باسی دانیشتوانی ناوچەکە ئەکا هەمیشە بە کاردوخی ناویان ئەبا. مێژونوسەکان، پێیان وایە، گەلی کاردوخی ئەوسەردەمە باووباپیری بەشێ لە نەتەوەی کوردی ئەم سەردەمەن.

# کورد
# له "معجم البلدان" ی یاقوتی حەمەوی دا

## یاقوت (574 – 626 ک/ 1178 - 1225 ز)
## مطبعة: دار احیاء التراث العربي، بیروت – لبنان، 1997.

یاقوت ساڵی 574 ک له دایک بوه. به رەگەز رۆمی بوه. به منداڵی به دیل گیراوه، له بەغداد فرۆشتویانه. بازرگانێکی حەمایی کڕیوێتی و له بەغداد خستویەتیه بەر خوێندن بۆ ئەوەی فێری ژمێریاری و نوسین بێ تا له کاری بازرگانی دا یارمەتی بدا. که گەوره بوه خاوەنەکەی خستویەتیه کار، ناردویەتی بۆ چەندین ناوەندی بازرگانی لەوانه عومان، کیش، شام.

ساڵی 596 ک خاوەنەکەی ئازادی کردوه و ئیتر کاری بۆ خۆی کردوه. خەریکی بازرگانی بوه، به تایبەتی نوسینەوه و کڕین و فرۆشتنی کتێب.
له دیمەشق له میانەی گفتوگۆدا هێرشی کردۆته سەر عەلی. له سەر ئەوه ترساوه بیکوژن. رایکردوه بۆ حەڵەب، موسڵ، ئەربیل و، لەوێوه بۆ شاری مەرۆ له خوراسان. ماوەیەک نیشتەجێی ئەسا و خوارەزم بوه.

ساڵی 616 ک له ترسی هێرشی تەتەر به فەلاکەت له خوراسان دەرباز بوه. گەڕاوەتەوه موسڵ. چۆته سنجار و رۆیشتۆته حەڵەب.
ساڵی (626 ک/ 1225 ز) له خانێک دا له حەڵەب مردوه.
یاقوت له "معجم" هکەی دا ناوی هەزاران شار و گوند و نەتەوه و تیرەی ناوچەکانی ئاسیا و ئەفەریقا و خوارووی ئەورووپا ئەبا، له ناو ئەوانەدا باسی دەیان شار و گوند و قەڵای کوردنشین و خێڵی رەوەندی کوردی کردوه که له پانتاییەکی فراوانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا بون.

## کورد لە دەڤەری "فارس" دا:

فارس لە سەردەمی نوسینی "معجم" دا بە دەڤەرێکی بەرفراوانی ئێستای ئێران وتراوە. لەو بارەیەوە یاقوت نوسیوێتی:

فارس 408/3:

"... وكورها المشهورة خمس فاوسعها كورة..... وبها خمسة رموم اكبرها رم جيلوية ثم رم احمد بن الليث ثم رم احمد بن الصالح ثم رم شهريار ثم رم احمد بن الحسن فالرم منزل الاكراد ومحلتهم"

پێنج رەم، وەکو یاقوت نوسیوێتی کە هی کورد بون. لە فارس دا هەبوە: رەمی جیلۆیە گەورەترینیان بوە، رەمی ئەحمەدی کوڕی لەیس، رەمی ئەحمەدی ساڵح، رەمی شەهریار، رەمی ئەحمەدی کوڕی حەسەن

............

لە جێیەکی تری هەمان بابەتدا نوسیوێتی:

"وبنواحي فارس من احياء الاكراد مايزيد على خمسمائة الف بيت شعر ينتجعون المراعي في الشتاء والصيف على مناهب العرب.."

فارس ناوەندەکەی شیرازە. پێکهاتوە لە پێنج کورە:

کورەی ئیستەخر، ئەردەشیر، دارابجرد، سابور، قوبادخورە.

هەر یاقوت خۆی وشەی کورە و هەندێ لە وشەکانی تر رون دەکاتەوە:

کورە و نوستان هەردوکیان یەک شت بون.

هەمو دەڤەری فارس یەک نوستان واتە یەک کورە بوە.

هەر کورەیەک پێکهاتوە لە چەند روستاقێ.

هەر روستاقێ پێکهاتوە لە چەند تەسوجێ.

هەر تەسوجێ پێکهاتوە لە چەند گوندێ.

رەم، لە ناو ئەم دابەشکردنەدا هاوتایەکی نیە بەڵام یاقوت لە لێکدانەوەی وشەی رەم دا نوسیوێتی: لە ناحیەکانی فارس دا "من احياء الاكراد" زیاتر لە پێنجسەد هەزار رەشماڵ، وەکو عەرەب، بە زستان و هاوین گەرمیان و کوێستان دەکەن.

هەروەها نوسیوێتی:

رم 423/2:

"رم بفتح اوله وتشديد ثانيه وجمعه رموم وتفسير الرموم محال الاكراد ومنازلهم بلغة فارس" واتە مەحاڵی کوردان و ماڵەکانیانە بە زمانی فارسی، ئەویش شوێنە لە فارس، لەوانە:

رەمی حەسەنی کوڕی جیلۆیە پێی ئەوترێ رەمی بازنجان لە شیرازەوە چواردە فرسەخە.

رەمی ئەردام کوڕی جوانا لە شیرازەوە بیستوشەش فرسەخە.

رەمی قاسمی کوڕی شەهریار پێی ئەوترێ کوریان لە شیرازەوە پەنجا فرسەخە.

رەمی حەسەنی کوڕی ساڵح پێی ئەوترێ رەمی سوران لە شیرازەوە حەوت فرسەخە.

یاقوت ئەمانەی لە زمانی "ابن الفقيه" وە گێڕاوەتەوە.

لە زمانی "بشاری" ەوە ئەڵێ:

لە فارس رەمی کوردەکانی لێیە، گوند و روباری هەیە، کەوتۆتە ناوەڕاستی چیاکانەوە، رەز و باخ و خورما و میوە و خێراتی هەیە، وتویەتی:

رەمی ئەحمەدی کوڕی ساڵح کە پێی ئەوترێ زیزان.

ئەستەخری وتویەتی:
ڕەمەکانی فارس پێنجە، هەر یەکەیان شار و گوندی هەیە پێکەوە خەراجی هەمو ناحیەکە دابین ئەکرێ لە لایەن سەرۆکێ لە کوردەکان و ئامادەکردنی پیاو بۆ نێشککگرتن لە گەڵ کاروانچیەکان دا و پاراستنی ڕێگا و ڕوبەڕوبونەوەی کارەسات ئەگەر روی دا (رەمەکان) وەکو شانشین وان: "لنوائب السلطان انا عرضت وهي کالممالک".

یەکەم. ڕەمی جیلۆیە بە ڕەمی زینجان ناسراوە. ناوی قەبیلەیەکی کوردە. شوێنەکەی لە ناوچەیەکدایە لە دوای ئەسبەهان. لایەکی لە کورەی ئیستەخر ئەگەڕێتەوە و لایەکی لە کورەی ئەرەجان. سنورێکی لە بەیزا کۆتایی دێ و سنورێکی لە سنوری ئەسبەهان تەواو ئەبێ و سنورێکی لە خوزستان و سنورێکی لە ناوچەی سابور کۆتایی دێ.
هەرچی شار و دێ بکەوێتە ئەم ناوچەیەوە، سەر بەم ڕەمەیە. هاوسێیە لە گەڵ "عمل" ی ئەسبەهان.

دوەم. ڕەمی شەهریار ئەویش ڕەمی بازنجانە ئەویش ڕەمی کۆمەڵێ لە کوردەکانە "جیل من الاکراد" کە لە بازنجانن گروهی شەهریار "رهط شهريار" لەوانەی بازنجان کەسیان لە ژێر حوکمی "عمل" ی فارس نیە بەڵام لەوێ شوێن و گوندی زۆریان هەیە.

سێیەم. ڕەمی زیزانی حەسەنی کوڕی ساڵح ئەویش لە کورەی سابوردایە. سنورێکی لە ئەردەشیرخورە ئەبڕێتەوە. بە دوای ئەودا سنورێ دێ کورە سابور بە دەورایە. هەرچی شار و گوند "فی اضعافها" هی ئەوە.

چوارەم. ڕەمی ڕەیحان هی ئەحمەد کوڕی لەیس، لە کورەی ئەردەشیر خورەدایە، سنورێکی دەریایی بە دوادا دێ و دەوری سێ سنورەکەی تری کورەی ئەردەشیر خورە و هەرچی شارو دێیەکی ئەکەوێتە ناوی.

پێنجەم. ڕەمی کاریان سنورێکی لە سەیفی بەنی سەفار تەواو ئەبێ و سنورێکی لە ڕەمی ڕەیحان و سنورێکی ئەبەسترێ بە سنوری کرمانەوە و لەوێشەوە بۆ ئەردەشیر خورە. هەموی لە ئەردەشیر خورەدایە.

یاقوت لە لێکدانەوەی وشەی "رم" دا ئەڵێ:
"وتفسير الرموم محال الاكراد ومنازلهم بلغة فارس"
"فالرم منزل الاكراد ومحلتهم"
بە قسەی یاقوت ڕەم وشەیەکی فارسیە بە "منزل و محل" ی کوردەکان ئەوترێ. ئەشێ ئەو وشەیە لەو سەردەمەدا بۆ ئەو مەبەستە بەکار هاتبێ بەڵام ئەشێ وا لێک بدرێتەوە:

یەکەم. لە باتی وشەی عەشیرەت بۆ سەرجەم هۆز و تیرە کۆچەرەکانی کورد بە کار هێنرابێ.
دوەم. بۆ خەڵکی ناوچەیەکی دیاریکراو، بە کۆچەر و نیشتەنیەوە، کە یەکێ لە دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمە حوکمی کردبێ.

ئەم وشەیە، ئەگەرچی بۆ مەبەستی تر بە کار ئەهێنرێ، بەڵام تا ئێستا لە زمانی کوردیی دا ماوە.
رەم - رەمە: گەل، رەو. رەوە. رەوگ.
رەم رەم: گەل گەل
رەمین: رەوین. رەوینەوە. رەویان.
رەوەند - رەوەندایەتی: کۆچەر - کۆچەرایەتی.

## کورد لە دەڤەری "زۆزان" دا

زۆزان کورەیەکی "حسنە" یە لە نێوان چیاکانی ئەرمینیا و ئەخلات و ئازەربیجان و دیاربەکر و موسڵ دا، خەڵکەکەی ئەرمەنن "وفیها طوائف من الاکراد". (635/1) و (157/2) قەڵای زۆری تێدایە.

یاقوت ناوی هەندێ لەو قەڵایانە ئەهێنێ، لەوانە:
ئاتیل 52/1: قەڵایەکە لە ناوچەی زۆزان لە قەڵاکانی کوردانی بوختی. لە ژێر دەستی عیزەدین دایە کە لە جزیرەیە.
باخوخە 253/1: قەڵایەکە لە قەڵەمڕەوی "ئەعمال" ی زۆزان هی فەرمانڕەوا "صاحب" ی موسڵە.
بەرخۆ 297/1: قەڵایەکە لە قەڵاکانی زۆزان هی "صاحب" ی موسڵە.
بەشیر 339/1: قەڵایەکە لە ناوچەی زۆزان لە قەڵاکانی کوردانی بشنۆیە.
جرنقیل 46/2: قەڵایەکە لە ناوچەی زۆزان، کورسی مەملەکەتی بوختیە.
خوشب 261/2: لە قەڵاکانی ناوچەی زۆزانە.
کنکەوەر 155/4: لە قەڵاکانی ناوچەی زۆزانە هی فەرمانڕەوای موسڵە.
نیروە 422/4: لە قەڵاکانی ناوچەی زۆزانە هی فەرمانڕەوای موسڵە.
کەواشی 157/4: قەڵایەکە لە چیاکانی رۆژهەڵاتی موسڵ، تەنیا یەک پیادەڕێی بۆ ئەچێ. کۆن پێی وتراوە "ئەردمشت".
فەنەک 447/3: قەڵایەکی سەخت و عاسیی کوردانی بشنۆیە نزیک جزیرە، دو فرسەخی لێ دورە نە خەڵکی جزیرە و نە خەڵکی تر دەرەقەتیان نایەن. نزیکەی 300 ماڵە بە دەس ئەو کوردانەوەیە.
جوامێری و دەمارگیری "عصبیت" یان تێدایە، دالّدەی ئەوانە ئەدەن پەنایان بۆ ئەبەن و رەفتاری باشیان لە گەڵ ئەکەن.
عەقر 338/3: قەڵایەکی سەختە لە چیاکانی موسڵ دا، خەڵکەکەی کوردن و کەوتۆتە رۆژهەڵاتی موسڵەوە، بە عەقری حومەیدیە ئەناسرێ، کۆمەڵێ زانای "نحوي و لغوي و فقيه"....ی لێ هەڵکەوتوە.
یەکێ لەو زانایانە دۆستی یاقوت بوە شیعری بۆ خوێندۆتەوە.
شوش 162/3: قەڵایەکی زۆر گەورەیە لە نزیک عەقری حومەیدیە سەر بە موسڵە.
لە عەقر بەرزتر و گەورەترە، بەڵام ئەوەندەی ئەو گرنگ نیە.
هەناری شوش هی ئەوێیە.
شرملة 137/3: دێیەکە لە رۆژهەڵاتی موسڵ لە ناحیەی قەڵای شوش هەناری شوش لێرەوە دێ.
الغيضة 403/3: شوێنێکە لە رۆژهەڵاتی موسڵ سەر بە عەقرەی حومەیدیە چەند گونێکی هەیە درندە و باڵندە تێ ئەچن. لە دار و قامیش پێنج هەزار دینار زیاتر داهاتی هەیە.
عیمادیە 348/3: قەڵایەکی سەختە، دژوارە، گەورەیە. لە سەرووی موسڵ و لە "ئەعمال" هکانی ئەوە.

عیمادەدینی زەنگی کوڕی ئاق سنقور لە 537 ک دا داوەدانی کردۆتەوە. پێش ئەوە قەڵایەکی کورد بوە لە بەر گەورەیی روخاندیان. زەنگی گێڕایەوە بە ناوی خۆیەوە. ناوی پێشوی قەڵاکە "ئاشیب" بو.
هكارية 480/4: شارێک و ناوچەیەک و چەند گوندە لە سەروی موسڵ لە وڵاتی جزیرە ئیبن عومەر. کوردیان تیا نیشتەجێن. پێیان ئەوترێ هەکاریە.
هرور 476/4:
قەڵایەکی سەختە لە سەروی موسڵە و لە قەڵەمرەو "ئەعمال" ی موسڵە و سەر بە هەکاریە.
جوزة 92/2:
گوندێکە لە چیاکانی هەکاری کوردەکان لە ناوچەکانی موسڵ.
زۆزان 488/2:
زوم 489/2:
زومی، ئەگەڕێتەوە بۆ زومان "وهي طائفة من الاكراد لهم ولاية".
جزيرة ابن عمر 57/2:
شارێکە لە سەروی موسڵ، سێ رۆژە رێیان بەینە. گەلێ گوندی بە پیت و پڕ خێری هەیە.
لە سێ لاوە ئاوی دیجلە دەوری داوە وەکو نیمچە هیلال. لە لایەکەی تری خەندەکیان لێ داوە، ئاشیان لە سەر هەڵبەستوە.
یاقوت باسی زاناکانیان ئەکا بەڵام باسی رەگەزی دانیشتوانی ناکا. باسی داگیرکردنی ئەکا لە لایەن عەرەبەوە.
سنجار 78/3:
شارێکە لە جزیرە، سێ رۆژە رێ لە موسل دورە.
باسی رەگەزی دانیشتوانی ناکا.
صبحة 177/3:
قەڵایەکی دیاربەکرە لە بەینی ئامەد و میافارقین دا.
وشەکانی زوم و زۆزان لە چەند جێیەک دا باس ئەکا. ئەم دو وشەیە تا ئێستاش لە زمانی کوردیدا ماون. ئەوساش وەکو ئێستا پەیوەندییان بە رەوەندایەتیەوە هەبوە. ئەشێ وەکو یەکەیەکی کارگێڕی بۆ رێکخراوەی خێڵەکی سەیری بکرێ، کە ئێستاش لە ناو هەندێ لە خێڵە رەوەندەکان دا ماوە، بەمجۆرە:
کۆن: بریتیە لە یەک رەشماڵ کە بە جۆرێکی ئاسایی یەک خێزانی تێدایە.
هۆبە: چەند رەشماڵێکە پێکەوە بە جۆرێکی ئاسایی هەمویان خزمی یەکن و بە زۆری لە یەک بنەماڵەن. لە کاتی جولان دا بەرەو کوێستان پێکەوە ئەجولێن و پێکەوە لە هەوارێک دا هەڵ ئەدەن.
زۆم: چەند هۆبەیەک هەمویان سەر بە یەک بەرەباب یان تیرەن پێکەوە بەرەو کوێستان ئەجولێن و لە هەوارێکی فراوانتردا بە پێی لەوەڕگاکان دائەبەزن و دابەش ئەبن و بار ئەخەن.
بەڵام "زۆزان" لە باتی وشەی "کوێستان" کە هەوارگەی هاوینەی رەوەندەکانە بە کار ئەهێنرێ. یاقوت ئەم وشەیەی وەکو ناوی شوێن بۆ هەندێ لە ناوچەکانی نزیکی موسڵ و جەزیرەی بۆتان بە کار هێناوە. کە ئەبێ ئەوسا بەو ناوە ناسرابێ.

## کورد لە دەڤەری "ئەربیل"

ئەربیل: 116/1:
یاقوت ئەڵێ ئەگەر وشەکە عەرەبی بێ لە ربل هاتوە کە جۆرێکە لە درەخت...

ئەربیل قەڵایەکی سەخت و شارێکی گەورەیە لە دەشتاییەکی فراوان و سادەدایە. خەندەکێکی قوڵ لایەکی قەڵاکەی لە شارەکە دابڕیوە و شورەی شارەکەش نیوەی دابڕیوە، لە سەرگردێکی بەرزی خاکیە و سەرەکەی فراوانە بازاڕ وماڵی رەعیەت و مزگەوتێکی تێدایە، لـە قـەڵای حەڵەب ئەچێ، بەڵام فراوانتر و بەرزترە. کەوتۆتە نێوان هەردو زابەوە. لە "ئەعمال" ی موسڵە و دو رۆژە رێیان لە بەینایە.

لە بەرەدەمی ئەم قەڵایەدا، لە سەردەمی ئێمەدا، شارێکی گەورەی پان و درێژە موزەفەرەدینی کوکەبری بیناکانی و شورەکەی و بازاڕ و قەیسەریەکانی ئاوا کردۆتەوە، کردویەتیە نشینگەی خۆی، هەیبەتی پێداوە، بەرگری مەلیکەکانی کردوە و بە ئازایەتی و پرئەزمونی بەرەو رویان بۆتەوە، بەوەش دەورەکەی پاراستوە. بێگانە رویان تێکردوە و زۆریان تیا نیشتەجێ بون، تادو بە شارێکی گەورەی ناو شاران.

تەبیعەتی ئەم ئەمیرە جیاواز و ناکۆکە. زوڵم و زۆر و ستەم لە رەعیەت ئەکا، بە زۆر پارەیان لێ ئەسێنێ، کەچی لە گەڵ ئەوەش دا چاکە لە گەڵ هەژاران ئەکا، خێر بە بێگانە ئەکا، پارە ئەنێرێ دیلی دەستی کافرانی پێ ئەکڕێتەوە. شاعیر ئەڵێ: ...

لە گەڵ فراوانی ئەم شارەدا بیناکانی و سروشتەکەی زۆرتر لە گوند ئەچێ تا بە شار.

زۆری خەڵکەکەی کوردن و عەرەباوی بون. هەمو روستاقەکانی و جوتیارەکانی و ئەو شوێنانەی خراوەتە سەری کوردن. هەندێ قەڵای لە ژێر دەستایە، لە نێوان ئەو و بەغدادا بۆ کاروان حەوت رۆژە رێگایە.

باخی لە دەور نیە و روباری پێدا ناڕوا. زۆری کشتوکاڵەکەی بە ئاوی لە ژێر ئەرز دەرهێنراو ئەدێرێن و خواردنەوەشیان لە بیرە سازگار و شیرینەکانیانە، کە لە شیرینی و سوکی دا فەرقی ئاوی ئەم و دیجلە نیە. لە شاخەکانی نزیکیەوە میوەی بۆ دێنن.

من کە چوم کەسی دانیشمەندم نەدی جگە لە ئیبن ئەل مستەوفی... پەیوەندی لە گەڵ سوڵتان هەیە. وەکو وەزیر ئەژی... چەندین کتێبی نوسیوە هەندێ لە شیعرەکانی خۆی بۆ خوێندمەوە و بە خەتی خۆی چەند پارچەیەکی بۆ نوسیمەوە.

شیعرەکانی ئەنەوشیروانی بەغدادی ناسراو بە شەیتانە کوێری بەغدادی ناوبانگی دەرکردوە. لە هەندێکی دا ستایشی ئەربیل و لە هەندێکی دا سوکایەتییان پێ ئەکا. وشەگەلی بەغدادی و ئەربیلی تێهەڵکێشی هەندێ لە شیعرەکانی کردوە... لە شیعرێکی دا کە بۆ وەرگێڕان ناشێ دژون بە دایک و خوشک و پوری ... خۆی ئەدا.

شەقڵاوە 150/3:

گوندێکی گەورەی جوانە لە بناری چیایەک دایە کە ئەڕوانێ بە سەر ئەربیل دا. رەز و باخی زۆرە. ترێکەی ئەبرێ بۆ ئەربیل بە درێژایی ساڵ بەشیان ئەکا. لە نێوان ئەربیل و شەقڵاوە دا 8 فرسەخە.

بەست 328/1:

دۆڵێکە لە ئەربیل.

خوفتیان 140/2:

دو قەڵای گەورەن لە "ئەعمال" ی ئەربیل.

یەکێکیان لە سەر رێی مەراغادایە پێی ئەوترێ خوفتیانی زرزاری، بە سەر شاخێکەوە روبارێکی گەورەی لە بەردەمدایە، هەروەها بازاڕ و دۆڵێکی گەورە.

ئەوی تریان خوفتیانی سورخابی کوڕی بەدرە لە سەر رێی شارەزورە لەوی تر گەورەتر و شکۆمەندترە. لە کتێبەکان دا بە خفتیدکان ئەنوسرێ.

شاقرد 115/3:

گوندێکە لە بەینی داقوق و ئەربیل دا قەڵایەکی پچوک "قلیعە" یەکی تێدایە. هەنجیرێکی هەیە لە شوێنی تر نیە.

## کورد لە دەڤەری "ئازەربایجان"

ئازەربایجان 109/1:
پێکهاتوە لە تەوریز، خوی، سەلماس، ورمێ، ئەردەبیل و مەرەند. پێشتر مەراغە ناوەندی بوە بەلام ئێستا تەوریز بۆتە ناوەندی.
لە سەردەمی عومەردا فەتح کراوە.
لە دوای شەڕ لە نێوان مرزبان و حوزەیفەی کوڕی یەمان دا سوڵح کراوە بەرامبەر هەشتسەد هەزار درهەم، بەو مەرجەی کەسیان لێ نەکوژرێ، کەسیان لێ بە دیل نەگیرێ، هیچ ئاتەشگایەکیان نەروخێنرێ، توخنی کوردانی بلاشجان و سەبەلان و ئاوی رودان نەکەون.
شنۆ (اشنه) 164/1:
شارێکە سەر بە ئازەربایجانە.
بەینی شنۆ و ورمێ دو رۆژە رێگایە و بەینی شنۆ و ئەربیل پێنج رۆژە رێگایە.
باخی زۆری هەیە، هەرمێکەی لە هی شوێنەکانی تر باشترە، ئەبرێ بۆ ناوچەکانی دەوروبەری.
چەندین زانای "موحەدیس" لەم شارەدا هەڵکەوتون.
....
یاقوت خۆی لەساڵی 617 ک لە رێگای گەڕانەوەی دا لە تەورێزەوە بە شنۆدا چۆتە ئەربیل.

## کورد لە دەڤەری شارەزور

شهرزور 165/3:
شارەزور کەوتۆتە ئیقلیمی چوارەمەوە.
کورەیەکی فراوانە لە "جبال" لە نێوان هەولێر و هەمەدان دا. زوری کوڕی زوحاک دروستی کردوە. خەڵکی ئەم ناوچانە هەمو کوردن.
مسعر کوڕی موهەلهەل ئەڵێ:
شارەزور چەندین شار و گوندە. شارێکی گەورەی تێدایە ناوەندێتی. لە سەردەمی ئێمەدا پێی ئەڵێن نیم ئەز رای (نیوەی رێ). خەڵکەکەی یاخین لە سوڵتان. ناکۆکی و یاخێتیان کردۆتە پیشە.
شارەکە لە دەشت دایە و، خەڵکەکەی توندوتیژن و خاوەن زەبروزەنگن. شوێنەکەیان ئەپارێزن. ئەستوری شورەی شارەکەیان هەشت باڵە. زۆری ئەمیرەکانیان لە خۆیانن. دوپشکی کوشندەی لێیە لە هی نسیبین زیاندارترن.
"مەوالی" عومەری کوڕی عەبدولعەزیزن. کوردەکان هانیان داون بە سەر ئەمیرەکانیان دا زاڵ بن و لە خەلیفەکان هەڵبگەڕێنەوە.
ولاتەکەیان زستانەهەواری شەست هەزار ماڵە، لە کوردانی جەلالی و باسیان و حەکەمی و سولی و لەوێدا باخی زۆریان هەیە. زۆری خۆراکیان لە دەشتەکەی خۆیان دێ.
چیایەک لەم شارەوە نزیکە بە شەعران ناسراوە و، یەکێکی تر بە زەڵم ناسراوە. گیایەکی لێیە بە کەڵکی دەرمانی جوتبون دێ نازانم لە شوێنی تر هەبێ.
لەوێوە بۆ دەیلەمستان حەوت فرسەخە.

لە شارەزور شارێکی تری لێیە کەمترە یاخیە بە شیز ناسراوە خەڵکەکەی شیعەی "صالحی زەیدی" ین لە سەر دەستی زەیدی کوڕی عەلی موسوڵمان بون. ئەم شارە پەناگای هەمو ترسێنەر و نشینگەی هەمو جەردەیەکە. ساڵی 341 خەڵکی "نیم از رای" چونە سەریان. لە سۆنگەی دەمارگیری دینیەوە بە رواڵەت شەریعەت، کوشتیانن و تاڵانیان کردن و ئاگریان تێ بەردان.

لە نێوان هەردو شارەکەدا شارێکی بچوک هەیە پێی ئەڵێن دوزران لە سەر شیز دروست کراوەتەوە. گۆماوێک لەوێوە ئەڕژێتە دەرەوەی.

بە هۆی پانی و فراوانیەوە ئەسپ بە سەر بەرزایی شورەکەیدا غار ئەدا.

عاسیە بۆ کورد و حاکم و رەعیەت "وهي ممتنعة علی الاكراد والولاة والرعية".

زۆر جار سەیری سەرۆکەکەیانم ئەکرد کە پێی ئەڵێن ئەمیر. لە سەر بورجێ دائەنیشت کە لە سەر دەرگایەکی بەرز دروست کرا بو. دانیشتوی سەری ئەیڕوانی بۆ دوری چەند فرسەخ و شیرێکی روتی بە دەستەوە بو هەر کاتێ سەرنجی لە ئەسپێ بدایە لە هەندێ لاوە شیرەکەی رانەوەشان هەڵئەهاتن ولاخەکانی خەڵکەکە و عامیلەکانی.

مزگەوتێکی تێدایە و شارێکی مەنصورە. ئەڵێن: داود و سلێمان دوعای سەرکەوتنیان بۆ شارەکە و خەڵکەکەی کردوە و هەمیشە پارێزراوە لە وانەی چاویان تێ بڕیوە.

ئەوترێ تالوت لەوانە و بەوان بەنی ئیسرائیلی سەر خستوە. جالوت لە رۆژهەڵاتەوە دەرهات و داود لە رۆژئاواوە خوا پشتی گرت دژی ئەو.

ئەم شارە دارای کوڕی دارا بینای کردوە، ئەسکەندەریش بۆی ئەگیراوە. خەڵکەکەی ئەبون بە موسوڵمان تا لێیان نائومێد بون. ژێرکەوتوەکان تا ئێستاش خۆیان بە تالوت ئەزانن و "اعمال" هکەی بەستراوە بە "خانەقین" و "کرخ جدان" هوە تایبەتە بە رێی سەودنایا. لەوێوە بۆ خانەقین روباری تامەرا لە رێگەدایە. تەراخومە و ئاوڵەی کەمە.

قسەکانی مسعر لێرەدا تەواو ئەبێ.

ئێستا وەکو باس کرا وا ئەماوە. ئەمە ئەگێڕنەوە بۆ ئەوەی گۆڕانی زەمان چی بە خەڵک ئەکا و روداوەکان بەرێوەبردنی روداوەکان ئەگۆڕێ. ئەمڕۆ ئەم وڵاتە بە چاکترین شێوە گوێڕایەڵی موزەفەرەدینی کوکبەری کوڕی عەلی کوچک ساحێبی هەولێرن. بەڵام کوردەکان لە چیاکانی ئەو ناوچانەدا وەکو عادەتی خۆیان، لە ترساندنی رێبوار و سەندنی دارایی و دزی هیچ شتێ لەوەیان ناگێڕێتەوە. سەرزەنشت و کوشتن و بەدیلگرتن، سروشتی کوردن، زانراوە و لە ناوچەوانیان دا دیارە.

لێرەدا لە زمانی قۆشمەیەکەوە ئەگێڕێتەوە قسەکەی خوای بەو جۆرە خوێندەوە: "الأكراد أشد كفرا و نفاقا" پێیان وت ئایەتەکە ئەڵێ: "الأعراب" (توبە:98) کابرا وتی: خوای عەزە وە جەل سەفەری شارەزوری ئەکردوە تا سەیری ئەوێ بکا چەند بەڵا لە کون و کەلەبەرەکانی دا شاردراونەوە.

لەم ناوچانە پیاوی گەورە، ئیمام، عالم، ئەعیانی قازی، فوقەها لە ژمارە نایەن.

دیلمستان 369/2:

گوندێکە نزیک شارەزور نۆ فرسەخیان بەینە. لە زەمانی کیسراکان دا ئەگەر بۆ هێرش دەرچون، بنکەیان تێدا داناوە. شتەکانیان لا داناون، بە ناوچەکەدا بە ونی بڵاو بونەتەوە، کە لە هێرشەکایان بونەتەوە چونەتەوە بۆ ئەوێ و، لەوێوە گەڕاونەتەوە نشینگەکەی خۆیان.

شعران 145/3:

... لە "شعر: قژ" ناو نراوە بە هۆی زۆری گژوگیاکانی بە قژی سەر شوبهێنراوە. ئەویش چیایەکە لە موسل، هەروەها وتویانە لە ناوچەکانی "نەواحی" شارەزوردایە. نیین ئەل سکیت وتویەتی: لە ناوچەی باجەرمەق ناونراوە چیای قەندیل و بە فارسی چیای شیروەیە، لە ئاوەدانترین چیاکانە، هەمو جۆرە میوەیەکی لێیە، چەند جۆرە مەلی لێیە، بە زستان و بە هاوین بەفرێکی زۆری لێیە. کە لە دەقەوقا دەرئەچی رویەکی دەرئەکەوێ، دوای زابی بچوک دێ، نزیکە لە روستاقی زاب لە شارەزور.

زەڵم 479/2:

.... چیایەکە لە نزیک شارەزور، دانەی زەڵمی لێ ئەڕوێ کە بۆ جوتبون باشە، لە شوێنی تر نیە...

## کورد لە دەڤەری "قرمیسین"

قرمیسین 36/4:

قرمیسین تەعریبی کرمان شاهانە.

ولاتێکی ناسراوە لە بەینی ئەو و هەمەدان دا سی فرسەخە، نزیکی دینەوەرە. لە بەینی هەمەدان و حەلەوان دایە لە سەر جادەی حاجییانە.

"ابن الفقیە" وتویەتی قوبادی کوڕی فەیروز سەیری ولاتەکەی کرد لە نێوان مەدائین و بەلْخ دا تا پاژنەی هەمەدان شوێنێکی نەدۆزیەوە پاکتر بێ، ئاوەکەی شیرینتر بێ و هەواکەی خۆشتر بێ، لە قرمیسین. قرمیسینی دروستکرد بینایەکیشی بۆ خۆی دروست کرد بە پشتبەستن بە هەزار مێو. قەسری شیرین و ئەو تاقەی لێیە کە نیگاری شەبدێز ئەسپی پەروێز و شیرینی کەنیزەکی لە سەرە...

لە قرمیسین ئەو دوکانەی لێیە کە شاکانی زەوی لە سەری کۆبونەتەوە لەوانە فەغفور شای چین و، خاقانی شای تورک و، داهیری شای هیند و، قەیسەری شای رۆم لە لای کیسرا پەروێز. دوکانێکە چوارگۆشەی سەد گەزە وەکو ئەو بەردی نەقاریکراو بە ئاسن بزمارکوت کراوە لە نێوان بەردەکان دا دەر ناکەوێ ئەوەی ببینێ گومان ناکا یەکپارچە نەبێ.

لە زەمانی شێرەوەیەوە باسی دینەوەرییەک ئەکا نازناوی کەدو بوە، باشترین حافز بوە.

شبداز 122/3:

مەنزڵێ بوە لە نێوان حەلەوان و قرمیسین دا لە بناری شاخی بێستون دا بە ناوی ئەسپەکەی کیسراوە ناو نراوە.

مسعر بن المهلهل وتویەتی نیگاری شەبدێز لە دوری فرسەخێکی شاری قرمیسین دایە. پیاوێک بە سەر ئەسپێکەوەیە لە بەرد، مەتاڵێکی پێیە کون ناکرێ وەکو لە ئاسن بێ، زەردەکەی و بزمارە پیا داکوتراوەکانی کە سەیری ئەکەی وائەزانی ئەجوڵێ.

ئەم نیگارە هی پەروێزە بە سواری ئەسپەکەیەوە، نیگارێکی تر لە سەر ئەرز نیە لە شەبدێز بچێ.

لەو تاقەدا کە ئەم نیگارەی تێدایە چەند نیگارێکی تری پیاو و ژن و پیادە و سوارە هەن، لە بەر دەستی دا پیاوێکی لێیە کڵاوێکی لە سەردایە، پشتێنی لە پشت دایە، بێڵێکی بە دەستەوەیە وەکو ئەرز هەڵبکەنێ ئاو لە ژێر هەردو پێیەوە دەرئەچێ.

ئەحمەد بن محەمەد هەمەدانی وتویەتی لە سەیرەکانی قرمیسین کە یەکێکە لە سەیرەکانی دنیا نیگاری شەبدێزە، لە گوندێک دایە پێی ئەڵێن خاتان، نیگارکێشەکەشی قەنتوسی کوڕی سینیمارە و، سینیمار ئەو کەسەیە لە کوفە خەوەرنەقی دروستکردوە. هۆی نیگارەکەی لەم دنیەدا ئەوە بو زیرەکترین چوارپێ و، گەورەترین دافەرێنراو و،

و ئەرکەوتوترین رەوشت و، بەرگەگرترین راکرننی نرێژ، کە شای هیند بە دیاری ناردی بە شا پەروێز، تا زین و جڵەوی پێوەبوایە، نەی ئەپرمان و نەی ئەگرمان و میز و تەرسی نەئەکرد. خری سمەکەی شەش بست بو. وا رێکەوت شەبدێز کەوتە نکاندن و نکانەکەی زیادی کرد. پەروێز بەمەی زانی وتی هەر کەس هەواڵی تۆپینیم بۆ بێنێ ئەیکوژم. کە شەبدێز مرد، مەیتەرەکەی ترسا خاوەنەکەی پرسیاری لێ بکا ناچار بێ پێی بڵێ تۆپیوە، ئەویش بیکوژێ. پەنای برد بۆ بهلبند (مەبەستی باربودە) گۆرانیبێژەکەی پەروێز، کە لە سەردەمی پێش خۆی و دوای ئەویش، کەس لەو لە ژەنینی عود و گۆرانی دا لەو وریاتر نەبوە. ئەیان وت پەروێز سێ تایبەتمەندی هەیە پێش ئەو کەسی کە نەیبوە: ئەسپەکەی شەبدێز، دۆستەکەی شیرین، گۆرانیبێژەکەی بهلبند وتی بزانە شەبدێز تۆپیوە و زانیومە شا چ گەفێکی کردوە لەو کەسەی هەواڵی تۆپینی بداتێ. فێڵێکم بۆ بدۆزەرەوە، ئەوە و ئەوەت ئەدەمێ. بەڵێنی دایە فێڵێکی بۆ بدۆزێتەوە. کە هاتە لای شا گۆرانیەکی بۆ وت، چیرۆکەکەی تێدا گێرایەوە، تا شا پێی زانی، وتی ها شەبدێز مردوە؟ وتی شا وا ئەفەرموێ، وتی باشت کرد خۆت و ئەوانی ترت رزگار کرد. باخێکی زۆری بۆ خوارد. فەرمانی دا بە قەنتوسی کوڕی سینیمار نیگارەکەی بکێشێ ئەویش بە جوانترین شێوە نیگاری کرد پەیکەرێکی کرد جیاوازی ناکەی ئەڵێی گیان کراوە بە بەر لەشی دا.

شا هات و دی، کە سەیری کرد دەستی کردە گریان، وتی لە کاریگەری ئەم پەیکەرە لە سەر نێمە و باسی فەسادی حاڵمان و ئەگەر بە رواڵەت شتێ لە کاروباری دنیا نیشانە بێ بۆ کاروباری ئاخیرەت بەڵگەیەکە بۆ سەلماندنی مردنی لەشمان و داوەشینی جەستەمان و سڕینەوەی روخسارمان و ونبونی شوێنەوارمان......

قصر شیرین 58/4:

... شیرین ناوی دۆستەکەی کیسرا پەروێز بوە. جوانترین خەڵقی خوا بوە. فارس ئەڵێن: کیسرا پەروێز سێ شتی هەبوە هیچ شایەک نە پێش ئەو و نە پاش ئەو نەیان بوە: ئەسپەکەی شەبدێز، کەنیزەکەی شیرین، گۆرانبێژ و عودژەنەکەی بلبهند.

قەسری شیرین، شوێنێکە نزیکە لە قرمیسین لە نێوان هەمەدان و حەلەوان دا، لە سەر رێی بەغداد بۆ هەمەدان، بینای بڵندی گەورەی تێدایە، چاو ماندو ئەبێ لە تەماشای و بیر تەنگ ئەبێ لە روانینی. هەیوانێکی زۆری بەستراوێ، خەڵوەتگە، گەنجینە، کۆشک و سەرا، سەیرانگا، هۆڵ و مەیدان و راوگە و ژور بەڵگەی هێز و توانایە.

محەمەد بن ئەحمەد ئەل هەمەدانی وتی هۆی بیناکردنی قەسری شیرین، کە یەکێکە لە عەجایبەکانی دنیا، ئەوەیە، پەروێز شا، نشینگەکەی لە قرمیسین بوە فەرمانی داوە باخێکی بۆ دروست بکەن دو فرسەخ بە دو فرسەخ بێ لە هەمو نێچیرێکی تێدا بێ تا هەمویان زاووزێ بکەن. هەزار پیاوی بۆ ئەوە راسپارد هەمو رۆژێ یەکی پێنج نان و دو رەتڵ گۆشت و شوشەیەک شەرابی بۆ بڕی بونەوە. کارەکە و کۆکردنەوەی نێچیرەکان حەوت ساڵی خایاند تا تەواویان کرد. کە تەواویان کرد چونە لای بلهبندی گۆرانیبێژ شا ئاگادار بکا لەوەی ئەو فەرمانی پێ کرد بون ئەوان تەواویان کردوە. گۆرانیەکی دانا ناوی نا باخی نێچیروان شا پێی خۆش بو. فەرمانی دا پارە بە پیشەکارەکان بدەن.

کە مەست بو لە شیرینی پرسی، داوایەکی لێ بکا. وتی ئەمەوێ لەم باخەدا دو جۆگەم لە بەرد بۆ بتاشی شەرابیان پێ دا بڕوا و، لە بەینی دو جۆگەکەدا کۆشکێکم بۆ بکەی لە وڵاتەکەت دا وێنەی نەبێ. رازی بو. بەڵام لە بەر مەستی ئاگای لە خۆی نەبو، لە بیری چوەوە. شیرین خۆی نەیوێرا بیری بخاتەوە داوای لە بلهبند کرد بە گۆرانی بیری بخاتەوە بەرامبەر بەوە بەڵێنی دایە هەرچی زەوبوزارێکی هەیە لە ئەسفەهان بەوی ببەخشێ. گۆرانیەکەی دانا بەڵێنەکەی شا بە شیرینی دابو بە بیر هێنایەوە. شا وتی ئەوەی لە بیرم چوبو

بیرت خستمەوە. فەرمانی دا دو جۆگاکە دروست بکەن. کۆشکەکەش لە بەینیان دا، بە جوانترین شێوە دروستیان کرد...
مایدشت 202/4:
قەڵایەک و شارێکە لە "نواحی" خانەقین لە عیراق.
دینەوەر 370/2:
شارێکە لە "ئەعمالی جەبەل" نزیک قرمیسین.
لە نێوان دینەوەر و هەمەدان دا بیست و شتێ فرسەخە.
لە دینەورەوە بۆ شارەزور چوار مەرحەلەیە.
دینەوەر بە قەد سێیەکی هەمەدانە، بەروبوم و کشتوکاڵ و ئاوی زۆرە. خەڵکەکەی لە هی هەمەدان بدەترن.
ژمارەیەکی زۆر ئەهلی ئەدەب و حەدیسی تێدا هەڵکەوتوە.
سرماج 42/3:
قەڵایەکی سەختە لە نێوان هەمەدان و خوزستان دا لە "جبال" هی بەدری کوڕی حەسەنەوەی خاوەنی سابور خواستە، لە سەختترین و قایمترینیانە.
سی سەر 105/3:
شارێکە هاوسنوری هەمەدانە. ناو نراوە سی سەر، لە بەر ئەوەی لە نزماییەک دایە لە نێوان سەری سی ئاکام دا. لە نێوان هەمەدان و ئازەربایجان دایە. قەڵاکەی و شارەکەی لە سەردەمی ئەمینی کوڕی رەشیدا دروست کراوە. ئەوەندە کانی و سەرچاوەی لێیە ناژمێردرێن پێی ئەوترا سەدخانیە.
تا ئێستاش سی سەر و دەروبەری لەوەڕگای رانی کوردەکان و هی ترە.
.....
خانقین 211/2:
شارێکە لە سەواد، کەوتۆتە سەر رێگەی بەغداد – هەمەدان. لە گەڵ قەسری شیرین 6 فرسەخە و لە گەڵ حەلەوان 6 فرسەخە.
کانی گەورەی نەوتی تێدایە. داهاتی زۆرە.
پردێکی گەورە لە سەر دۆڵەکەیەتی 24 تاقە و هەر تاقێکی 20 گەزە. جادەی خوراسان – بەغدادی لە سەرە.
بهستون 405/1:
گوندێکە لە نێوان هەمەدان و حەلەوان دا 4 مەرحەلە لە هەمەدان و 8 فرسەخ لە قرمیسین دورە.
شاخی بێستون ئەوەندە بەرزە کەس ناگاتە لوتکەکەی. روەکەی لە سەرەوە بۆ خوارەوە وەکو هەڵکەنرابێ لوسە.
رێگای حاجییان بە بنارەکەی دا ئەڕوا.
نەخشی پەروێز و شیرین و ... تێدایە....
حلوان 173/2:
لە دوای سنوری سەوادی عیراق دایە، دوای ئەوە "جبال" ە.
لە دوای شکانی جەلەولا ئیسلام بە "سوڵح" گرتویەتی.
لە دوای کوفە و بەسرە و بەغداد و واسیت و سامەڕا گەورەترین شاری نزیکی عیراقە لە شاخەوە.
بەفری لێ ئەبارێ. ئاوەکەی گۆگردیە.
هەنارێکی هەیە لە دنیادا وێنەی نیە و هەنجیرێکی زۆر باشی هەیە لە بەر خۆشی پێی ئەڵێن شاهەنجیر.

چەند گەراوی لێیە بۆ تەناوی کەڵکی لێ وەرئەگرن.
جوزکان 91/2:
شاخێکە لە حەلەوان، کوردی لێ نیشتەجێیە.

## کورد لە دەڤەری "خوزستان"

لوڕ 184/4:
کورەیەکی فراوانە لە نێوان ئەسفەهان و خوزستان دا. لە "عەمەل" ی خوزستان دائەنرا بەڵام خرایە سەر "جیبال" چونکە لەوێوە نزیک بو.
اللر 177/4:
کۆمەڵێکە لە کوردەکان: "وهو جیل من الاکراد" لە چیاکانی نێوان ئەسبەهان و خوزستان دایە. ئەو ناوچانە بەوە ئەناسرێن ئەوترێ وڵاتی لوڕ، وە پێی ئەوترێ لوڕستان و پێیشی ئەوترێ لوڕ.

## ئەنجامگیری

زانیاریەکانی یاقوتی حەمەوی دەربارەی کۆمەڵگای کورد لە کۆتایی سەدەی یانزەهەم و سەرەتای سەدەی دوانزەهەمی زاین دا بە زانیاری دەستی یەکەم دائەنرێن و، ئەشێ ئاگاداریەکانی کە لە معجم البلدان دا تۆماری کردون بە سەرچاوەیەکی گرنگ دابنرێن بۆ لێکۆڵینەوەی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی، ئابوری، فەرهەنگی ئەو سەردەمەی کورد و هەڵهێنجانی هەندێ ئەنجامگیری:

یەکەم: دەربارەی ناوەکانی کورد و کوردستان

1. 1. ناوی کورد

ناوی کورد لە چاخی ئەمەوی و لە چاخی عەباسی دا وەکو کۆمەڵێ خەڵک، کۆمەڵێ تیرە، لە روی رەگەز و زمان و نەریتەوە، جیاواز لە عەرەب و فارس و تورک زۆر جار ناوی لە ناو روداوەکان دا هاتوە، تەنانەت سیاسیەکی گەورەی وەکو نیزامولمولک، کە سەد ساڵ زیاتر پێش لە دایکبونی یاقوت ژیاوە، لە سەردەمی خۆی دا باسی میرەکانی کوردی لە ریزی میری گەلە ناودارەکانی ناوچەکەدا ژماردوە، لە "سیاسەتنامە" کەی دا (کە ساڵی 484 ک نوسراوە) لە باسی دانانی بارمتەدا ئەڵێ: "ئەمیرانی عەرەب و کوردان و دەیلەمان و رۆمیان.... ل138".
هەروەها یاقوت چەندین جار ناوی کوردی لە گەڵ ناوی شار و گوند و قەڵا و لەوەرگا و ئاواییەکانی ناوچەکەدا باس کردوە بەڵام ئەویش هەرجارەی بە پێی جیاوازی ناوچەکان و عەشیرەتەکان، ناوی بردون، لەوانە:
الاکراد البوختیة 52/1. 46/2: کوردانی بوختی.
الاکراد البشنوية 339/1: کوردانی بشنویە.
کوردانی بلاشجان و سبلان و ناوی رودان 109/1.
من طوائف الاکراد 284/2: لە تائیفەکانی کورد.
جیل من الاکراد 177/4: کۆمەڵێک لە کوردان.

بەڵام هێشتا ناوێکی تایبەتی و دیاریکراو نەبوە بۆ "تەعریف" ی کورد. بە یەکێ لە زاراوەکانی قەوم، امة، ملة.

1. 2. ناوی کوردستان

لە چەندین جێگای "معجم" ەکەی دا ناوی شوێن وەکو نیشتمانی میللەتانی جیاواز ئەبا لەوانە: دیلمستان، سجستان، سیستان، لورستان... کەچی ناوی کوردستان نابا. بەڵکو کە باسی شوێنی ژیان و نیشتەنی کورد ئەکا بە ناوی جیاواز باسی ئەکا. لەوانە:

منزل الاکراد ومحلتهم... من احیاء الاکراد (407/3)

هەروەها بە زۆزان و هەکاریە و بوختیە ... ناوی ئەبا. بەم پێیە ئەبێ ناوی کوردستان، بۆ شوێنی ژیانی کورد، لەو سەردەمەدا هێشتا وەکو زاراوەیەکی جوگرافی، چ هی مرۆیی– بەشەری، چ هی سروشتی– تەبیعی و، چ هی سیاسی یان کارگێڕی، نەچەسپی بێ و نە بوبێ بە باو.

دوەم: هەبونی کەمینەی دینیی جیاواز

یاقوت هەندێ زانیاری لە سەر هەندێ دین و مەزەب بە دەستەوە ئەدا کە ئەودەم لە کوردستان هەبون. لەوانە:

2. 1. زەردەشتی

ناوی شوێنێکی بردوە نوسیوێتی:

بیت النار 411/1:

گوندێکی گەورەی هەولێرە 8 میل دورە لێی.

هەر بەم بۆنەیەوە یاقوت شیعرێکی نوسیوەتەوە هەولێر تۆمەتبار ئەکا بە "دارالفسق" چونکە "بیت النار" بۆتە دەلیزی هەولێر.

"بیت النار" هاوتای عەرەبی وشەی "ئاتەشگا" ی فارسی و کوردیە کە پەرستگای زەردەشتیەکان بوە. ئێستا لە دەڤەری هەولێر نە شوێنێ بەم ناوەوە ماوە و نە شوێنەواری دیار و ناسراوە.

2. 2. ئێزەدی

ناوی شوێنێکی تری بردوە نوسیوێتی:

داسن 284/2:

شاخێکی گەورەیە لە باکوری موسڵ لە لای رۆژهەڵاتی دیجلە خەڵکێکی زۆری لێیە "من طوائف الاکراد" کە پێیان ئەوترێ: داسنی.

ئێستاش هەمان چیا و ناوچە بە هەمان ناو ماوە پێرەوانی ئۆلی ئێزەدی لێیە. هەندێ جار بە ئێزەدیەکانیان وتوە داسنی.

2. 3. مەسیحی

ناوی هەندێ شوێنی بردوە کە دێری مەسیحیەکانی لێ بوە. نوسیوێتی:

دیر الجودي 338/2:

جودی ئەو شاخەیە کەشتیەکەی نوحی لە سەر گیرساوەتەوە. دێرەکە لە سەر لوتکەی جودی دروست کراوە. ئەڵێن لە سەردەمی نوح دا دروست کراوە.
دیر الجب 337/2:
دێرێکە لە نێوان هەولێر و موسڵ دا بەناوبانگە ئەوانەی فێ یانە روی تێ ئەکەن زۆریان چاک ئەبنەوە.
دیر الکلب و دیر الکوم 358/2:
لە نزیک باعەزرایە لە موسڵ. ئەوانەی سەگ ئەیان گەزێ و هار ئەبن روی تێ ئەکەن ئەگەر زو بچن چاک ئەبنەوە.
دیر الزعفران 344/2:
لە نزیک جزیرەی ئبن عومەر دایە لە ژێر قەڵای ئەردمشت. زەعفەرانی لێ ئەچێنرێ.
دیر الفائر 354/2:
لە نزیکی حەلەوانە لە سەر چیایەکە.
رەنگە هەمان ئەم دێرانە و لە هەمان ناوچەدا نەمابن، بەڵام ئێستاش مەسیحی لە کوردستان ماون.

2. 4. شیعەی زەیدی
ناوی شوێنێکی تری بردوە لە شارەزور نوسیویتی:
شهرزور 165/3: ... لە شارەزور شارێکی تری لێیە ... بە شیز ناسراوە خەڵکەکەی شیعەی صالحی زەیدی ە لە سەر دەستی زەیدی کوری عەلی دا موسوڵمان بون... ساڵی 341 خەڵکی نیم ئەز رای، بە رواڵەت بە بیانوی شەریعەتەوە بەڵام لە سۆنگەی دەمارگیری دینیەوە، چونە سەریان، کوشتیانن و تاڵانیان کردن و ئاگریان تێ بەردان.
ئێستا شیعەی زەیدی لەو ناوچەیەدا نەماوە، بەڵام لەو ناوچەیەدا کاکەیی لێیە، کە نە شیعەی زەیدیە و نە سوننەیە بەڵکو ئاینێکی جیاوازە.

سێیەم: دەربارەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کورد
به پێی زانیاریەکانی ناو معجم ئەشێ کوردانی سەردەمی یاقوت بەمجۆرە پۆلێن بکرێن:

3. 1. دەوارنشین.
ئەوانە بون کە کۆچەر بون. ئاژەڵداریان کردوە. بە دوای لەوەردا گەرمیان و کوێستانیان کردوە. گۆشت و سپیایی و خوریان بەرهەم هێناوە لە بەرامبەردا پێویستیەکانی ژیانیان لە شارەکان کریوە.
پێ ئەچێ لەو سەردەمەدا زۆری کورد دەوارنشین بوبن. بۆ نمونە لە دەڤەری فارس باسی پەنجا هەزار خێزان و لە دەڤەری شارەزور باسی چل هەزار خێزان ئەکا، ئەمە سەرەڕای ناوچەکانی تر.
خێڵی کوردی، رێکخراوەیەکی کۆمەڵایەتی، ئابوری، جەنگی بوە.
سەرۆکی گشتی هەبوە، لە خوار ئەویشەوە سەرۆکی تیرە و هۆز و بەرەباب هەبوە.
سەرزەمینێکی دیاریکراوی هەبوە، کە جوڵەی هاوینە و زستانەی بە دوای لەوەڕ و هەواردا لە گەرمیان و کوێستان کردوە.

ئابوری تایبەتی خۆی هەبوە کە لە سەر بناغەی پەروەردەکردنی ئاژەڵ و کۆکردنەوەی بەرهەمەکەی دامەزراوە. ئاڵوگۆڕی بازرگانی دیاریکراو بوە. بەرامبەر بە فرۆشتنی بەروبومی ئاژەڵداری کڕینی پێویستیە بنەڕەتیەکانی ژیان وەکو جلوبەرگ و ئاسنجاو.

هێزی مرۆیی خۆی هەبوە بۆ پاراستنی سەروسامانی خۆی لە دەستدرێژی خێڵەکانی دراوسێی و هێزەکانی حکومەتی ناوەندی یا خۆجێیی و، بۆ پەلاماردانی لەوەڕگا و خێڵەکانی دراوسێی.

پێویستی بە شار و ئاوەدانی جێگیر نەبوە، بەڵکو بە رێگری داناوە لە سەرڕێی کۆچوڕەوی دا.

خێڵی کوردی قازانجی لە دامەزراندنی دەوڵەتی ناوەندی بەهێزدا نەبوە.

هەندێ لێکۆڵەری مێژویی هەمو ئەو کۆچەرانەی لەو سەردەمەدا بە کورد ناوبراون، بە کورد نازانن، بەڵکو ناوبردنیان بە کورد ئەگێرنەوە بۆ هۆکاری تر. بۆ نمونە: برتولد اشپولر (ترجمه جواد فلاطوری): تاریخ ایران در قرون نخستین اسلامی، جلد اول، ص 438-439. دوسیوێتی: "لە بەر ئەوەی چادرنشین بون و زمانەکەیان لە گەڵ دانیشتوانی دەوروبەریان جیاواز بوە بە کوردیان ژماردون."

3. 2. قەڵانشین،

ئەوانە بون کە جەنگاوەر بون. کارمەندی دەزگای حوکمڕانی ئاسایشی ناوچەکە بون بۆ پاراستنی لە داندەکانی جەردە و رێگر و لە هێرشی دوژمن. هەروەها بۆ پاراستنی دەسەڵاتی فەرمانڕەوای وڵات و کۆکردنەوەی باج و سەرانەی جیاواز. موچەیان لە حاکم وەرگرتوە یان خۆیان بە زۆر لە خەڵکیان کۆ کردۆتەوە.

3. 3. گوندنشین،

ئەوانە بون کە لە دێهات دا نیشتەجێ بون. کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییان کردوە. خۆراکی خۆیان و دانیشتوانی وڵاتیان بەرهەم هێناوە.

گوندی کوردی بە زۆری لە نزیک سەرچاوەی ئاو، بە تایبەتی کانی و کارێز، ئاوا کراوەتەوە.

زۆرتر بەرهەمی کشتوکاڵی هەبوە، کەمتر بەرهەمی ئاژەڵداری.

گوند، یەکەیەکی کۆمەڵایەتی، کارگێڕی، ئابوری، تا رادەیەکی زۆر سەربەخۆ، بچوک و دابڕاو بوە لە دەوروبەری. بۆ رێکخستنی کاروباری ژیان و پەیوەندی لە گەڵ دەرەوە کوێخایان لە خۆیان هەبوە. ئابوری گوند داخراو بوە، تا رادەیەکی زۆر "ئیکتیفای زاتی" هەبوە. لە ناوخۆی دا ژنوژنخوازی کردوە. کەمتر پێویستی بە تێکەڵاوی هەبوە لە گەڵ دراوسێکانی. سەودای بازرگانی کەم بوە، بەروبومی کشتوکاڵی فرۆشتوە لە بەرامبەردا پێویستیە بنەڕەتیەکانی ژیان بە تایبەتی ئاسنجاو و جلوبەرگی کڕیوە.

گوند پێی خۆش نەبوە هیچ لایەنێکی دەرەکی دەس وەر بداتە کاروباری ناوخۆیەوە، لە لایەکی ترەوە پێویستی بە دۆخی هێمن و ئارامی هەبوە، خۆیشی هێزی مرۆیی کەم بوە، نەیتوانیوە خۆی بپارێزی. زۆر جار بون بە ژێر دەستوپێی لەشکری هاتو، خێڵە رەوەندەکانەوە.

توانای پێشکەوتن لە گوندا کەم بوە.

3.4. شارنشین.
ئەوانە بون کە پیشەی جۆراوجۆریان هەبوە. لە بازاڕەکانی شارەکانیان دا خۆراکیان لە دێهاتیەکان کڕیوە و بەرهەمەکانی خۆیانیان پێ فرۆشتونەتەوە.

## چەند تێبینیەک سەرنج رائەکێشن:

یەکەم. ژمارەی شار و گوندەکانی کوردستان لە چاو ئەو پانتاییەدا کە باسی کوردی تێدا ئەکرێ کەم بوە. یاقوت لە سەفەرەکانی دا چەند جارێ بە ناو کوردستان دا تێپەڕیوە بەڵام زۆر بە دەگمەن باسی ئاواییەکانی ئەکا لە کاتێک دا بە وردی ناوی زۆر لە گوند و ئاواییەکانی شوێنەکانی تر باس ئەکا.

دوەم. خێڵ و قەڵا و گوند و شارە کورد نشینەکان هەموی پێکەوە یان زۆری پێکەوە لە یەکەیەکی کارگێڕی یەکگرتودا نەبون و سەر بە یەک حاکم نەبون. بەڵکو پەرت و بڵاو بوە و هەر خێڵە و هەر بەشەی سەر بە حاکمێ بوە.

سێیەم. باسی هەندێ شاری کوردنشین ئەکا کە ئێستا نەماون و. باسی هەندێ شاری تر ئەکا کە وەکو ئەو ئەڵێ ئەرمەنی نشین بون. یاخود هیچ ئاماژەیەک بۆ هەبونی کورد ناکا لە ناو ئەو شارانەدا. کەچی ئێستا کوردنشینن.
بۆ نمونە ئێستا شارێ نەماوە بە ناوی شارەزورەوە. کەچی شارەکانی ئامەد و میافارقین و ئەرجیش. ئەرزنجان. کە ئەو بە کورد ناوی ئەبردون ئێستا کەوتونەتە ناو جەرگەی کوردستانەوە.

چوارەم. ئەو شوێنانەی یاقوت باسیان ئەکا ئێستا هەر بەشەیان کەوتونەتە ناو یەکێ لە دەوڵەتانی ناوچەکەوە. گۆڕانی دیمۆگرافیی بنەڕەتیان بە سەردا هاتوە. ئەگەر ئەو زەمانە هەندێکیان مەڵبەندی ژیانی کورد بوبن ئێستا کوردیان تێدا نەماوە. یان ئەگەر تێکەڵاو بوبن لە کورد و رەگەزی تر ئێستا بونەتە کوردی و رەگەزی تری تێدا نەماوە.

شار بۆ ئەوەی ئاوا بکرێتەوە و گەورە بێ. ئەبێ "مەڵامەت" ێکی هەبێ بۆ ئاوابونەوە و. درێژەپێدانی ژیانی بەردەوام تێیدا و پەرەسەندنی. ئەو مەڵامەتە هەرچی بێ. ئابوری. بازرگانی. دەریایی بێ. سەرەڕێیی هاتوچۆی کاروان بێ. ناوەندی جەنگی بێ. یا فەرهەنگی. یا هەر مەڵامەتێکی گرنگی تر کە بونی پێویست بکا.
ئەوسا شار پێویستی بە رێکخستنی پێشکەوتوتر ئەبێ لە هی گوند و قەڵا و خێڵ.
شار پێویستی ئەبێ بە هەبونی پیشەی جۆراوجۆر. پێویستی ئەبێ بە بازاڕ و بازرگانی. پێویستی ئەبێ بە تێکەڵاوی و ئاڵوگۆڕی بەرهەم و شارەزایی لە گەڵ دەوروبەراوسێ. شار پێویستی بە کەسێک ئەبێ گەورەی بێ. ئەویش پێویستی ئەبێ بە: داوودەزگای ئەمنی بۆ پاراستنی ئاسایشی شار. داوودەزگای سەربازی بۆ پاراستنی لە هێرشی بێگانە. داوودەزگای کارگێڕی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری رۆژانەی خەڵک. داوودەزگای داوەری بۆ بەلاداخستنی کێشە و ناکۆکی ناو خەڵک. داوودەزگای دارایی بۆ کۆکردنەوەی باج و داهاتی ناوچەکە و. ژیاندنی فەرمانبەرانی داوودەزگاکانی.. بەمجۆرە. شار توانیویەتی ببێتە ناوەندی دروستکردنی دەوڵەت و نەتەوە.
لە کوردستانی سەردەمی یاقوت دا شاری وەها لە کوردستان دا نەبوە.

# کورد و
# جەنگی 20 ساڵەی ڕۆم و عەجەم
(1533 – 1554 ز/ 940 – 962 ک)

## پێکهاتنی ئاماسیە

جەنگی چاڵدێران (ئابی 1514 ز/ 920 ک) بە شکستی شا ئیسماعیلی سەفەوی (907 – 930 ک) و سەرکەوتنی سوڵتان سەلیمی عوسمانی تەواو بو. لەو شەڕەدا ژمارەیەکی زۆر قزلباش و سەرکردە ناودارەکانیان کوژران و هەندێکیان بە دیل گیران لەوانە هاوسەرێکی شا. شاری تەوریزی پایتەختی ئێران گیرا. لە ئەنجامی ئەم شەڕەدا بەشی هەرە زۆری کوردستان و عێراقی عەرەبی کەوتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیەوە. بەڵام ئەم سەرکەوتنە جەنگیە گرنگە نەی توانی کۆتایی بە دەسەڵاتی دەوڵەتی تازە دامەزراوی سەفەوی – شیعە بهێنێ، بەڵکو بو بە سەرەتای زۆرانبازیەکی خوێناوی لە نێوان ئەم دو دەوڵەتەدا کە چەند قەرنی خایاند.
سوڵتان سەلیم بە هۆی پشێوی ناوخۆی لەشکرەکەیەوە پاش 8 ڕۆژ ناچار بو تەوریزی بەجێ هێشت و کەوتە گەڕانەوە بۆ دواوە بۆ ئاماسیە. شائیسماعیل دوای تێشکانی چاڵدێران کشابوەوە دەرگەزێن. سەرلەنوێ هاتەوە پایتەختەکەی خۆی، تەوریز. لەوێوە دەستەیەکی بە نوێنەرایەتی خۆی بە دیاری و پێشکەشی زۆر و ئاوازەوە رەوانەی لای سوڵتان سەلیم کرد بۆ وتووێژ و رزگارکردنی هاوسەرەکەی. ئێلچیەکانی شا 4 کەسی ناودار بون: سەید عەبدولوەهاب، قازی ئیسحاق کە بە قازی پاشا ناسراو بو. مەلاشوکروڵڵای موغانی، حەمزە خەلیفە کە لە مریدەکانی شێخ حەیدەر و جێنشینی ئەو بو. سوڵتان گوێی نەدایە تکای ئێلچیەکان بەڵکو عەبدولوهاب و ئیسحاقی لە قەڵای نوێی بۆسفۆر (بوغاز قرا دنکیز) و مەلا و حەمزە خەلیفەی لە (دیمقوقە) زیندانی کرد و، بۆ شکاندنی شەرەفی شا ئیسماعیل، لە باتی ئەوەی هاوسەرەکەی ئازاد بکا لە تاجیزادە جەعفەر چەلەبی مارە کرد. (هامر:850)

سوڵتان سەلیم نامانە نەبو بۆ ئاشتی و ڕێککەوتن لە گەڵ شا ئیسماعیل. لەو نامەیەش دا کە سەلیم لە ناوەڕاستی شەشەکانی 921 دا بۆ حەکیم ئیدریسی بەدلیسی نوسیوە ئەڵێ:
"وا ئیستەش کوڕی ئەردەویلی: ئیسماعیلی گومڕا. حسێن بەگ و بارام بەگ ناوی ناردۆتە خزمەت بەختیاری مان. بە زمان و نوسینی هەمە جۆرە بەندەیی خۆی دەنوێنێ و دەپاڕێتەوە و بەزمان لوسی و ڕۆن تێ دان دەیەوێ دەگەڵی ئاشت بم و گوتویە: هەرچی من بمەوێ و ئارەزو بکەم بە بێ خۆگرتن دەیکا. بەڵام بەڵێن و دڵسۆزی جێگەی بڕوا نیە. لەبەرئەوە هەردو ڕاسپاردەم گرتن و خستمنە قەڵای دیمقوقە و پیاوەکانیشیانم هاویشتنە قەڵای کەلید ئەلبەحر. لەسەر تۆش پێویستە دەربارەی ناوبراوی بارکەوتو زۆر باش بیر بکەیەوە و هەر ئێستا بیری لێ بکەوە. بۆ بەرژەوەندی دەوڵەتی پایەدار و لە گەشەمان تێکۆشەر بە" (شەرەفنامە: 654 – 655)
دوژمنایەتی لە نێوان هەردو دەوڵەت دا چەسپی. هەردو لا دەستیان وەرنەدایە کاروباری یەکتریەوە. گورجستان و ئەرمەنستان و کوردستان و عەرەبستان بون بە مەیدانی شەڕ و پێکادانی خوێناوی. هەردولا بە هەمو ڕێگەیەک هەوڵیان ئەدا بۆ دەستگرتن بە سەر ئەم ناوچانەدا کە کەوتبونە نێوان هەردو دەسەڵاتی سەفەوی و عوسمانیەوە.
سیاسەتی شا ئیسماعیل بەرامبەر کورد، بوبو بە هۆی ڕەنجاندنی کورد و، نزیککەوتنەوەی کورد لە عوسمانی. لە دوای جەنگی چاڵدێران سوڵتان سەلیم پاککردنەوەی کوردستانی لە دەسەڵات و لایەنگرانی سەفەوی و ڕێکخستنەوەی کاروبارەکانی سپارد بە حەکیم ئیدریسی بەدلیسی کە سیاسیەکی کوردی بلیمەت بو. سوڵتان خۆیشی کەوتە سازدانی لەشکر بۆ داگیرکردنی سوریا و میسر و حیجاز.
تا دەوڵەتی سەفەوی دروست نەبو بو، دەوڵەتی ئاق قوینلو لە کوردستان و ئازەربایجان دا حوکمڕان بو. ئەوانە هەڕەشەیەکی کاریگەریان بۆ سەر عوسمانی دروست نەکرد بو. لەبەر ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی بە ناوی جیهاد و بڵاوکردنەوەی ئیسلامەوە خەریکی پەل هاویشتن بو لە ئەوروپا و، لە دوای فەتحی قوستەنتینە (1453 ز/ 857 ک) بو بوە مەترسیەکی گەورە بۆ سەر هەمو گەلانی ئەوروپا و بۆ سەر دینی مەسیحی. ئەوروپا بە خۆشحاڵیەوە هەواڵی دروست بونی دەوڵەتی ئێران و تیژبونی ناکۆکی مەزهەبی شیعی – سونیی لە نێوان سەفەوی و عوسمانی دا وەرگرت. هەوڵیان دا ئەم ڕوداوە نوێیە بۆ قازانجی خۆیان بەکاربهێنن. هەروەکو پێشتریش شا مەسیحیەکانی ئەوروپا لە گەڵ ئوزون حەسەنی ئاق قوینلو هەوڵیان دا بو.
دەوڵەتی تازە دامەزراوی شیعەی سەفەویش لەهەردو لایەوە هەستی بە مەترسیەکی گەورە ئەکرد: لە لای ڕۆژهەڵاتیەوە هەمیشە لەبەر مەترسی هێرشی ئوزبەگی سوننە و، لە لای ڕۆژئاوایەوە لەبەر مەترسی هێرشی عوسمانی سوننەدا بو. ئێران بۆ ئەوەی لە نێوان ئەم دو بەرداشەدا نەهاڕدرێ هەوڵی ئەدا هاوپەیمانێتی دەوڵەتانی مەسیحی ئەوروپی بە دەس بهێنێ. شا ئیسماعیل نامە و نێلچی نارد بۆ مەسیحیەکان و دوای ئەویش تەهماسبی کوڕی هەمان کاری دوبارە کردەوە.
لێکۆڵەرەوەیەکی هاوچەرخی ئێرانی، لەم بارەیەوە نوسیوێتی:
"وڵاتانی ئەوروپایی هەر کە پێوەندیان لە گەڵ ئێران دروست کرد، کەوتنە هاندانی دەوڵەتی ئێران بۆ جەنگ دژی عوسمانی... دەوڵەتانی ئەوروپایی لە زەمانی دامەزراندنی زنجیرەی سەفەویەوە لە ئێران تەلاشیان ئەکرد ماشێنی جەنگی گەورەی عوسمانی کە هەڕەشەی لە دڵی ئەوروپا ئەکرد، بەرەو ئێران هیدایەت بکەن و بە مەشغوڵ کردنیەوە لە جەبهەی ڕۆژهەڵات، لە گوشاری ئەو لە جەبهەی ڕۆژئاوا کەم بکەنەوە. هەروەکو سوڵتانی عوسمانی هەردەم ناچاربن نیوەی هێزە چەکدارەکانی خۆیان لە سنورەکانی ڕۆژهەڵات دا دابنێن، ئەوەش بو بە هۆی ئەوەی کە فتوحاتی ئەوان لە ئەوروپا ڕابوەستێ.

بێ هودە نیە کە "بوسک" سەفیری نەمسە لە دەرباری سوڵتان سلەیمانی قانونی... کە سپاکەی تا بەردەم دیواری ڤیەننا پێشڕەوی کرد، وتویەتی: "لە بەینی ئێمەو ئەمان دا تەنیا ئێرانیەکانی لێیە." یا جۆرج وسترن وتویەتی: "ئیمپراتۆریەتی سەفەوی لەم زەمانەدا تورکی لغاو کردوە، نەی هێشتوە زەرەری زۆرتر لە دنیای مەسیحی بدا."

لەم زەمانەدا وڵاتانی ئەورووپی شوێن دو ئامانج کەوت بون، یەکێکیان سیاسی – واتە یەکێتی لە گەڵ دەوڵەتی ئێران لە پێناوی شەڕدا دژی تورکی عوسمانی، ئەوی تر ئابوری – واتە دامەزراندنی پێوەندی بازرگانی لە گەڵ ئێران، بۆ ناردنی سەفیر لە لایەن وڵاتانی ئەورووپاییەوە بۆ ئێران ئەویش هەر بۆ جێبەجێ کردنی ئەم ئامانجانە بو..." (اصغر جعفر ولدانی:6)

مردنی سوڵتان سەلیم (918 – 926 ک/ 1512 – 1520 ز) و دانیشتنی سلێمانی کوڕی سەلیم (926 – 974 ک/ 1520 – 1571 ز) لە سەر تەختی سەڵتەنەت لە لایەک و مردنی شا ئیسماعیل (907 – 930 ک) و دانیشتنی تەهماسبی کوڕی (930 – 984 ک) لە سەر تەختی شایەتی لە لایەکی ترەوە، نەک کۆتایی بە دوژمنایەتی و جەنگ نەهێنا، بگرە چونکە هۆکانی ناکۆکیەکان هەر ما بون، دوژمنایەتیشیان هەر ماو قوڵتر ئەبو.

لە ململانێی ئێرانی – عوسمانی دا، ئێران لە سیاسەتی ناوچەیی دا، هەوڵی ئەدا کەڵک لە ئایدیۆلۆجی شیعە وەربگرێ و، میر و مەزنەکانی کورد بە خۆشی و خەڵات، یاخود بە زۆر بە لای خۆی دا ڕابکێشێ. لە سیاسەتی دەرەوەشی دا، هەوڵی ئەدا بنچینەی هاوپەیمانێتی لە گەڵ دەوڵەتانی مەسیحی ئەورووپا دژی عوسمانی دابمەزرێنێ.

عوسمانی یش لە سیاسەتی ناوچەیی دا، هەوڵی ئەدا کەڵک لە ئایدیۆلۆجی سوننە وەربگرێ، میر و مەزنەکانی کورد بە خۆشی یا بە زۆر بە لای خۆی دا ڕابکێشێ و لە سیاسەتی دەرەوەشی دا، ناچاربو دەس لە فتوحات و جیهاد هەڵبگرێ، بکەوێتە سازان لە گەڵ دەوڵەتانی مەسیحی ئەورووپا.

سوڵتان سلێمان پاش ئەوەی لە لەشکرکێشیەکی گەورەدا بۆ داگیرکردنی ڤیەننا سەر نەکەوت (936 ک/ 1529 ز) گەڕایەوە ئەستەموڵ. دوای ئەوە ئیتر چاوی بڕی بوە فراوانخوازی ئەرزیی لە لای ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆری عوسمانیەوە. بە تایبەتی کە ئێران یش دەستی هەڵنەگرت بو لە هەوڵدان بۆ فراوان بون لە ئەرمەنستان و گورجستان و کوردستان و عەرەبستان و، هەوڵدان بۆ ڕاکێشانی مەزن و میرەکانی کورد.

## جەنگی 20 ساڵەی سەفەوی – عوسمانی

چوها سوڵتانی تکەلو لە شوێنێکی نزیک ئەسفەهان لە لایەن حسێنخانی شاملووەوە کوژرا، ئولمە تکەلو کە والی تەورێز بو، داوای نیابەتی سەڵتەنەتی ئەکرد، لە ئەنجامی ئەوەدا لە خۆی ترسا ئەویش سزا بدرێ.

ئولمە کاتی خۆی لەوانە بو کە لە هەرای "شەیتانقولی" دا لە خاکی عوسمانیەوە هەڵات بو پەنای بۆ شا ئیسماعیل برد بو. ئولمە گەنجینەی تەورێزی تاڵان کردو پەنای بردە بەر دەوڵەتی عوسمانی. خۆی و دەستوپێوەندەکانی گەیشت بونە وان لەوێوە نامەی بەندایەتی خۆی بۆ سوڵتان سلێمان نارد. سوڵتان سلێمان فەرمانی دا بە میر شەرەفی بدلیسی (940 ک/ 1533 ز) کە بچێ بۆ پێشوازی و دڵنەوایی ئولمە و لە وێوە ڕەوانەی ئاستانەی بکا. (شەرەفنامە: 748)

میر شەرەف، ئولمەی هێنایە بدلیس. لەوێوە بە پۆشتەیی و بەڕێزەوە ڕەوانەی ئاستانەی کرد. ئولمە هەوڵی ئەدا سوڵتان سلێمان هان بدا بۆ ئەوەی هێرش بباتە سەر ئێران. ئاگاداری کرد لە گیروگرفتەکانی ناو ڕیزەکانی قزلباش و لە هەڕەشەی ئوزبەک. ئولمە ئەوەشی بە هەل زانی و زمانی لە میر شەرەف دا. میر شەرەفی تاوانبار

کرد بەوەی ڕێزی لێ نەگرتوە، چونکە لە ژێرەوە دۆستایەتی لە گەڵ قزلباش هەیە. داوای لە سوڵتان کرد بدلیسی پێ بسپێرێ بۆ ئەوەی لەوێوە پەلاماری ئێران بدا.
سوڵتان سلێمان، میر شەرەفی لە میرایەتی بدلیس خست. بدلیسی بە ئولمە بەخشی. ئەم کارەی سلێمان پێچەوانەی ئەو گفت و بەڵێنە بو کە کاتی خۆی لە نێوان حەکیم ئیدریس و میرە وارثیەکانی کورد و سوڵتان سەلیم دا بو. کە ئەبو میرایەتیەکانی کوردستان لە دەس خۆیان دا بمێنێتەوە.
میر شەرەف کاتی خۆی لە لایەن شا ئیسماعیلەوە لە خۆی گیرا بو. ماوەی 3 ساڵ بە دیلی لەوێ بو. لە کاتی هێرشی ئوزبەک دا بە سەرکردایەتی شەیبەک خان ئەویش فرسەتی هێنا و هەڵات و گەڕایەوە وڵاتی خۆی.
میر شەرەف یەکێک بو لەوانەی هاودەنگ لە گەڵ چەندین میر و مەزنی تری کوردستان، حەکیم ئیدریسیان کردە دەمڕاستی خۆیان بۆ هاندانی سوڵتان سەلیم بۆ پەلاماردانی ئێران. لە هێرشەکەی سەلیم دا بۆ سەر ئێران و لە شەڕی چالدێران دا شەرەف و نۆکەرەکانی بەشدار بون، دوای ئەوەش یەکێک لە هاوکارە نزیکەکانی حەکیم ئیدریس بو. بۆ ڕزگارکردنی شار و قەڵاکانی کوردستان لە دەسەڵاتی قزڵباش، بە تایبەتی لە شەڕەکانی ئامەد و قوچ حەسار کە دەوری کاریگەری هەبو لە ساخکردنەوەی کوردستان دا بۆ عوسمانی.

ئولمە لە ئەستەموڵ گەیشتە سوڵتان و، کرایە بێگلەربێگ. دو ملیون ئاسپەری بە موچەی ساڵانە بۆ بڕایەوە. بڕیار درا بدلیس و دەوروبەریشی بدرێتە ئەو. هەروەها فەرمان درا بە بێگلەربێگەکانی قەرامان، ئاماسیە، ئولقەدر، شام، دیاربەکر یارمەتی ئولمە بدەن بۆ گرتنی بدلیس. (هامر: 1068) فیل یەعقوب پاشا میری میرانی دیاربەکر سەرکردایەتی هێزەکەی ئەکرد کە نزیکەی 30 هەزار کەس بو. سەدری ئەعزەم ڕقی کۆنی لە میر شەرەف بو ئەویش بۆی تێ چاند بو. (شەرەفنامە: 751) شەرەف سەری دانەنەواند، قەڵاکانی بدلیس، ئەختەمار، موش، ئەخلات، کیفەندور، ئامورەک، کەهوک، فەیرز، سەلم، گولخار، قاتیک، سوی، بە گەورەپیاوەکانی ڕۆژکی قایم کرد. فیل یەعقوب و ئولمە لە (938 ک/ 1532 ز) چونە سەر بدلیس و دابلوقەیان دا، 3 مانگی خایاند. (شەرەفنامە: 752) میر شەرەف پەلاماری ئولمە و هێزەکەی دا. لەشکری عوسمانی بە شکاوی گەڕانەوە. ئەم هەواڵە لە کاتێک دا بە سوڵتان سلێمان گەیشت، کە خەریک بو ئەچوە ناو شاری سیرمیوم.
میر شەرەف هانای بۆ تەهماسب برد بو. تەهماسب بۆ ڕێزلێنانی میر شەرەف خۆی سەرکردایەتی لەشکرێکی گەورەی کرد. شەرەف لە ئەخلات میوانداریەکی گەورەی بۆ شا و سەردار و دەستوپێوەندەکانی کرد و، باجێکی زۆری لە دانیشتوانی ناوچەکە کۆکردەوە بیدا بە شا. (شەرەفنامە: 753) تەهماسب لە 939 ک دا فەرمانێکی درێژی بۆ میر شەرەف نوسی، پلەی خانی پێ بەخشی و لە فەرمانەکەدا بە "میری میران و فەرمانڕەوای هەمو میرانی کوردستان" ناوی ئەبا. (شەرەفنامە: 757) نوسیویەتی: "لە سەر هەمو میر و گزیران و سەرکردانی کوردستانە کە ئەم خانە ناوبارە بە میری میران بزانن و سەرکزی بەفەرمانی بن و هیچ کات و سات و زەمانێ لە فەرمانی دەرنەچن و خاوە خاویشی لێ نەکەن و گوێ بۆ جارەکانی شل کەن و هەر پێداویستێکی بوێ کە بۆ دەوڵەت بەهرەی هەبێ بۆی پرەی هەبێ بۆی پێک بێنن." (شەرەفنامە: 758)
تەهماسب لە گەڕانەوەی دا بۆ تەورێز هەواڵی پێ گەیشت کە عوبێد خانی ئوزبەک هێرشی کردۆتە سەر خوراسان و، مەترسیەکی گەورەی بۆ سەر ناوچەکە دروست کردوە. تەهماسب خۆی سازدا بۆ دەرکردنی و، ئامۆژگاری میر شەرەفی کرد: تا ئەو مەسەلەی عوبێد خان بەلایەک دا نەخا، شەرەف بە هەر جۆرێ بێ خۆی لە گەڵ عوسمانی بسازێنێ و، فەرمانی دا بە هەندێ لە سەرکردەکانی قزڵباش لەوانە هەلهەل سوڵتانی پازوکی و

ئەمیر بەگی مەحمودی (ئەم دوانەیان کورد بون) و موسا سوڵتان والی ئازەربایجان، کە لە کاتی پێویست دا یارمەتی شەرەف بدەن. (شەرەفنامە: 759)

## هێرشی یەکەمی سلێمان: 940 ک/ 1533ز

پەلاماردانی ئێران ماوەیەک بو لە بیری سلێمان دا بڕیاری لێ درا بو. بەڵام لە بەر هەندێ قازانجی دەوڵەتی دەر نەئەخرا، ئیتر بە تەواوی دەرکەوت و ئاشکرا بو. لە پایزی 940 ک/ 1533 ز دا سلێمان لەشکرێکی گەورەی لە ژێر سەرکردایەتی سەدری ئەعزەم ئیبراهیم پاشادا خستە ڕێ بەرەو ئازەربایجان، بە هیوای ئەوەی لە بەهاردا سوڵتان خۆیشی بە نیازی گرتنی بەغداد بکەوێتە ڕێ. (هامر: 1069) شەرەف ئامۆژگاریەکەی تەهماسبی لە گوێ نەگرت کە هەرچۆنێ بێ خۆی لە گەڵ عوسمانی بکونجێنێ تا ئەو پەژارەی عوبێد خانی ئوزبەک بە لادا ئەخا، (شەرەفنامە: 760) کەوتە تۆڵەسەندنەوە لەوانەی هاوکاری دوژمنیان کردبو. شەرەف بەوە میرە کوردەکانی ترساند، تەنانەت هەندێ لە گەورەکانی ڕۆژەکیشی لێ ڕەنجان و دایانە پاڵ دوژمن. بەرایی هێزەکەی عوسمانی کە سەرلەنوێ ئولمە و فیل یەعقوب پاشا سەرکردەیەتیان ئەکرد نزیکەی 10 هەزار کەسێ بون، بەشێکی زۆری ئەوانە کورد بون و، هەندێکیان لە گەورەپیاوەکانی ئێلی ڕۆژەکی بون لە ڕێگەی خیزانەوە بۆ پەلاماردانی بدلیس بەرەو تاتیک کشان. شەرەف نزیکەی 5 هەزار کەسی لە گەڵ بو لە تاتیک بەرەنگاریان بو، لە گەرمەی جەنگ دا ئەمیر بەگی مەحمودی سەرکردەی باڵی ڕاستی لەشکرەکەی شەرەف، لە شەرەف هەڵگەڕایەوە، دایە پاڵ دوژمن. لەو هێزەی لە گەڵ میر شەرەف بو 700 کەسی کوژرا، خۆیشی پێکراو کوژرا. (شەرەفنامە: 762)

هێزی گەورەی عوسمانی هێشتا نەگەیشتبوە قونیە. بارگەی لە چنارلو خست بو. ئولمە هەواڵی تێشکانی لەشکرەکەی بدلیسی لە گەڵ کەللەی براوی شەرەفی بۆ ئۆردو نارد.

حکومەتی وڵاتی بدلیسی درایە شەمسەدینی کوڕی شەرەف و، قەڵاکانی دەوروپشتی کەوتنە ژێر دەستی عوسمانی. لەشکری عوسمانی لە پیرەجک لای فوراتەوە پەڕینەوە. 6 هەفتە لە ئامەد مانەوە لەشکرە پەراگەندەکان کۆبونەوە. لە سوارق بارەگایان خست، لەوێ کلیلی انیک و وان یان بۆ هێنان تەسلیم بون، خوسرەو پاشای حوکمڕانی شام کرایە حکومەت و سەرداری وان. ئەمیر بەگی سەرۆکی هۆزی مەحمودی کلیلی قەڵای سیارنی هێنا، ئینجا قەڵاکانی هەرەم، بیدقار، ردزنی، اونیک، بایەزید، ئیهتیمام و چەند قەڵایەکی تر تەسلیم بون. (هامر: 1701 – 1702)

یەکەم ڕۆژی ساڵی 941 ک ئیبراهیم پاشا چوە ناو تەورێزی پایتەختی ئێران و بارەگای ئۆردوی لە چەمەنی سەعداباد دانا. (هامر: 1702)

زەرەری گەورە لە قزلجە طاغ لە هێزی عوسمانی کەوت. ئیبراهیم ئازەربایجانی سپارد بە ئولمە. ئەو ڕۆژەی ئیبراهیم پاشا لە ئامەد دەرچو بو، سوڵتان سلێمانیش لە ئوسکودارەوە بەرەو ئێران بە ڕێ کەوت بو. (هامر: 1072) بۆ ئەم لەشکرکێشیە هەمو گەورە و مەزنەکانی کوردیش کۆکرابونەوە و خرابونە ناو لەشکرەوە، لەوانە: شەمسەدینی کوڕی شەرەف کە لە جێگەی باوکی کوژراوی کرابوە میری بتلیس. (شەرەفنامە: 769) بەدر بەگی جزیرە. (شەرەفنامە: 290) جەمشید بەگی پالو. (شەرەفنامە: 373)

لەو چاخەدا کە میر و سەردارەکانی کوردستان لە گەڵ سلێمان دا ڕویان کردە بەغداد سوڵتان ئەحمەدی خیزانی خزمەتی گرنگی کرد بو لە سەر ئەوە سوڵتان سلێمان نازناوی "جەناب" ی پێ بەخشی. (شەرەفنامە: 404)

تەهماسب کە هەواڵی هێرشی عوسمانی پێ گەیشت، دەستی لە ڕاوونانی ئوزبەک هەڵ گرت بەرەو ڕۆژئاوای ئێران گەڕایەوە. گەیشتە سوڵتانیە. سوڵتان سلێمان و ئیبراهیم پاشا و لەشکری عوسمانی تەورێزیان گرت بو. تەهماسب نەیتوانی بەرەنگاری لەشکری گەورەی عوسمانی بکا، کشایەوە دەرگەزێن و هەمەدان.
لەشکری عوسمانی بە سەرکردایەتی سلێمان خۆی لە تەورێزەوە بەرەو میانە، زنجان، سوڵتانیە، ڕۆیشت. شا لە بەری هەڵات. (شەرەفنامە: 768) سلێمان بۆ بەغداد کەوتە ڕێ. لە ڕێگا بە هۆی کەمیی خۆراک و ئالیک و زۆری بەفر و توندی سەرماوە، بەشێکی هێزەکەی و باربەرەکانی فەوتان و بە ناچاری هەندێ لە تۆپ و بارەکانیشیان لە ڕێگە بە جێ هێشت. (هامر: 1074)، (شەرەفنامە: 768)
محەمەد بەگی تکەلو حوکمڕانی بەغداد بە بیستنی هەواڵی گەیشتنی هێزەکانی عوسمانی و نائومێد بونی لە گەیشتنی هێزی یارمەتی ئێرانی بە بێ شەڕ لە بەغداد کشایەوە. لە پێش دا ئیبراهیم پاشای سەدری ئەعزەم چوە بەغدادەوە دوایی تریش سلێمان خۆی بۆ بە سەربردنی زستان چوە بەغداد (941 ک). سلێمان بە هاوکاری سەدری ئەعزەم زستانەکەی خەریکی ڕێکخستنەوەی کاروباری ئەو ناوچانە بو کە داگیری کرد بون و، دابەشی کردن بە سنجاق و تیمار و زەعامەت. هەروەها گۆڕی ئەبو حەنیفەی ئیمامی ئەعزەم و زانا سوننیەکانی تر، کە شا ئیسماعیل لە کاتی گرتنی بەغدادا تێکی دابون و ئێسک و پروسکی سوتاند بون، سەرلەنوێ ئاوا کردەوە. سلێمان بەردەوام زیارەتی ئەکردن، هەروەها چو بۆ زیارەتی نەجەف و کەربەلاش. (هامر: 1077)
هەر لە بەغداد کاروباری کوردستان، ئەوەی لە سەردەمی سوڵتان سەلیم دا دوای شەڕی چاڵدێران بە پێی ڕاوێژی حەکیم ئیدریس ڕێک خرا بون ئەم سەر لە نوێ ڕێکی خستنەوە. تێشکانی سەفەوی و زاڵ بونی دەسەڵاتی عوسمانی، هانی هەمو میرە کوردەکانی دا جگە لەوەی کە لە گەڵ لەشکردا هات بون، ئەوانی تریش بۆ دەربڕینی دڵسۆزی سەری سلێمانیان دا.
ئەم سەفەرەی سوڵتان بۆ هەندێ لە میر و سەردارەکانی کورد مایەی بەدبەختی بو. سلێمان لە بەغداد میر عیزەدینشێری میری سۆرانی کوشت (941 ک/ 1534 ز) و ناوچەی سۆرانی دا بە حسێن بەگی داسنی. (شەرەفنامە: 491) پاش ئەوەی لە ڕێگەی کوردستانەوە چوە تەورێز. (هامر: 1079) لەوێش بۆ ڕێکخستنی کاروباری ناوچەکە دو هەفتە مایەوە. لە تەورێزیش شەفقەت بەگی کوردی لە گەڵ 5 کەس لە خزمەکانی سەربڕی بە بیانوی ئەوەی لە گەڵ ئێرانیەکان سازشی کردوە. (هامر: 1081) بە دەم ڕێگایشەوە میرە بەگی مەحمودی و چەن کەسێکی کوشت لە سەر دانانەوەیان بە لای ئێران دا. (شەرەفنامە: 562)
سەفەری سوڵتان ساڵێک و نیو درێژەی کێشا لە 8 ی کانونی دوەمی 1539 ز/ 945 ک گەیشتەوە ئەستەموڵی پایتەخت.

## هێرشی دوەمی سوڵتان سلێمان

ئەلقاس میرزا برای شا تەهماسب حاکمی شیروان بو. بە هیوای سەربەخۆیی لە گەڵ هێزەکانی شا بو بە شەڕی. بە تێشکاوی لە دەشتی قبجاق و دەریای ڕەشەوە پەنای بۆ سوڵتان سلێمان برد. لە ئەستەموڵ پێشوازیەکی شاهانەی گەرمی لێ کرا. ئەلقاس ئەی ویست سوڵتان هان بدا بۆ پەلاماردانی ئێران کە لەو کاتەدا دوچاری گیروگرفتی ناوخۆ بو. سوڵتان یش ئەی ویست کەڵک لە ناکۆکی هەردو برا وەربگرێ بۆ لاوازکردنی ئێران (954).
ئولمە پاشا حاکمی بوسنە کرایە پێشکاری ئەلقاس میرزا و، حکومەتی ئەرزڕۆمی پێ سپێردرا. لە پێش ئەوە دا مەوکیبی سوڵتان بکەوێتە ڕێ. ئەمان ڕەوانەی مەملەکەتی ئێران کران. (هامر: 1189)

لە بەهاری ساڵی داهاتودا سلێمان بەنیازی پەلاماردانی ئێران کەوتە ڕێ. سوڵتان لە داماسیەوە چو بۆ ئەرزڕۆم و عاەلجەواز. لەوێوە ئولمە بێگلەربێگی ئەرزڕۆم و پیری پاشای بێگلەربێگی قارەمانی بۆ دابلوقەدانی وان رەوانە کرد. (هامر: 1189) عەلی سوڵتان کوڕی خەلیل سوڵتان شای پێشوی شیروان کە تەهماسب لە دەستی دەرهێنابو، پەنای بۆ سلێمان برد بو. سلێمان، عەلی سوڵتانی لە دەریای ڕەشەوە ڕەوانەی شیروان کردەوە بۆ ئەوەی ئەوێ داگیربکا. ئەلقاس میرزا لە گەڵ سوڵتان چونە سەر تەوریز و گرتیان. هەروەها پاش چەند ڕۆژێ شاری شیروانی گرت و، لەوێشەوە کەوتە ڕێ بۆ سەر شاری وان و ئەوێشی داگیر کرد و، بە دەفتەرداری پێشوی ئەناتۆلی چەرکەس ئەسکەندەر پاشای سپارد. ئینجا سوڵتان سپاکەی بۆ قشلاق و حەسانەوە ڕێگە دا.
هاوزەمان لە گەڵ هێرشەکەی سلێمان دا، لەشکری تەهماسب کەوتبوە تاڵان و کاولکردنی عاەلجەواز، موش و ئەخلات. هێزێکی عوسمانی کە ئەچون بۆ گرتنی قارس تێ شکان. سوڵتان ئەحمەد پاشای وەزیری سێیەمی لە نامەدەوە ڕاسپارد بەرەنگاری ئەم پشێوییە بکا. ئەویش چەرکەس عوسمان پاشای بە لەشکرێکەوە ناردە سەریان. ئەلقاس میرزاش ڕێگە درا بکەوێتە ڕێ بۆ تاڵانکردنی قوم، کاشان و ئەسفەهان. سوڵتان خۆیشی بۆ قشلاق چوە حەلەب. ئەسکەندەر پاشا، حاجی خانی دونبولی (کوردی) حاکمی خوی، کە سەر بە شای سەفەوی بو، کوشت و هێزەکەیشی پەرەوازە کرد. (هامر: 1191)

سوڵتان لە حەڵەبەوە کەوتە ڕێ لە فورات پەڕییەوە و، لە ئالمالو ئۆردوی خست. داوای ئامادە بونی ئەلقاس میرزای کرد. بەڵام ئەلقاس لە خۆی ترسا و هەڵات. (هامر: 1910) گەڕایەوە ناوچەی شارەزور. سورخاب بەگی حاکمی ئەردەڵان گرتی و تەسلیمی تەهماسبی برای کردەوە (956 ک) ئەویش لە قەڵای قەهقەهە دا زیندانیی کردو دوایی کوشتی.
لە مانگی سەپتەمبەردا سوڵتان لە ئەرزڕۆم ئۆردوی خست و لەوێوە ئەحمەد پاشای وەزیری دوەمی بۆ گرتنی گورجستان نارد. لە شەش هەفتەدا ئەحمەد توانی 20 قەڵا لە گورجستان بگرێ. لەوانە: تورتوم، نجاح، میرئاخور، ئاقچە قەلعە، بن کرد، ایسترتوت. چەن ڕۆژێ دوای ئەو فتوحاتە سوڵتان کەوتەوە ڕێ بۆ ئەستەموڵ. (هامر: 1191)

## هێرشی سێیەمی سلێمان (962 ک/ 1554 ز)

لە کاتێک دا هێزەکانی عوسمانی لە مەجەرستان خەریکی فتوحات بون، لە لای ڕۆژهەڵاتەوە کەوت بوە بەر مەترسی هێرشی ئێران. تەهماسب ئەی ویست لە ئەرجیش و عاەلجەواز و ئەخلات بمێنێتەوە. لە ئەرجیش ئەمیر ئیبراهیمی کوڕی کوژرا. ئەخلات بە فێڵ گیرا و کوشتاری بە کۆمەڵی تێ دا کرا. ئیسماعیل میرزا لە گەڵ چەند هەزار سوار قەڵاکەیان تەخت کرد، ڕوی کردە ئەرزڕۆم و کەوتە تاڵانی و ئەسکەندەر پاشای لە پۆسەیەک دا تێ شکاند. حاکمەکانی تەرابوزان و مەلاتیە و بوزوق قەرە حەسار لە مەیدانی جەنگ دا کوژران و، بەشێکی هێزەکەی بە دیل گیران. (هامر: 1210) سوڵتان سلێمان کەوتەوە سازدانی هێرشی ئێران. لەو کاتەدا توشی گیروگرفتی ناوخۆ بو بو لە گەڵ کوڕەکانی. وەختێ شای ئێران هەواڵی خۆ ئامادە کردنی عوسمانی بۆ پەلاماردانی ئێرانی زانی، شا محەمەد. سنجاجە بەگ و دو کەسی تری لەو ئاغایانەی لە شەڕەکەی ئەرزڕۆم دا بە دیل گیرابون، بەردا و نامەیەکی پێ دا ناردن بۆ سوڵتان تکای سوڵح و دۆستی لێ کرد. سوڵتان ئەیویست دەسبەجێ خواستەکەی شا قبوڵ بکا چونکە ترسی گیروگرفتی ناوخۆ. بە تایبەتی لە گەڵ کوڕەکانی، هەبو. (هامر: 1212)

سولتان، مستەفای کوری خنکاند. زستانی له حەڵەب به کاروباری بەرێوەبەرایەتی و چاککردنی کاروباری باج و سەرانەوە بە سەر برد. لە نیسانی ئەو ساڵە دا بە ئۆردووەوە لە حەڵەبەوە جوڵا. لە 15ی مایس دا لە ئامەد کۆبونەوەیەکی جەنگیی کرد. سولتان لەم کۆبونەوەیە دا وتی: "بۆ نەهێشتنی دوژمنانی دین و دەوڵەتی ئێمە کە ئێرانیەکانن، پێویستی کردوە دەس بدەینە چەک و بە لەشکری سەرکەوتن پیشەوە بچینە ناو مەملەکەتی ئەوانەوە. رەئی ئێوە لەم بابەتەوە چی بە چاک ئەزانن؟" ئامادەبوانی کۆڕەکە پیر و لاو کەوتنە فرمێسکرشتن و وتیان: "ئێمە بە پێی فەرمانی پادشا، ئەگەر حوکم بێ بۆ هیندوچین تا کێوی قاف ئەچین!"

سولتان لە روباری موراد، کە لقێکی فوراتە، پەرییەوە. لە ئەرزرۆمەوە کەوتە رێ بەرەو توپچاری بەرەو سوشەهری. ئەحمەد پاشای سەدری ئەعزەم و، عەلی پاشای خواجە وەزیری دوەم و، محەمەد پاشای سوکولی بەگلەربەگی رۆم ئێلی و، شازادە سولتان سەلیم، لە گەڵ لەشکری ئەناتۆلی کە لە ژێر فەرمانی ئەحمەد پاشای بەگلەربەگ دا بو، قشونی قەرامانی و ذولقدر و بەگەکانی تورکمان بە حەیدەر پاشا سپێردرا بون. ئەم هێزە گەورەیە بەرەو قارس کەوتە رێ. لەوێوە سلێمان راگەیاندنی جەنگی بۆ شا تەهماسب نارد. سولتان لەم راگەیاندنەدا نوسیبوی: "بە پێی فتوای موفتییان دەربارەی جەنگی ئەهلی بیدعەت و رافزییان، بەڵکو بۆ نەهێشتن و لە ناوبردنیان بە چەن لەشکرەوە کەوتۆتە جوڵان بە پێی فەرمانی حەزرەتی رەسول لە پێش بەکارهێنانی شمشێر و رم دا، ئیسلامەتییان ئەخەینە بەر. ئەگەر شا لە قبوڵکردنی دینی هەق سەرپێچی بکا ئەبێ وەکو بێ غیرەتەکان لە دەمی شمشێر رو وەرگێڕێ. ئێمەش بە پێی ئەسی قورئان شمشێرمان هەڵکێشاوە تا نیشانەکانی تورەبونی خۆمان دەربڕین" (هامر: 1218)

لە دوای راگەیاندنی جەنگ، ناوچەکانی ئیرەوان، ئەخچەوان، قەرەباغ، کاول کران. لە حوزەیرانی 1554 ز/ 962 ک لە چەمەنی ئارپا چای بارەگا خرا. رۆژی دواییتر لە کەناری روباری ئاراس دا لە قەرە حەسار قشونی قەرەمانی کەوتە بۆسەی هێزی ئێرانەوە.

ئێرانیەکان لە دەوری خۆیان لە دائیرەیەک دا بە هەر لایەکی دا بۆ ماوەی 5 رۆژەرێ ئاواییان نەهێشت بو. (هامر: 1218)

لە 6 ی ئاب دا سپاییەکی عوسمانی کە لای ئێرانیەکان ئەسیر بو گەیشتە قەڵای بایەزید. نامەیەکی لە تەهماسبەوە هێنا بو بۆ سلێمان. تێی دا نوسی بوی: "لە بەرامبەر ئەو کاولیە دا کە بەسەر ویلایەتەکانی ئێرانت دا هێناوە، وڵات و شوێن و مەمالیکی عوسمانی کاول و وێران ئەکەم. لە بەر ئەوەی کە لە بازوی خۆت دا هیچ هێزێکی تێ دا شک نابەی، خۆت لە زۆرانبازی پاڵەوانەکان و بەکارهێنانی شیر و رم ئەدزیتەوە، پشت بە هاویشتنی تۆپ و خاڵیکردنەوەی تفەنگ ئەبەستی. ئازایەتی و جوامێری خۆت لە تاڵانکردنی شتی خەڵک و سوتاندنی خانوی بێ ئەوایان دا ئەنوێنی، لە گەڵ هەمو ئەوانەیش دا: ئاشتی لە جەنگ و دۆستایەتی لە دوژمنایەتی باشترە." (هامر: 1219)

هاوزەمان لە گەڵ گەیشتنی ئەم نامەیەدا، هەواڵ گەیشت کە هێزەکانی عوسمانی شکستێکی سەختیان خواردوە و، بەگێکی گەورەی کوردیش گوم بوە. سەدری ئەعزەم ئەحمەد پاشا لە وەڵامی نامەکەی شادا کە ئەسیرێکی عوسمانی هێنابوی، نامەیەکی بۆ وەزیری شا نوسی: "هەمو ئەزانن کام لا لە ترسان لەرزی لێ هاتوە. ئێستا کە نێچیروان لە نێچیرگا گەڕاوەتەوە چەقەڵ وەکو شێری ئازا لە بێشەدا تەراتێن ئەکا. ولایەتەکانی مەمالیکی ئێران هێشتا لە سایەی مەنجەنیقەکانی عوسمانیەوە تیرە و تاریکە. ئەگەر ئێرانیەکان ئازان با لە دەشتەکان دا

ڕووبەڕووی عوسمانیەکان ببنەوە، ئەوانیش ئامادەن کە تۆپ و تفەنگ هەڵپەسێرن، بە شیر و نێزەوە بۆیان بچنە مەیدانەوە و، هێزی بازوی خۆیان دەربخەن." (هامر: 2: 1219)
لە وەڵامی نامەیەک دا کە وەزیری ئێرانی بۆ ئەیاس پاشای حاکمی ئەرزڕۆم نوسی بوی، وەزیری عوسمانی نامەیەکی تری بۆ وەزیری ئێرانی نوسی و، بە ئەسیرێکی ئێرانی دا ناردیەوە. ئێرانیەکان لەو نامەیەدا کە بۆ ئەیاس پاشایان نوسی بو، وایان دەرخست بو کە عوسمانی داوای ڕێککەوتنیان کردوە، لە بەرئەوە وەزیری عوسمانی نامەکەی بەم جۆرە وەڵام دایەوە: "ئەگەرچی دەوڵەتی عوسمانی لە بەستنی ئاشتی ڕو وەرناگێڕێ، بەڵام هیچ کات تکای ئاشتی لەوەوە دەستی پێ نەکردوە."
لە وەڵامی بەشێکی تری نامەی وەزیری ئێرانی دا کە دەربارەی ئایەتی: "من قتل مؤمنا متعمدا فجزائه جهنم خالدا" بو، نوسی بوی: "ئەم ئایەتە شەریفە سەبارەت بە کوشتنی موسوڵمانان و مومینان ئەم حوکمەی فەرموە، نەک دەربارەی ئێرانیەکان، کە لە بەرزایی مینبەرەکانی خۆیانەوە سەحابەی حەزرەتی ڕەسول و 3 خەلیفە لەعنەت ئەکەن. ئەگەر کەسانی وەها بێ دین نەبن، ئەی ئەبێ بێدینی بدرێتە پاڵ کام میللەت؟ دینی حەقیقی ئیسلام نۆ سەدو شەست ساڵە بەرقەرارە، بەڵام ئاینی ئەهلی بیدعەت و ڕافزیەکان پەنجا ساڵە برەوی پێ دراوە.
سەبارەت بە بێ ئیعتیباری دنیا و بێ دەوامی گەورەیی و سەڵتەنەت، پاشاهی ئێمە کە هەمیشە ئەوەی لە بەرچاوە، پێویستی بەوە نیە خەڵکی بیری بخەنەوە. بەڵام ئەوەی دەربارەی موسالەحە نوسرا بو، بابیعالی هەمیشە لە ڕوی دۆست و دوژمن دا کراوەتەوە. ئەگەر ئێرانیەکان لە ڕاستی دا ئەیانەوێ سوڵح بکرێ ئەبێ ئێلچیەکی خاوەن شانی شایستە بنێرن، تا ئەم کارە بە ئەنجام بگەیەنێ. خۆ ئەگەر خەیاڵی شتێکی تریان هەیە، ئەوا عوسمانیەکان لە سەر سنور ڕاوەستاون، ئەوسا هەر زیان و غەرامەتێ لە ڕەعیەت بدرێ گوناهی ئەکەوێتە ملی حوکمڕانەکانی ئەوان." (هامر: 21: 1220)
کاتێ لە پردی چوپان پەڕینەوە لە حەسەن قەلعە ئۆردوی خست. لەوێ سوڵتان بێگلەربێگەکانی دیاربەکر و وان لە گەڵ سەرۆکەکانی کوردی بە خەڵات سەربەرزکرد. هاوزەمان لە گەڵ ئەمەدا، هێزی عوسمانی لوڕستان و شارەزوری بە قەڵاکانیەوە زەوت کرد بو، بەگەکانی کورد چونە ژێر سایەی عوسمانیەوە. (هامر: 1221)
قولیخان قورچی قاجار، سەرکردەی قەراوڵانی تایبەتی شاهی لە 962 ک/ ئەیلولی 1554 ز دا بە نامە و پەیامی تەهماسبەوە گەیشتە ئەرزڕۆم و پێشوازیەکی شاهانەی لێ کرا. ئێلچی شا تکای ڕاگرتنی جەنگی لە سوڵتان کرد. سوڵتان تکاکەی گرت و وەزیرەکان وتیان: "تا لە لایەن ئێرانیەکانەوە پەیمان نەشکێ، لە لایەن عوسمانیەوە ڕێگەی جەنگ ناگیرێ." (هامر: 1221)
4 ڕۆژی دوایتر سوڵتان کەوتە ڕێ. دوای 20 ڕۆژ گەیشتە سیواس. دوای ئەوەش بە 12 ڕۆژ گەیشتە ئاماسیە. بۆ زستان لە ئاماسیە مایەوە. فەروخزاد بەگ ئیشێک ئاقاسی، لە لایەن شاوە کرابوە "وەزیری موختار" بۆ ئەنجامدانی گفتوگۆ. نامەیەکی درێژی لە شاوە بۆ سوڵتان هێنا بو سەبارەت بە ڕێککەوتنی هەردو دەوڵەت. پێشوازی شاهانە لە ئێلچی ئێران کرا. سوڵتان سلێمان وەڵامی شای دایەوە و بەڵێنی دایە؛ "تا ئێران پەیمانی ئاشتی نەشکێنێ، ئەوان پێڕەوی ئەکەن." (هامر: 1222)
لە سەردەمی شا ئیسماعیل و سوڵتان سەلیمەوە هیچ جۆرە ڕێککەوتن و ئاشتیەک لە نێوان ئێران و عوسمانی دا نەبوبو. ئەم چەند نامەیە بون بە بناغەی یەکەمین ڕێککەوتنی ئێرانی– عوسمانی و، بەم ڕێککەوتنە، کە لە مێژوی پێوەندیەکانی ئێرانی– عوسمانی دا بە ڕێککەوتننامەی ئاماسیە (ڕەجەبی 963 ک/ 29 ی مایسی 1555 ز) ناسراوە، جەنگی 20 ساڵەی نێوان ڕۆم و عەجەم تەواو بو.

ئەم ڕێککەوتنە کە "شەرعیبون" ی دەوڵەتی شیعەی ئێرانی سەلماند، ڕێکەوتی ئەو ڕۆژەی ئەکرد کە سوڵتان محەمەدی فاتیح ئەستەمولی گرت و. بناغەی فتوحاتی عوسمانی لە ئەوروپا دانا.

## پەیماننامە

## عەهدنامەی سوڵحی ئاماسیە (1555 ز/ 963 ک)

ئەم ڕێککەوتنە بریتیە لە نامە ئالوگۆڕکراوەکانی شا و سوڵتان و وەزیرەکانی هەردولا، کە لە بەڵگەیەکی یەکخراودا نە نوسراونەتەوە، بەڵام لە هەڵسەنگاندنی تێکڕای نامە و گفتوگۆی هەردولادا بەندە سەرەکیەکانی بریتیە لە:

1. بە لاداخستنی کێشەی ئەرزی

بە پێی تەرازوی هێزەکانی هەردولا. ئەرمەنستان و گورجستان و کوردستان لە بەینی هەردو دەوڵەتدا دابەش کران. ناوچە عەرەبنشینەکان بونە بەشی عوسمانی. قارس بە بێلایەنی بمێنێتەوە، قەڵاکەی بە کاولی بمێنێتەوە هیچ لایەکیان ئاوەدانی نەکەنەوە و هێزی لێ دانەنێن.

کاربەدەستانی سنورەکان نەهێڵن کێشەوبەرە دروست بێ.

2. بەلاداخستنی کێشەی مەزهبی

عوسمانی ڕێ بە زائیرانی ئێرانی بدا بچن بۆ زیارەتی شوێنە پیرۆزەکان و بۆ حەجی مەکە و مەدینە و، فەرمان بدا بە کاربەدەستانی خۆی لە گەڵ شیعە ڕەفتاری باش بکەن.

سەفەویش دەسهەڵبگرن لە لەعنەتکردنی سێ خەلیفەکە و عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر و ئیمامە خۆشەویستەکانی سونە.

3. بەلاداخستنی کێشەی سیاسی

داڵدەی شازادە و ئەمیرە راکردوەکانی یەکتری نەدەن، ئەگەر شازادە یا ئەمیریک لە لایەکەوە بۆ لاکەی تر هەڵات، بدرێتەوە دەست دەوڵەتەکەی خۆی.

**سەرچاوەکان**

هامر پورگشتال. تاریخ امپراطوری عثمانی. ترجمه میرزا زکی علی آبادی

شارەفنامەی هەژار

اصغر جعفر ولدانی. بررسی تاریخی اختلافات مرزی ایران و عراق. تهران: دفتر مطالعات سیاسی و بین المللی

دکتر منوچهر پارسادوست. ریشەهای تاریخی اختلافات عراق و ایران. چاپ سوم. شرکت سهامی انتشار. تهران 1367.

# بەشی دووەم: چەردەیەک لە ئەدەبی میزۆپۆتامیا

# پێشەکی

له ژیانی چەند ساڵەی شاخ دا چەند جارێ لە کاتی هەڵکەندنی بناغەی خانو بۆ بارەگا و سەنگەر لە هەندێ ناوچەی شاخاوی دا، کارکەرەکان چەند جارێ توشی گۆزە و خشت و ئێسکوپروسکی کۆن ئەبون، بەوپەڕی بێباکیەوە، گۆزەکانیان ئەشکان و، ئێسقانەکانیان فڕێ ئەدا. ئەگەر شتێکی بە نرخی تێدا بوایە، وەکو دراو، خشڵ، یا پەیکەر، هەڵی ئەگرت بۆ خۆی و، ئەوی تری تورِ ئەدا. ئەوانەی کارەکەیان ئەکرد:

کەسیان خۆیان بە خاوەنی ئەو شتانە نەئەزانی.

کەسیان ئەو ئێسقان و ئێسکوپروسکەیان بە هی باووباپیری خۆیان نەئەزانی.

کەسیان ئەو گۆزانەیان بە گۆڕ یا گەنجینەی کەلوپەلی گرانبەهای باوباپیری دانیشتوانی ناوچەکەی ئێستا نەئەزانی.

بەڵکو ئەو شوێنەوارەیان بە هی گەلێکی بێگانە ئەزانی.

لە بەر ئەوە بەرامبەر بەو شتانە کە چیرۆکی چەند ئەڵقەی گرنگی مێژوی ناوچەکە ئەگێڕنەوە بێ پەروا بون،

ئەشێ کورد گەلێکی بێ رابوردو بێ؟

ئەشێ کورد لە ئاسمانەوە هاتبێ نیشتەجێی ئەم سەرزەمینەی ئێستا بوبێ؟

ئەو ئێسقانە مرۆییانەی لە ئەشکەوتەکانی کوردستان دا دۆزراونەتەوە، کە ئەگەڕێنەوە بۆ هەزاران ساڵی پێش ئێستا، هی کێ بون؟

ئەو ئێسکانەی بەردەوام ئەدۆزرێنەوە هی کێن و ئەوە و وەچە و منداڵانی ئەوانە لە کوێن؟

کێ بون ئەوانەی گابەردەکانی بێستون، زینانەی هەورامان، پەیکوڵی، دەربەندی گاور، پیرەمەگرون، بێتواتە، سەرپولی زەهاو، بێلولە... یان ئەخشاندوە؟

کێ بون ئەوانەی هەزاران خشتی قوڕیان لە شمشارە و نوزی نوسیوە؟

کێ بون ئەوانەی قەڵای هەولێر و قەڵای کەرکوک و، گردەکانی دەشتی شارەزور و دەشتی بیتوێن و دەشتی هەولێریان دروست کردوە؟

تۆ بڵێی هەمو ئەو کێل و خشت و سواڵەتە نوسراوانەی لە کوردستان دۆزراونەتەوە و لێرە بە دواوەش ئەدۆزرێنەوە، هەر کێلی سەرکەوتنی داگیرکەران بن لە کوردستان دا چەقاندویانن و بۆ شکاندنی چاوی دانیشتوانی ناوچەکە بە جێیان هێشتون؟ وەکو هەندێ نوسەر هەمیشە ئەیڵێنەوە.
ئاخۆ کورد نەتەوەیەکی بێ رابوردوە؟
یان وەکو لە نیشتمانەکەی خۆی دا کراوە بە بێگانە، لە رابوردەکەیشی کراوە بە بێگانە؟

دەسەڵاتی داگیرکەر، کوردی توشی دەردی "لەخۆبێگانەبون" کردوە.
کوردی ئاسایی، خۆی بە خاوەنی شاخەکانی و دەشتەکانی، لێرەوار و ئاوەکانی، سامانی سەرزەوی و ژێرزەوی کوردستان نازانێ، لە نیشتمانەکەی خۆی دا خۆی بە بێگانە ئەزانێ، بۆیە گوێ نادات، پاکیی ژینگە و، پاراستنی ژینگە و سامانە سروشتیەکەی. گوێ نادات شوێنەوارە دێرینەکانی.

ساڵانی درێژی ژێردەستەیی هەستی "لەخۆبێگانەبون" ی لە لای کورد، چ وەکو تاک و چ وەکو کۆمەڵ خوڵقاندوە. وای کردوە کورد لە ناو دەرونی خۆی دا، لە ناو ئەو کۆمەڵەی تێیدا ئەژێ، لە ناو ئەو نیشتمانەدا کە تیا ئەژێ، خۆی بە بێگانە بزانێ. ئەم هەستە بە جۆرێکی بینراو لە بوارەکانی ژیان دا هەستی پێ ئەکرێ:
بگاتە هەر مەلێکی کێوی، بۆی بکرێ ئەیکوژێ
بگاتە هەر دەعبایەکی کێوی، گۆشتی بخورێ یا نەخورێ، بتوانێ ئەیکوژێ
بگاتە هەر گوڵ و گژوگیایەکی کێوی، دەستی بیگاتێ، هەڵی ئەکەنێ
بگاتە هەر دارودەوەنێ، بۆی بکرێ، لقەکانی ئەشکێنێتەوە و دارەکە ئەبڕێتەوە
بگاتە شوێنەواری دێرین، بێ لێکدانەوە تێکی ئەدا.

ئەگەرچی هەزاران خشت و بەردی نوسراو و نەخشێنراو لە کوردستان دۆزراونەتەوە و، هەزارانیش رەنگە هێشتا لە ژێر گڵ دا بن، بەڵام تا ئێستا لە هیچ ناوەندێکی زانستی: زانکۆکان، مۆزەخانەکان، وەزارەتەکانی رۆشنبیری، خوێندنی باڵا، پەروەردە، گەشتوگوزار... گرنگیەکی ئەوتۆ بەم بوارە نەدراوە، تا ئێستا کورد چەند پسپۆڕێکی خوێندنەوەی خەتی مێخی نیە و، تا ئێستا بە شێوەیەکی سیستەماتیک لە کوردستان کاری کنە و پشکنین و خوێندنەوەی شوێنەوارە نوسراو و پاشماوە نوسراوەکان نەکراوە. تا ئێستا "دێرینەوانی" نەکراوەتە بەرنامە.
شوێنەوارناسانی ئەوروپایی و ئەمەریکایی سەدان تێکستی کۆنی سۆمەری، ئاکەدی، بابلی، ئاشورییان ساخ کردۆتەوە و، لە زمانە ئەسلیە مردوەکەی خۆیەوە تەرجومەیان کردوە بۆ زمانە زیندوەکانی دنیا و، دەیان کتێب و لێکۆڵینەوەیان لە سەر نوسیون. لە ناو ئەوانەدا دەیان بابەتیان پێوەندییان لە گەڵ دانیشتوانی ئەو سەردەمەی کوردستان دا هەیە. بەڵام تا ئێستا وەکو پێویست سەرنجی لێکۆڵەری کوردیان رانەکێشاوە و، تا ئێستا لە ناو کوردا چەند پسپۆڕێ پەیدا نەبون شارەزای خوێندنەوەی خەتی مێخی بن و، بەشێ لە هەوڵەکانی خۆیان تەرخان بکەن بۆ خوێندنەوە و ساخکردنەوەی هیچ نەبێ بۆ ئەو نوسراوانەی لە کوردستان دۆزراونەتەوە.

کوردستان لایەکی زاگرۆسە و لایەکی میزۆپۆتامیایە، لە لایەکەوە کورد بەشدار بوە لە شارستانێتی ئەم دو دەڤەرەدا و، لە لایەکی ترەوە شارستانێتی ئەوانیش کاریان لەم کردوە، لە کاتێک دا کورد، کەم و زۆر، ئاگای لە

ئەدەبی زاگرۆس و ئێرانە. بە تایبەتی لە رێگەی زمانی فارسییەوە. کەمێکی زۆر کەم ئەبێ ئاگای لە ئەدەبی میزۆپۆتامیا نیە. لە کاتێک دا ئەدەبی میزۆپۆتامیا لە چاو ئەدەبی دێرینی گەلێ ناوچەی تردا دەوڵەمەن ترە. بە تایبەتی ئەم لە سەر قوڕی سورەوەکراو نوسراوەتەوە و. هۆی مانەوەی بەهێزتر بوە لە چاو گەڵا و کاغەز و چەرم و تەختە... ئەشێ ئەدەبی میزۆپۆتامیا. زۆر جار یا هەندێ جار. یاریدەر بێ بۆ ئەوانەی لێکۆڵینەوە لە لایەنە جیاوازەکانی بواری کۆمەڵایەتی دا ئەکەن بۆ ئەوەی بتوانن رەگی هەندێ لەو نەریت و بیروباوەڕە باوانەی لە ناو کۆمەڵی کوردا هەبون یا هەن لە ناو باوەڕەکانی ئەو سەردەمەدا بدۆزنەوە.

زاناکانی شوێنەوارناسی. بە تایبەتی زاناکانی جو. بایەخێکی زۆریان داوە بە شارستانێتی میزۆپۆتامیا و هەوڵێکی زۆریان داوە بۆ گونجاندنی روداوەکان و ئەفسانەکانی ناوچەکە لە گەڵ گێڕانەوەکانی تەورات دا. رەنگە ئەمە مەلامەتی دینیی هەبوبێ.
هاوشانی ئەوان. زاناکانی شوێنەوارناسی. بە تایبەتی زاناکانی عەرەب. بایەخێکی زۆریان داوە بە بەشی خواروی میزۆپۆتامیا و هەوڵێکی زۆریان داوە بۆ سەلماندنی سامی بونی رەگەزی ئاکەدی و بابلی و ئاشوری. بەشی سەروی ناوچەکە، کە مەڵبەندی ژیانی کورد بوە. پشتگوێ خراوە. رەنگە ئەمەش مەلامەتی سیاسیی هەبوبێ.

کوردستانی عیراق. لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی بیستەمەوە، کە خراوەتە سەر عیراق. هەرگیز ئارامیەکی دریژخایانی بە خۆیەوە نەدیوە. هەمیشە مەڵبەندی شۆڕشی چەکدار بوە. کاری ئارکیۆلۆجی کە پێویستی بە پشودرێژیە. بێ هەلومەرجی ئارام و بێ ئاسایشی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەنجام نادرێ. ئێستا لە کوردستان دا چەندین زانکۆ و. چەندین مۆزەخانە و. چەندین دەزگای رۆشنبیری تێ دایە. ئەتوانێ ببێتە یەکێ لە ناوەندە گرنگەکانی لێکۆڵینەوە و پشکنینی شوێنەوارناسی و. سەرەتای لێکۆڵینەوەیەکی سیستەماتیک دەس پێ بکا لە سەر گەلانی زاگرۆس و گەلانی ناوچەکانی دەوروبەری سەرچاوەکانی روباری دیجلە و روباری فورات و چەمەکانیان و. شارستانێتی و دەوریان لە روداوەکانی ناوچەکە و. لە پێکهێنانی نەتەوەی کوردا. لە باتی ئەوەی مێژونوس و توێژەری کورد تیۆریەکانی زاناکانی بێگانە دوبارە بکەنەوە. خۆیان ببنە خاوەنی قوتابخانەیەکی تایبەتی شوێنەوارناسیی کوردستانی. زاناکانی بێگانە پشت بە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی ئەوان ببەستن.

ئەوەی لێرەدا من کردومە. وەرگێڕانی تێکستی چەند لاوژە و بالۆرەیە. هەندێکی لە عەرەبی و هەندێکی لە ئینگلیزیەوە. ئەگەر یەکێ بە لایەوە سەیر بێ و بپرسێ من مەبەستم لەم کارە چی بوە؟
ئەڵێم مەبەستم ئەوەیە: سەرنجی کورد. بە تایبەتی زانا ئاکادیمیەکانی. رابکێشم بۆ گەنجینەی دەوڵەمەندی ئەو کەلەپورە زۆرەی میزۆپۆتامیا کە بەشێکی هی خۆیەتی و. بەشێکی پەیوەندی بە مێژوی رابوردی ئەوەوە هەیە. پاشماوە و شوێنەوارە دێرینەکانی لە ناوچە شاخاویە سەختەکانی کوردستان دا دۆزراونەتەوە. زیاتر لەوەی نیشانەی پەیوەندی "داگیرکەر" و "داگیرکراو" بێ. نیشانەی پەیوەندی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی نێوان گەلەکانی دانیشتوی کوردستان و گەلەکانی سومەری و ئاکەدی و بابلی و ئاشوریە.

# زمانی گێڕانەوەی لاوژەکان

**یەکەم،**

لەم بەشەی گوڵچنینەکان دا، کە وەرگێڕانی چەرنەیەکە لە ئەدەبی میزۆپۆتامیا، زمان و وشەگەلێکم بە کار هێناوە ڕەنگە بۆ هەندێ کەس جێگەی پرسیار بێ. هەوڵم داوە ژمارەیەک لەو وشانەی لە زمانی نوسینی ئێستادا بەکار ناهێنرێن یا کەمتر بە کار ئەهێنرێن و خەریکە لە بیر ئەچنەوە، جارێکی تر بهێنمەوە ناو کایەی نوسین، ڕەنگە پێشکەوتنی ژیان و گۆڕان و گەشەکردنی کۆمەڵی کوردی و وڵاتەکەی، ئاخاوتنی ڕۆژانەی خەڵک، پێویستی بە هەندێ لەم وشانە نەمابێ، بەڵام ئەشێ هەندێکیان بە زیندویەتی بهێڵرێنەوە و، مەعنای تازەیان پێ ببەخشرێ.

**دوەم،**

هەندێ وشە لێرەدا بۆ یەکەم جارە بەو مەعنایە بە کار هێنرابێ.

لە ئەدەبی گەلان بۆ هەر بابەتێ، زارەکی یا نوسراو، ناوێکی تایبەتی لێ نراوە. ملحمة، اسطورة، قصة، خرافة، هەر یەکە ناوێکی تایبەتییان هەیە. لە ئەدەبی کوردی دا ئەمە هێشتا نەچەسپیوە.

"ملحمة"، کە لە ئەدەبی گەلان دا جێگەیەکی تایبەتی هەیە و، تا ئێستاش وەکو بەشێ لە کەلەپوری شارستانی خۆیان، هەمیشە بە شێوەی جۆراوجۆر، زیندوی ئەکەنەوە، لە زمانی کوردیش دا "ملحمة" گرنگیەکی تایبەتی هەبوە، ڕەنگە پێش کورد خۆی ڕۆژهەڵاتناسەکان بایەخیان بەم بابەتە دابێ و، کۆیان کردۆتەوە، لێکۆڵینەوەی زمانەوانی، کۆمەڵایەتی... یان لە سەر کردوە. لەو بوارەدا: ئۆسکارمان، باسیل نیکیتین، مینورسکی... ڕەنجی زۆریان داوە.

لە زمانی کوردی دا بۆ ئەم بابەتە ئەدەبیە چەندین ناوی هەیە، لەوانە: لاوک، لاوژە، بەیت، حەیران...

ئۆسکارمان، لە کتێبەکەی دا: "توحفەی موزەففەریە" کە بە ئەڵمانی نوسیوێتی، چەندین بابەتی کۆکردۆتەوە. لە کۆکردنەوەی ئەم بابەتە فۆلکلۆریە ئەدەبییانەدا، کە هێمنی موکریانی هێناونیەتیەوە سەر ڕێنوسی تازەی کوردی، ناوی "بەیت" ی بۆ داناون. دیارە لەو سەردەمەدا لە موکریان هەر بەو ناوەوە ناسراون.

باسیل نیکیتین، لە کتێبەکەی دا: "کورد: لێکۆڵینەوەیەکی سوسیۆلۆجی و مێژویی"، کە بە فەرەنسی نوسیوێتی لە گێڕانەوەی ئەم چەشنە بابەتە دا، وشەی "لاوژە" ی بە کار هێناوە. محەمەدی قازی لە وەرگێڕانە فارسیەکەی دا هەمان وشەی "لاوژە" ی هێشتۆتەوە، بەڵام د. نوری تاڵەبانی لە تەرجومە عەرەبیەکەی دا لە باتی وشەی "لاوژە" وشەی "لاوک" ی بە کار هێناوە.

ئەشێ هەریەکەیان لە ناوچەی خۆی دا هەمان مەبەست بگەیەنێ یا مەبەستێکی نزیکی بگەیەنێ، بەڵام کاتی ئەوە هاتوە ئەم وشانە: داستان، سەرگروشتە، بەیت، بالۆرە، لاوک، حەیران، سود، ستران، ئەفسانە و لاوژە... ئیتر هەریەکەیان وەکو زاراوە تەرخان بکرێ بۆ چەشنێکی دیاریکراو لە ئەدەبی زارەکی و نوسراو، بۆ جۆرێکی دیاریکراو لە گێڕانەوەی بابەت. لێرەدا بە پێی هەڵسەنگاندنێ کە بۆ دەقەکانی ئەدەبی سومەری کراوە، بە باشتر زانراوە بەرامبەر وشەی "ملحمة" وشەی "لاوژە" بە کار بهێنرێ.

لاوژە: ملحمة. گێڕانەوەی بە سەرهاتی ڕاستەقینە و هەڵبەستراوی دڵداری و قارەمانێتی شەڕوشۆڕ و ئەفسانەی پەری و دێو و درنج و خێو بە شیعر و پەخشان. لە بەرامبەر وشەی "epic" ی ئینگلیزی و، "ملحمة" ی عەرەبی و، "حماسە" ی فارسی دا، بە کار هێنراوە.

گەرە لاوژە، کە هەندێ جار بۆ نیشاندانی پەشێوانی کارکرین بە کار دەهێنرێ، لە ئەسڵدا لە دیوەخانەکان دا کە لاوژە بە دەنگەوە وتراوە، هەندێ جار بەشدارانی کۆڕەکە بە سەرە یەک بە دوای یەک دا تەواویان کردوە، لاوژەکە بە ریز بە سەریان دا گەڕاوە.

هەر لەو بوارەدا هەوڵم داوە چەند وشەیەک بە مەعنای نوێ تێهەڵکێشی بابەتەکە بکەم لەوانە:

چکاوە: خلاصة.

تێوەردان: مداخلة.

تێچاندن: تعليق.

**سێیەم،**

لە زمانی نوسینی کوردیی ئێستادا نیشانەیەک نیە بۆ جیاکردنەوەی ناوی مێ لە نێر، رەنگە ئەمە بە پێشکەوتنێکی کۆمەڵایەتی دابنرێ بە ئاراستەی یەکسانی نێر و مێ. بەڵام هەندێ جار پێویستی بابەتەکە ئەم هەڵاواردنە ئەخوازێ، ئەگینا تێکەڵاوی لە تێگەیشتنی بابەتەکەدا دروست ئەبێ. بۆیە هەوڵم داوە هەندێ وشەی نوێ لە سەر بنچینەی وشە کۆنەکان دابرێژم.

لە سەردەمی سومەری و ئاکادی و بابلی و ئاشوری دا، هەروەها لە یۆنانی کۆن دا، هێشتا دینی یەکخوایی (جو، کریستیان، ئیسلام) نەبوە، باوەڕیان بە فرەخوایی هەبوە، چەندین خوایان پەرستوە، بۆ هەر دیاردەیەکی سروشتی خوایەکیان داناوە، بە پێی تێگەیشتنی خۆیان وێنایان کردوە و "بت" یان لێ دروست کردوە. خواکانی ئەوان هەندێکیان نێر "اله" و هەندێکیان مێ "الهة" بون، هەندێ کەس و هەندێ شاخ و هەندێ روبار و هەندێ گیانداریان "تأليه" کردوە و، پەرستویانە. لە زمانی کوردی دا، نە لە نوسین دا و نە لە گێڕانەوەی زارەکی دا، ئەم ئاڵۆزیە چارە نەکراوە لێرەدا هەوڵ دراوە چارە بکرێ:

خوا: لە بەرامبەر "اله" ی عەرەبی و "God" ی ئینگلیزی، بۆ پەرستراوی نێر.

ماخوا: لە بەرامبەر "الهة" ی عەرەبی و "Goddess" ی ئینگلیزی، بۆ پەرستراوی مێ. خوای مێیینە. بە هەمان ریسا: ماخێو: خێوی مێیینە، مادێو: دێوی مێینە، ماجنۆکە: جنۆکەی مێیینە... وەکو مامان، ماکەو، مامر، مامز، مانگا، ماین..

خوایاندن: لە بەرامبەر "تألية" ی عەرەبی و "To Deify" ی ئینگلیزی.

**چوارەم،**

هەمو ئەو وشانەی لەم بابەتانەدا بەکارم هێناون، ئەگەر بۆ هەندێ خوێنەر نەناسراو، یا نەبیستراو، یا ناناشنا، بوبن، لە کۆتایی بابەتەکەدا هەوڵم داوە بە رونی بە ناسینیان بدەم. بۆ ئەوەی بچمە بنجوبناوانی وشەکەش فەرهەنگەکانی: شێخ محەمەدی خاڵ، مەعروف قەرەداخی، گیوی موکریانی، هەژاری موکریانیم پشکنیوە و، ئەگەر لە وێ دا نەدۆزرابنەوە لە خەڵکی پەیوەندیداری ناوچەکانیم پرسیوە.

**پەراوێز:**

واسیلی نیکیتین، کرد و کردستان: بررسی از نظر جامعه‌شناسی و تاریخی، ترجمة محمد قاضی، انتشارات نیلوفر، چاپ دوم زمستان 1366، ص 538 _ 569.

باسیلی نیکیتین، الکرد: دراسه سوسیولوجیه وتاریخیه، نقله من الفرنسیة وعلق علیه: الدکتور نوری طالبانی، دار الساقی، بیروت 2001، ص 398_ 432.

# "دەوڵەتی شار" ی سومەری
# "دەوڵەتی وڵات" ی ئاکەدی

## سومەر و "دەوڵەتی شار"

لە ناوچەی میزۆپۆتامیادا، بە تایبەتی لە جەبەل حەمرینەوە بەرەو خوار، ڕێژەی باران کەمترە لەوەی بۆ کشتوکاڵ پێویستە، هەروەها کانیی سروشتی لێ هەڵناقوڵێ تا ببێتە سەرچاوەی ئاودانی کێڵگە و ڕەز و باخ، تەنانەت ئاوخواردنەوەی مرۆڤ و ئاژەڵ. بۆیە کشتوکاڵ و ئاژەڵداری ئەبو پشت بە ئاوی ڕوبار ببەستێ و، ڕاستیەکەشی ئەوەیە هەم زەویوزاری تەختی بەپیتی فراوانی هەبوە و هەم ئاوی سازگاری ڕوبارەکانی مشە بوە. بەڵام بەکارهێنانی ئاوی ڕوبار بۆ هەڵبەستنی بناوان و بەنداو و ئەستێل، هەڵکەندنی جۆگە و ڕوبار و بیر، پێویستی بە کاری بە کۆمەڵ هەبوە، کە بە یەک کەس بە تەنیا و بە یەک خێزان بە تەنیا نەکراوە، بۆیە پێویستی بە کاری بە کۆمەڵی چەند کەس و چەند خێزان هەبوە. ئەمەش پێویستی بە "دەسەلاتێکی ناوەندیی بەهێز و ستەمکار" هەبوە، کە هێزی کاری بۆ ساز بدا و نەخشەی بۆ دابنێ و ڕێکی بخا و جێبەجێی بکا. بەمجۆرە لە پرۆسەیەکی درێژخانی گوێزانەوە لە قۆناغی "گلێرە و ڕاو" بۆ قۆناغی نیشتەجێبونی کاتی یا هەمیشەیی و، فێربونی چاندنی کشتوکاڵ و ڕاهێنانی ئاژەڵ و ڕاوەماسی، دروستکردنی نوا و ئاوایی. لادێی بچوک بۆتە دێ، دێ گەورە بوە بۆتە گوند، گوند فراوان بوە بۆتە شارەدێ، شارەدێ پەرەی سەندوە بۆتە شار و، لە ناوەڕاستی چوارەمین هەزارەی پێش زاینەوە شار بەهێز بوە بۆتە ناوەندی بەڕێوەبردن و پێکەوەبەستنی کۆمەڵێ لادێ و دێ و گوندی چوار دەوری خۆی. ئەمەش بۆتە ناوکی دامەزراندنی "دەوڵەتی شار"، کە یەکێکە لە گرنگترین نیشانەکانی شارستانێتی سومەری و، لە هەمان کات دا ژینگەی لە دایکبونی شارستانێتیەکی گەورەی مێژوی مرۆڤایەتی.

یەکێ لە گرنگترین داهێنانەکانی شارستانێتی سومەر، خەتی مێخی و مۆری لولەییە. کە بە یەکەمین هەوڵی مرۆڤ دادەنرێ بۆ وێناکردنی بیر و بۆچونەکانی بە نیگار و نوسین. نوسینەکان لە سەر خشتی قوڕ

نوسراون و له ئاگردا سورکراونەتەوه. بەوجۆره راددەی مانەوەیان بە زیندویەتی لە چاو نوسینی سەر چەرم و تەختە و ئێسقان و گەڵا و کاغەز زیاتر بوە، هەر بەو هۆیەوە سەدان بەرهەمی ئەدەبی و بەڵگەی کارگێری و دارایی و قانونی و بازرگانی و نامە تا ئەمرۆ بە ئەمری ماونەتەوه. ئەو خشت و سواڵەتە نوسراوانەی تا ئێستا دۆزراونەتەوە و، لە مۆزەخانە جیاوازەکانی دنیادا هەڵگیراون، سەدان هەزار، بگرە هەندێ شوێنەوارناس بە نزیکەی یەک ملیۆن ئەیخەمڵێنن. لەوە نزیکەی چوار هەزاری بابەتی ئەدەبی – ئەفسانە، چیرۆک، داستان، بالۆره و لاوژە و لاواندنەوەن. ئەمە سەرەرای ئەوەی رەنگە هێشتا هەزاران سواڵەتی تر مابێ لە ژێر گڵدا، کە لەوانەیە لە داینەدا بدۆزرێنەوه. (باقر، مقدمة في ادب العراق القديم، ل 49)

لەو سەردەمەدا، وەکو کنە و پشکنینی ئارکیۆلۆجی و خوێندنەوەی دەقە نوسراوە مێخیەکان دەریان خستوە، لە سەرزەمینی سومەردا چەندین "دەوڵەت شار" هەبون، لەوانە: ئور، ئوما، ئوروک، ئاریدو، کیش، لەگەش، نیپور، سیپار....

دەوڵەتی شار قەوارەیەکی سیاسی– دینیی بوە و، هەریەکەیان خۆی سەربەخۆ بوە لە شارەکانی تر. یەک پایتەختی گشتی و یەک خوای پەرستراوی گشتی یان نەبوە کە فەرمانرەوای هەمو وڵاتی سومەر بوبێ ، بەڵکو هەر دەوڵەت – شارێ فەرمانرەوای خۆی و پایتەختی تایبەتی خۆی و، خوای تایبەتی خۆی و، پەرستگای تایبەتی خۆی هەبوە.

شاری ئەو سەردەمەی سەرزەمینی سومەر، پێکهاتوە لە سێ بەش:

**بەشی یەکەم،**

ناوجەرگەی شار، کە شورەی پاراستنی هەبوە، کۆشکی فەرمانرەوای شار و پەرستگای سەرەکی و خانوی کارمەند و فەرمانبەرەکانی و، پیشەکارەکانی لە بابەتی نوسەر، پەیکەرساز، مۆرهەڵکەن، گۆزەکار، ئاسنگەر، بەلەمساز، دارتاش، جۆڵای تێدا بوە. زۆری کاروباری شارەکە و ساتوسەودا لە بەر دەروازەکانی دا ئەنجام دراوە.

گەورەی دەوڵەتی شار، کە لە هەندێ شار پێی وتراوە "لو گال" و لە هەندێ شار "ئین سی"، خۆی بە شوانی هەڵبژێردراوی خوا و راسپێردراوی ئەو داناوە، لە بری ئەو فەرمانرەوایی کردوە و، وڵاتی بەرێوە بردوە. پێشەوای دینیی پەرستگا و خاوەنی دارایی وڵات و فەرماندەی کاروباری جەنگی و سەرۆکی دەزگای داوەری بوە. لە بەر ئەوە تەنیا لە بەردەم خوادا بەرپرس بوە.

کاروباری دینیی و کاروباری دەوڵەتداری: کارگێری، دارایی، بازرگانی، تێکەڵاو بوە. باوەریان وابوە کە ئەو خوایە شارەکەیان ئەپارێزێ و ئەو خوایە ئەتوانێ پشتیان بگرێ و پشتیان بەر بدا.

پەرستگا جگە لەوەی خۆی زەوی فراوانی کشتوکاڵ و لەوەرگای هەبوە، سەرپەرشتی هەندێ پیشە و کاری دارایی و بازرگانی کردوە، هەزاران کەس لە کێڵگە و داوودەزگا پیشەییەکانی دا کاریان کردوە.

**بەشی دوەم،**

لاێکانی شار، کە پەرستگای تایبەت بە جەژنی سەری ساڵ و خانوی جوتیارەکان، تەویلە و گەور، باخی دارخورما، کێڵگەی دانەوێڵە، لەوەرگای تێدا بوە. دانیشتوانی شارەکە بۆ دابینکردنی خۆراک پشتی بەم ناوچەیە بەستوه.

**بەشی سێیەم،**

شارەکان، لە کەناری روباری دیجلە و فورات و جۆگەکانی دا بنیات نراون. لەنگەرگاکەی سەرەرای ئەوەی بەندەری بارکردن و داگرتنی بەلەم بوە، ناوەندی ئاڵوگۆری کەلوپەلی بازرگانی، بە تایبەتی بازرگانیی دەرەکی، بوە. خان و عەمار و میوانخانەی تێدا بوە.

پانتایی شارەکان و سنوری قەڵەمرەویان و ژمارەی دانیشتوانیان وەکو یەک نەبون، بەڵکو جیاواز بون. هەندێکیان لە هەندێکیان گەورەتر بون و، هەندێکیان لە یەک نزیک و هەندێکیان لە یەک دور بون. بۆ نمونە هەندێ شارەزا پانتایی شاری لەگەش، کە یەکێ لە شارە گەورەکان بوە، بە 3 هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشە و دانیشتوانەکەی بە 30 – 35 هەزار کەس خەملاندوە.

شارستانێتی میزۆپۆتامیا، بە تایبەتی سومەری، لە سێ کەرەستەی بومی سودی وەرگرتوە:

لە قوڕ و لیتەی لێواری روبارەکان، دەفری جۆراوجۆری پێویستی ناوماڵ دروست کراوە، وەکو گڵێنە، گۆزە، خشت بۆ بینا، تۆماری بەڵگە و نوسینەوەی بەرهەمی بیر.

لە بەرهەمی ئاژەڵ، پێستە بۆ دەفری جۆراوجۆری مەشکە، هەمانە، هیزە، کوندە و، خوری و مو بۆ جلوبەرگ و گوریس و تۆڕ، شاخ بۆ دەسکی چەک و ئامرازی مۆسیقا و خواردنەوەی شلە.

لە کشتوکاڵ، جگە لە خواردن، کەڵکیان لە حەسیر و قامیش و زەل و گوش و توڵی دار، وەرگرتوە، سەبەتە و رایەخ و قەفەز و چیغ و تەیمان و پەرژینیان لێ دروست کردوە.

بەڵام ئەو ناوچەیە لە روی سامانی سروشتیی بەرد و تەختە و مەعدەنەوە هەژار بوە. بۆ بەدەستهێنانی هەر یەکێ لەم کەرەستانە پێویستیان بە دامەزراندنی تۆڕێکی فراوانی بازرگانیی دەرەکی بوە. ناوچەکەش لە لای رۆژهەڵات و سەروی رۆژهەڵاتیەوە بە زنجیرەی چیاکانی زاگرۆس و لە رۆژئاوایەوە بە بیابانی شام و جەزیرەی عەرەبی و لە لای خوارویەوە بە ئاوی خەلیج دەوری گیراوە. رێگاکانی رۆژهەڵات و سەروی رۆژهەڵاتی کە بە ناو دەربەند و تەنگە و گەروەکانی چیاکانی زاگرۆس دا تێپەڕیون بریتی بون لە:

رێگەی بەدرە بەرەو سوسە لە عیلام.

رێگەی خانەقین بەرەو کرماشان.

رێگەی هەڵەبجە بەرەو هەمەدان.

رێگەی قەڵادزە کە گومان ئەکرێ پاشای ئاشوری سەرجۆنی دوەم (721- 705 پ ز) لە هەشتەمین لەشکرکێشی دا کە چۆتە سەر ئەرمەنستان و ئازەربایجان گرتبێتی.

رێگەی دەربەندی رایات بەرەو دەریاچەی ورمێ و ئازەربایجان.

رێگەی کێلەشین بەرەو ئازەربایجان.

رێگەی زاخۆ بەرەو ئەرمەنستان.

ئەم رێگایانە هەموی بە ناو سەرزەمینی ئێستای کوردستانی عیراق دا تێپەڕیون و بە ناو گەلانی نیشتەجێی زاگرۆس دا رۆیشتون کە لولوبی و گوتی و سوباری... لە گەلە بەهێزەکانی بون و، ئەشێ بە رەگەزە سەرەکیەکانی پێکهێنانی نەتەوەی کوردی ئێستا دابنرێن. بۆیە شتێکی ئاساییە پەیوەندی و تێکەڵاوی، کارلەیەککردن و، شارستانێتی هاوبەش لە بەینیان دا دروست ببێ و، شوێنەواری دێرینە بە زمانەکانی سومەری، ئاکەدی، بابلی، ئاشوری، لە کوردستان، بە ژمارەی زۆر، هەبوبێ و بدۆزرێتەوە.

بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی دەوڵەت شاری سومەری بڕوانە:
صموئیل نوح كرامر، السومريون. ترجمة الدكتور فيصل الوائلي، الكويت. . ل 101 – 146.
طه باقر، مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، دار الوراق، بيروت، 2009. ل 360 – 381.
جورج رو، العراق القديم، ترجمة وتعليق حسين علوان حسين، وزارة الثقافة والاعلام، بغداد، 1986. ل 181 – 198.
الدكتور خليل سعيد، معالم من حضارة وادي الرافدين، دار البيضاء، 1948. ل 63 – 64.
ئینسكلۆپیدیا بریتانیكا، ب 11. ل 969 - 971.

## ئاكەد و "دەوڵەتی وڵات"

"لوگال زاگی زی" گەورەی شاری ئوما، شارەكانی تری سومەری بە شەڕ هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. بنچینەی "دەوڵەتی شار" ی سومەری هەڵتەكاند و "دەوڵەتی وڵات" ی دامەزراند. وەركای كردە پایتەختی دەوڵەتەكەی. ئەم گۆڕانە سەرەتای كۆتایی بو بە قۆناغی دەوڵەتی شار و دامەزراندنی دەوڵەتی ناوەندیی فراوان.

لە بالۆرەیەكی بەجێماودا كە هەندێ لەم روداوانە ئەگێڕێتەوە، ئەڵێ:

"كاتێ ئینلیل، شای گشت وڵاتان، پاشایەتی وڵاتی بە لوگال زاگی زی سپارد، سەرنجی دانیشتوانی وڵاتی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە بۆ ڕاكێشا، خەڵك هەموی سەریان بۆ دانەواند.......

لەو ڕۆژگارەدا وەركا ڕۆژەكانی بە خۆشی ڕائەبوارد،
ئور وەكو گا سەری بۆ ئاسمان هەڵ ئەبڕی،
لارسا، شارە خۆشەویستەكەی ئوتو، هاواری شادیی ئەكرد
ئوما، شارە خۆشەویستەكەی شارا باسكی بەرز ئەكردەوە
زابلام، دیوارەكانی، وەكو مەڕێ بەرخەكەی هاتبێتەوە، ئەپاڕاند
شاری دێر گەردنی بەرزكردەوە بۆ ئاسمان".... (وائلي، ل 464.)

لوگال زاگی زی لە زنجیرەی شەڕەكانی دا هێرشی كردۆتە سەر شاری كیش. لوگال زاگی زی لەم لەشكركێشیەدا ئور زبابای شكاندوە. سەرجۆن، كە پێشتر فەرمانبەر بوە لای ئور زبابا، ئەم دەرفەتەی بە هەل زانیوە، خۆی سازداوە، لە هەڵمەتێكی كتوپڕدا بۆ سەر شاری وەركا، پایتەختی لوگال زاگی زی، داگیری كردوە، خەڵكەكەی هەڵاتون، شورەی شارەكەیانی روخاندوە.

خەڵكی ڕاكردوی وەركا، لایەنگرانی لوگال زاگی زی، بە یارمەتی پەنجا كەس لە میر و سەردارەكانی ناوچەكە هێرشی پێچەوانەیان كردۆتە سەر سەرجۆن. سەرجۆن ئەم هێزەشی شكاندوە و لوگال زاگی زیی بە دیل گرتوە و ئیری تەختەی كردۆتە ملی، بە ڕیسوایی بردویەتی بۆ بەر دەروازەی "نیپور: نفر".

## سەرجۆن (2370 – 2316 پ. ز) كێ بوە؟

بەر لەوەی سەرجۆن دەس بە سەر مەڵبەندی سومەردا بگرێ، وەكو ئەفسانەكانی ئەو زەمانە ئەیگێڕنەوە، لە كۆشكەكەی ئور زبابا دا، لە شاری كیش، كاسەهەڵگر، واتە مەیگێڕی تایبەتی ئەو بوە. (بڕوانە: بالۆرەی سەرجۆن)

سەرجۆن ئیتر کەوتۆتە لەشکرکێشی، پەلاماری شاری "ئور" ی داوە، ئینجا هێرشی کردۆتە سەر شاری "لەگەش" و گرتویەتی. هەڵی کوتاوەتە سەر شاری "ئوما" و گرتویەتی. درێژەی بە هێرشەکانی داوە تا گەیشتۆتە سەر دەریا، بۆ دەربڕینی سەرکەوتنەکانی لە ئاهەنگێک دا، کە بۆ ئەو بۆنەیە رێکی خستوە، چەکەکەی لە ئاوی دەریادا شۆریوە.

لە بالۆرەیەک دا کە بۆ هەندێ لەم روداوانە دانراوە ئەڵێ:

"سەرجۆن شای ئاکەد، مشکیم، ئینانا، شای کیش، کاهینی جودی خوا ئان، شای وڵات، ئینسی ئینلیلی مەزن، شاری وەرکای کاول کرد و شورەکانی روخاند، لە گەڵ پیاوەکانی وەرکا جەنگی و شکاندنی، لە گەڵ لوگال زاگی زی، شای وەرکا جەنگی و دیلی کرد و نیری کردە ملی و هێنایە بەر دەروازەی ئینلیل.

سەرجۆن، شای ئاکەد، لە گەڵ پیاوانی ئور جەنگی و شکاندنی، شارەکەی وێران کردن و شورەکانی روخاند.

پەلاماری ئی نینماری دا و شورەکانی روخاند، سەرزەمینەکەی لە لەگەشەوە تا سەر دەریا وێران کرد و، چەکەکەی لە دەریادا شۆرد.

لە گەڵ پیاوانی ئوما جەنگی و شکاندنی، شارەکەی وێران کردن و شورەکانی روخاند.

ئینلیل هیچ مێملێکی بۆ سەرجۆن دانەنا، ئینلیل، بە راستی، هەمو ناوچەکانی کە لە دەریای ژورەوە بۆ دەریای ژێرو درێژ ئەبێتەوە پێ بەخشی.

ئاکەدیەکان لە هەمو جێیەک هەر لە دەریای ژێروەوە تا دەریای ژورو دەستیان گرت بە سەر ئینسیەکان دا.

پیاوانی ماری و پیاوانی ئیلام، وەکو گەورەی خۆیان خزمەتی سەرجۆن، شای وڵاتیان ئەکرد.

سەرجۆن، شای وڵات، کیشی دروست کردەوە و شارەکەی دایەوە بە خۆیان تیا دابنیشن.

هەرکەس ئەم نوسینە بسڕێتەوە، ئوتو لە بنی بهێنێ و وەچەی لێ نەکەوێتەوە."(وائلی، ل 466.)

سەرجۆن بە داگیرکردنی "ئوما" کە قەڵای لوگال زاگی زی بوە، کۆتایی بە دەسەڵاتی "دەوڵەت شار" ەکانی سومەر هێناوە. بناغەی "دەوڵەتی وڵات" ی داناوە. شاری "ئاگادە: ئاکەد" ی لە نزیک شاری "کیش" دروست کردوە و کردویەتی بە پایتەختی دەوڵەتەکەی. ئیتر کەوتۆتە پەلهاویشتن بە هەر چوارلای مەڵبەندەکەی دا. بە گوێرەی گێڕانەوە دێرینەکان، کە پڕن لە ئەفسانە و خۆهەڵکێشان و بە خۆوە نازین، لە لای خوارویەوە گەیشتۆتە سەر کەناری خەلیج و لە لای رۆژئاوایەوە گەیشتۆتە جەزیرەی سوریا و کەناری دەریای سپی ناوەراست و لە لای خواروی رۆژهەڵاتیەوە گەیشتۆتە وڵاتی عیلام و لە لای سەرویەوە گەیشتۆتە خواروی ئەنەدۆڵ. لە چەند شوێنی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی دا بنکەی جەنگیی داناوە. ئاکەد لە هەمو لایەکەوە دیاری و باجی بۆ هاتوە. کەشتی لە کەناری ئاوەکانی دا باری کردوە و باری داگرتوە. سەرجۆن، لە یەکێ لە بالۆرەکانی دا، شانازی ئەکا بەوەی لە شاری ئاکەد لە بەر دەمی ئەودا 5400 جەنگاوەر رۆژانە نان ئەخۆن. لێرە بە دواوە ئیتر "ئاکەدی" بو بە ناو بۆ گەلێکی، بە رەگەز سامی، دەسەڵاتداری ئەم دەوڵەتە فراوانە و، زمانی ئاکەدی لە پاڵ زمانی سومەری دا بو بە زمانی کارپێکراوی تۆمارکردنی روداوەکان و هۆنینەوەی لاوژە و بالۆرە و ئەفسانە.

سەرجۆن، پەنجاوشەش ساڵ حوکمی کردوە. زۆری تەمەنی بە شەڕ بە سەر بردوە. لە دوا ساڵەکانی حوکمی دا توشی شەڕوشۆڕی ناوخۆ و هەڵگەڕانەوەی شارەکان بوە، بەڵام توانیویتی سەرکوتیان بکا.

دوای سەرجۆن کوڕەکەی "ریموش" جێگەی گرتۆتەوە. دەسەڵاتەکەی ریموش توشی یاخیبونی ناوخۆ و جەنگی دەرەکی بوە. هەندێ لە ناوچەکان لێی هەڵگەڕاونەتەوە، بە شەڕ هێناونیەوە ژێر فەرمانی خۆی. بەڵام

فەرمانڕەوایی ریموش زۆری درێژە نەکێشاوە. نۆ ساڵ حوکمڕانی کردوە. دەسو پێوەندەکانی خۆی کوشتویانە.

دوای ریموش براکەی "مانیشتوسو" چۆتە شوێنی. ئەمیش بە هەمان ڕێبازی جەنگی و سیاسی باوک و براکەی دا ڕۆیشتوە. پانزە ساڵ حوکمڕانی کردوە. ئەمیش لە پیلانێکی ناوخۆدا کوژراوە.

دوای مانیشتوسو کوڕەکەی نارام سین (2291 – 2255 پ. ز) جێگەی گرتۆتەوە.
نارام سین سیوحەوت ساڵ حوکمڕانی کردوە. نارام سین دەوڵەتی ئاکەدی گەیاندۆتە پلەیەکی بەرزی فراوانبون. زنجیرەیەک کاری جەنگی ئەنجام داوە و سەرکەوتنی گەورەی بە دەس هێناوە. یەکێ لەوانە شکاندنی لولوبیەکان بوە. (بڕوانە بالۆرەی سەرکەوتنی نارام سین)
نارام سین چەند نەریتی سیاسیی و دینیی تازەی داهێناوە:
یەکەم، ناوی لە خۆی ناوە شای چوارقوڕنەی زەمین. چوار قوڕنەی زەمین بە پێی تێگەیشتنی ئەو زەمانە هەمو دنیا بوە. لەوەو پێش ئەیان وت شای سومەر، شای سومەر و ئاکەد... ئەم لە پاڵ ئەو نازناوانەدا ئەو ناوە تازەیەی خستۆتە سەر نامە و نوسینەکانی.
دوەم، خۆی بردۆتە ریزی خواکان. لە نوسینەکانی دا نیشانەی خوایەتی لە گەڵ ناوی خۆی دا بەکارهێناوە. لە نەخش و پەیکەرەکانی دا کڵاوی دوشاخی کردۆتە سەری. لەوە پێش هیچ کام لە شاکانی سومەر و ئاکەد خۆیان بە خوا نەناساندوە، ئەوپەڕی خۆیان بە بریکار یا نوێنەری خوا داناوە. بە ناوی ئەوانەوە فەرمانڕەواییان کردوە. بەڵام ئەم خۆی بە خوداوەند ڕاگەیاندوە. ئەمەش جۆرێ بوە لە دەرچون لە نەریتی دینیی باوی ئەو سەردەمە و، بە کفر دانراوە و، ئەمەش بە یەکێ لە هۆکانی روخانی ئیمپراتۆریەتەکەی دانراوە.
سەرجەم پەلاماری شاری ئیکوری داوە و، پەرستگا گەورەکەی ئینلیلی وێران کردوە. بەوەش گۆیا خوا مەردوخی تورە کردوە. سەرەنجام کە دەوڵەتی ئاکەد شکاوە، شکانەکەیان گێڕاوەتەوە بۆ ئەو رقەی خوا مەردوخ لێی هەڵگرتوە، لە سۆنگەی پەلاماردانی شارەکە و روخاندنی پەرستگاکانی. ئاکەد، پایتەختی نارام سین، کەوتۆتە بەر نەفرینی خواکان. کاول بوە. بەو بۆنەیەوە ئەفسانەیەکیان هۆنیوەتەوە تو ک لە ئاکەد ئەکا.
لە بەشێکی ئەم شیوەنەدا کە بۆ ئەم مەبەستە دانراوە بە ناوی "نەفرەتی ئاکەد" ئەڵێ:

"ئەی شار! تۆ ئەوەی پرکێشیت کرد هێرش بکەیتە سەر ئیکور، ئەی ئەوەی ڕوبەڕوی ئینلیل بویتەوە.
ئەی ئاکەد! ئەی ئەوەی پرکێشیت کرد پەلاماری ئیکور بدەی، ئەی ئەوەی ڕوبەڕوی ئینلیل بویتەوە.
خۆزگە کێڵگەکانت خۆڵیان لە سەر کەڵەکە ئەبو
خۆزگە خشتە کاڵەکانت لە ئاودا ئەخوسان
خۆزگە خشتە کاڵەکانت خوا ئینکی نەفرەتی لێ ئەکردن
خۆزگە درەختەکانت ئەگەڕانەوە دارستانەکان
خۆزگە هاوسەرەکەت لە باتی گا سەربڕاوەکان سەر ببڕدرایە
خۆزگە منداڵەکانت لە باتی کاوڕە سەربڕاوەکان سەر ببڕدرانایە
هەژارەکانت خۆزگە ببرانایە منداڵەکانیان و خۆشەویستەکانیان نقوم بکرانایە
ئەی ئاکەد خۆزگە کۆشکەکەت کە بە دڵی خۆشەوە بنیات نراوە دەبوە کەلاوەیەک دڵتەنگی ئەهێنا
لەو شوێنانی کە ئاین و نەریتەکانی لێ بەجێ ئەهێنی خۆزگە ڕێوی لە کەلاوەکانی دا کلکی ڕابوەشانایە

خوزگە شوێنی راکێشانی بەلەمەکانت جگە لە گژوگیای خراپ هیچی کەی لێ نەڕوایە
خوزگە لە سەر رێی عەرەبانەکانت جگە لە گیای گریان هیچی کە نەڕوایە
سەرەرای ئەمانەش خۆزگە بە سەر رێی بەلەم و شۆستەکانی دا کەس بە هۆی سخولی درندەوە، کرم و مار و دوپشکی شاخەوە نەڕۆیشتایە
خوزگە دەشتەکانت کە گژوگیای دڵخۆشکەریان لێ ئەڕوا، زەلی گریانی لێ بڕوایە
نەی ئاکەد، لە جیاتی ئاوی شیرینی رەوان خوزگە ئاوی شۆری لێ بڕۆیشتایە
ئەوەی بڵێ ئەمەوێ لەو شارە نیشتەجێ بم جێیەکی باشی نیشتەجێبونی لێ دەس نەکەوێ
ئەوەی بڵێ لە ئاکەد ئەنوم شوێنێکی باشی نوستنی لێ دەس نەکەوێ"(وائلی. ل 85)
دەسەڵاتی نارام سین لە دوا ساڵەکانی تەمەنی دا، وەکو ئەفسانە و لاوژەکانی ئەو سەردەمە ئەیگێڕنەوە، چەند جارێ کەوتۆتە بەر هێرشی گەلانی دراوسێ لەوانە ئاموری، ئیلامی، گوتی. سەرەنجام لە سەردەمی شار کالی شاری کوڕ و جێگرەوەی نارام سین لە لایەن گوتیەکانەوە دەوڵەتی ئاکەد شکێنراوە و کۆتایی بە دەسەڵاتی هاتوە. (بڕوانە لاواندنەوەی سومەر و ئوروم)

## گوتیەکان کێ بون؟

لە سێیەمین هەزارەی پێش زاینەوە کە لە میزۆپۆتامیا سومەریەکان نوسینیان لە سەر قوڕ، چ بە وێنە و چ بە خەت، ناهێنا ناوی "گوتی" لە ناو روداوەکانی ناوچەکەدا. لە ناو گێڕانەوەی ئەفسانە و چیرۆک و لاوانەوە و شیعری سومەری و ئاکەدی و بابلی و ئاشوری دا هاتوە.
بە پێی ئەم گێڕانەوانە:
گوتیەکان گەلێکی چیانشین، دڕندە، خوێنڕێژ، بێ بەزەیی و وێرانکەر بون و، هەندێ جار بە هەژدیها و مار و دوپشکی شاخەکان ناو براون.
گوتیەکان لە نێوان رۆژهەڵاتی دیجلە و بناری چیاکانی زاگرۆس دا، لە نێوان زابی بچوک و سەروی روباری سیروان (دیالە) دا ژیاون. مەڵبەندی سەرەکیان لە ناوچەی کەرکوکی ئێستا بوە.

گوتیەکان، کە چیانشین یا چیایی بون، لە ئاکۆکی بەردەوام دا بون لە گەڵ دانیشتوانی دەشتەکان دا، ناوبەناو شاڵاویان بۆ بردون. لە ئەنجامی ستەمکاریی شا و دەسەڵاتدارەکانی ئاکەد دا، ئاکەدیەکان بەر نەفرەتی خواکانیان کەوتون، خواکان گوتیەکانیان لە شاخەکانەوە بۆ ناردون. هێرشیان کردوەتە سەر، شار و ئاواییەکانیان وێران کردون، وڵاتەکەیان داگیر کردون، کارەساتێکی گەورەیان بە سەر هێناون. (بڕوانە: لاوانەوەی ئوروک)
وەکو مێژونوسەکان ئەڵێن، گوتیەکان ماوەی سەدەیەک، کەمتر یا زیاتر، حوکمی وڵاتی سومەر و ئاکەدیان کردوە. سەرەنجام ئوتو خیگال پەیدا بوە، ئوتو خیگال (10 - 2116) هێزەکانی ئاکەد و سومەری کۆکردۆتەوە پەلاماری گوتیەکانی داوە شکاندونی و شاکەیانی بە دیل گرتوە. بەم بۆنەیەوە بالۆرەیەکیان بۆ رێکخستوە و لە سەر قوڕ بە خەتی مێخی و بە زمانی ئاکەدی نوسراوە. (بڕوانە: بالۆرەی سەرکەوتنی ئوتو خیگال)
سەرکەوتنی ئوتو خیگاڵ و شکاندنی گوتیەکان، تەخت و تاجی شاهێتی بۆ سومەر گێڕاوەتەوە. سەرەتای دەسەڵاتی بنەماڵەیەکی تر دەستی پێ کردوە.

کە باسی مێژووی گوتیەکان کراوە. زۆرتر پشت بەو چیرۆکانە بەستراوە، نەک بە لێکۆڵینەوەی شوێنەوارە کۆنەکان. بۆیە ئەشی گێڕانەوەکان یەکلایەنە و "بژارەیی: انتقائی" بوبن، ئەوە باری سەرنجی دوژمنەکانیان بێ کە ئێستا کراونەتە کەرەستەی نوسینەوەی مێژووەکەیان. هێشتا کەسێکی تر بە دوای ئەوەدا نەگەڕاوە گێڕانەوەکانی گوتیەکانیش بدۆزێتەوە تا هەڵسەنگاندن و بەراوردکاری بکرێ لە نێوان گێڕانەوەی جیاواز دا.

تا ئێستا، ئەوەندەی بەندە ئاگاداری بێ، لێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەنەی تێروتەسەل تایبەت بە گەلی گوتی نەکراوە. زانیاریەکانی هەن کەم و ناتەواون، ئەوانەش کە لە سەریان نوسیون هەمان زانیاریەکانی پێش خۆیان دوبارە کردۆتەوە. رەنگە لێکۆڵینەوەی ئارکیۆلۆجی و ئەنترۆپۆلۆجی و فیلۆلۆجی لە پاشەڕۆژدا بتوانێ هەندێ لایەنی تاریکی مێژووی گەلی گوتی زاگرۆسی ڕون بکاتەوە.
گوتیەکان، یەکێکن لەو گەلانەی نەتەوەی کوردی ئێستایان پێکهێناوە.

بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی گوتیەکان، بڕوانە:
(بە زمانی ئینگلیزی)
ئینسکلۆپیدیا بریتانیکا، بەرگی یانزە، بابەتی "شارستانێتی میزۆپۆتامیا"، ل 974 و 978.
(بە زمانی فارسی)
دیاکونوف، تاریخ ماد، ترجمة کریم کشاورز، تهران، 1377. ل 103 – 118.
(بە زمانی عەرەبی)
طه باقر، مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، دار الوراق، بيروت، 2009. ل 407 – 414.
صمونيل نوح كريمر، السومريون، ترجمة الدكتور فيصل الوائلي، الكويت، ل 82 و 412.
(بە زمانی کوردی)
محمد امین زکی، خلاصەییکی تاریخی کورد و کوردستان، بەغداد، 1931.
علاءالدین سجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەغداد، 1952. ل 30 – 31.
کۆزاد محەمەد ئەحمەد، کوردستانی ناوەڕاست لە نیوەی یەکەمی هەزارەی دووەمی پ. ز. دا، بنکەی ژین، سلێمانی، 2008. ل 45 – 55.

## وشەی نائاشنا

تلیان: سەبەتەیەکی قوڵە لە شێوەی گۆزەدا لە شوڵی داری بی، یا حەسیر، زەل.. دروست کراوە.
نیر: کەڵەمە. تەوقێ بوە لە تەختە یا مەعدەن دروست کراوە خراوتە ملی گا بۆ زەوتکردنی لە کاتی جوت و گێرەدا، یا کراوەتە ملی مرۆڤ وەکو نیشانەی بەندایەتی.

# وتوویژی
# ئاغایەک و کۆیلەکەی

ئاغا: کۆیلە، گوێت لێم بێ!
کۆیلە: بەڵێ ئەزبەنی، ئەوەتا گوێم لێتە!
ئاغا: گالیسکەکەم بۆ بهێنە، ئامادەی بکە، گەرەکمە بچم بۆ کۆشک.
کۆیلە: بچۆ، ئەزبەنی بچۆ! هەمو داواکانت جێبەجێ ئەکا، رێز و چاودێری شا بە دەس ئەهێنی.
ئاغا: نا، کۆیلە ناچم بۆ کۆشک.
کۆیلە: مەچۆ ئەزبەنی، ئەگینا شا بە ئیشێ ئەتنێرێ بۆ جێیەکی نەناسراو، لە خاکی بێگانەدا بە دیل ئەگیرێی، شەو و رۆژ توشی کێشە ئەبی.

ئاغا: کۆیلە گوێت لێم بێ!
کۆیلە: ئەوەتا ئەزبەنی گوێم لێتە.
ئاغا: دەسبەجێ ئاوم بۆ بهێنە دەستم بشۆم گەرەکمە نان بخۆم.
کۆیلە: بیخۆ، ئەزبەنی بیخۆ! ژەمێ خواردنی باش دڵ ئەکاتەوە، بۆ ئەو خواردنەش کە بە خۆشی و بە دەستی پاک بخورێ، خوا شاماش ئامادەی ئەبێ.
ئاغا: نە کۆیلە نا، نان ناخۆم.
کۆیلە: مەیخۆ ئەزبەنی، مەیخۆ! لە پاش نانخواردن برسێتی و لە دوای خواردنەوە تینوێتی دێ.

ئاغا: گوێڕایەڵم بە کۆیلە، گوێڕایەڵم بە!
کۆیلە: بەڵێ ئەزبەنی، ئەوەتا من گوێڕایەڵتم.
ئاغا: بڕیارم داوە شۆڕش بکەم، یاخی بم.
کۆیلە: بیکە ئەزبەنی! چی بە سەر جەوهەرتا دێ و کێ ئەتداتێ سکت پڕ بکەی؟

ئاغا: نا، کۆیلە نا شۆڕش ناکەم.
کۆیلە: مەیکە ئەزبەنی مەیکە! هەر کەس شۆڕش بکا و یاخی بێ ئەشکەنجە ئەدرێ لەشی بە لێدان ئەشێوێنرێ و ئەخرێتە زیندانەوە.

ئاغا: گوێڕایەڵم بە کۆیلە، گوێڕایەڵم بە!
کۆیلە: گوێڕایەڵتم ئەزبەنی، ئەوەتا گوێڕایەڵتم.
ئاغا: ئەمەوێ دڵداری بکەم.
کۆیلە: دڵداری بکە ئەزبەنی دڵداری بکە! هەرکەس دڵداری بکا ئازار و ماندوبونی لە بیر ئەچێتەوە.
ئاغا: نا، کۆیلە دڵداری ناکەم.
کۆیلە: دڵداری مەکە ئەزبەنی دڵداری مەکە! ژن بیرە. ژن خەنجەرێکی ئاسنینە گەردنی پیاو ئەبڕێ.

ئاغا: گوێڕایەڵم بە کۆیلە، گوێڕایەڵم بە!
کۆیلە: بەڵێ ئەزبەنی، ئەوەتا گوێڕایەڵتم.
ئاغا: ئاوم بۆ بهێنە دەستم بشۆم، گەرەکمە قوربانی پێشکەش بە خوا بکەم.
کۆیلە: بیکە ئەزبەنی، بیکە! ئەوەی قوربانی پێشکەش بە خوا بکا بەختیاری بە دەس ئەهێنێ و دینی بەهێزتر ئەبێ.
ئاغا: نا کۆیلە، قوربانی ناکەم.
کۆیلە: قوربانی مەکە ئەزبەنی، قوربانی مەکە! ئەتوانی ئاگاداری خوا بکەی کاتێ پێویستی پێت ئەبێ ئایینەکانی جێبەجێ بکەی وەک سەگ بە دوات دا رابکا.

ئاغا: گوێڕایەڵم بە کۆیلە، گوێڕایەڵم بە!
کۆیلە: بەڵێ ئەزبەنی، بەڵێ!
ئاغا: ئەمەوێ خێر بکەم و سەدەقە بۆ ئەرزەکەم بکەم و خواردن پێشکەش بە وڵاتەکەم بکەم.
کۆیلە: خواردن پێشکەش بکە ئەزبەنی، ئەوەی خواردن پێشکەش بکا بە وڵاتەکەی، جۆکەی بە مۆڵی بۆ خۆی ئەمێنێتەوە، قازانجی زۆری دەس ئەکەوێ.
ئاغا: نا کۆیلە خواردن پێشکەش ناکەم بە وڵاتەکەم.
کۆیلە: مەیکە ئەزبەنی، مەیکە! بەخشین وەکو خۆشەویستی وایە.. وەکو لە دایکبونی منداڵ وایە.. نانەکەت ئەخۆن و ئەفرینیشت لێ ئەکەن.

ئاغا: گوێڕایەڵم بە کۆیلە، گوێڕایەڵم بە!
کۆیلە: ئەوەتا گوێڕایەڵتم ئەزبەنی.
ئاغا: گەرەکمە یارمەتی وڵاتەکەم بدەم.
کۆیلە: بیکە ئەزبەنی، ئەوەی یارمەتی وڵاتەکەی بدا چاکەکانی ئەخرێتە ناو لەپی خوا مەردوخەوە.
ئاغا: نا کۆیلە، یارمەتی وڵاتەکەم نادەم.
کۆیلە: مەیکە، ئەزبەنی مەیکە! سەر بکەوەرە سەر کەلاوە دێرینەکان و بە سەری دا برۆ سەیری کەللەسەری تێکەڵاوی رابوردوان بکە ئاخۆ کامانەیان بەد بون و کامانەیان باش بون؟

ئاغا: گوێڕایەڵم بە کۆیلە، گوێڕایەڵم بە!
کۆیلە: بەڵێ، ئەزبەنی بەڵێ!
ئاغا: ئێستا چی لەم دنیایەدا باشە! لە گەردنی تۆ و لە گەردنی خۆم بدەم. یا هەردوکمان خۆمان بهاوێژینە ناو ئاوەوە، کامیان شتی باشە.
نا کۆیلە، تۆ بە تەنیا ئەکوژم، بۆ ئەوەی تۆ پێشم بکەوی.
کۆیلە: ئاخۆ ئاغاکەم حەز ئەکا دوای من بژی تەنانەت ئەگەر بۆ سێ ڕۆژیش بێ!

## تێچاندن

ئەم لاوژەیە، بە زمانی بابلی هۆنراوەتەوە، بە پێی هەڵسەنگاندنی شارەزایان، کە باسی ئاسن ئەکا، سەردەمی هۆنینەوەی ئەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زاین.
چەند شتێ لەم بابەتە ئەخوێنرێتەوە:
یەکەم. هەڵوەشانی ڕێکخراوەی بەها دینیە باوەکانی کۆمەڵی بابلی، بە تایبەتی سوکایەتی ئاشکرا بە باوەڕی فرە – خوایی.
دوەم. داڕزانی ڕێکخراوەی بەها ڕەوشتە- کۆمەڵایەتی‌یە باوەکانی کۆمەڵ، کە لەم گفتوگۆیەدا خۆی لە دوڕویی و ڕوپامایی و چاپلوسی ... دا ئەنوێنێ.
سێیەم. ناهاوسەنگی سیستەمی کۆمەڵایەتی و ئابوری لەو ڕۆژگارەدا، کە گەورەی دەبەنگ بە بێ ڕەنجی زۆر و راوێژی ژیرانەی کۆیلەکانی نەیتوانیوە درێژە بە مانی خۆی بدا.

ئەم دەقە لە عەرەبی وەرگیراوە. بڕوانە:
طه باقر: مقدمة في ادب العراق القديم، دار الوراق للنشر، بغداد 2010. ص 190 – 194.
لە بەر ئەوەی لە نێوان تێکستەکەی تەها باقر و هەندێ تێکستی تردا جیاوازی‌یەکی کەم هەیە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:
جان بوتيرو: بلاد الرافدين، الكتابة - العقل - الالهة، ترجمة الاب البير ابونا، ص 309 - 316.
الدكتور سامي سعيد الاحمد: فترة العصر الكاشي، مجلة سومر، الجزء الاول والثاني، المجلد التاسع والثلاثون، 1983. (ص 148-150).
هەروەها
الدكتور وليد الجادر: المحاورة التشاؤمية والمعجزة، مجلة الاقلام، المجلد 5، الجزء 1، 1969. (ص 47-62)

# لاوژەی لوگالباندا

## چکاوەی بابەت

ئینمیرکار، شای ئونوگ بڕیار ئەدا بچێتە سەر ئەراتا. ئەراتا شارێکە لە ناوچەیەکی شاخاوی سەخت دایە، گوێڕایەڵی شای ئونوگ نین. شای ئونوگ داوا لە شای ئەراتا ئەکا بۆ دروستکردنی پەرستگاکانیان پیرۆزە و ناقیق و زێڕ و زیوی بۆ بنێرن، بەردی شاخەکانی بۆ بهێنن. ئەوان گوێ بەم داوایانە نادەن.
ئینمیرکار بڕیار ئەدا بچێتە سەریان بە شەڕ مەڵبەندی یاخییان داگیر بکا و بە زۆر سەریان پێ دابنەوێنێ.
خەڵکی وڵاتەکەی ساز ئەدا، داجیان لە سەر دائەنێ و، سەربازگیری ئەکا.
بە رێ ئەکەون. پاش چەند رۆژێ لوگالباندا، یەکێ لە سەرکردە جەنگیەکانی نەخۆش ئەکەوێ. بۆ ئەوەی لەشکرکێشیەکەیان دوا نەکەوێ لە ئەشکەوتێک دا بە جێی ئەهێڵن. هەندێ خواردن و تفاقەکانی خۆی بۆ دائەنێن بە هیوای ئەوەی ئەگەر لە نەخۆشیەکەی هەستایەوە بگەڕێتەوە بۆ ئونوگ، ئەگەر مرد ئەمان دوای تەواوبونی لەشکرکێشیەکە تەرمەکەی بیەنەوە. بەمجۆرە بەجێی ئەهێڵن.
هێزەکانی کولابا و ئونوگ درێژە بە رێپیوان ئەدەن ئەچنە سەر ئەراتا گەمارۆی ئەدەن. پێیان ناگیرێ.
لوگالباندا بەو نەخۆشیە نامرێ. هۆشی دێتەوە بەر. بە دەم گریانەوە دەستی پاڕانەوە بۆ خواکان هەڵئەبڕێ:
لە ئینلیل، گەورەی خواکان، ئەپاڕێتەوە نەخۆشی لە کۆڵ بکاتەوە.
لە ئینانا، خوای دڵداری و جەنگ ئەپاڕێتەوە لە بیماری رزگاری بکا.
لە ئوتو، خوای رۆژ، ئەپاڕێتەوە چاکی بکاتەوە.
لە سوئین، خوای مانگ، ئەپاڕێتەوە هێزی تێ بگەڕێتەوە.
ئینلیل، باوکی هەمو خواکان بە راوێژ لە گەڵ ئوتو، خوای رۆژ، "ئەمامی ژیان" و "ئاوی ژیان" ئەخوڵقێنێ.
لوگالباندا لە نەخۆشی هەڵئەستێتەوە. هەندێ هێزی دێتەوە بەر. توێشوەکەی و چەکەکانی هەڵئەگرێ و لە ئەشکەوت دێتە دەرەوە. لە ئەمامی ژیان ئەخوا و لە ئاوی ژیان ئەخواتەوە، ئەوسا ئیتر ئەکەوێتە گەڕان و سوڕان و جموجوڵ. بەڵام بە چاوە تیژەکانی لەو دەوروبەرەدا جگە لە خۆی هیچ کەسێکی تر بەدی ناکا.

ماندو ئەبێ، شەو بە سەردا دێ، تێروپڕ مەی ئەخواتەوە تا مەست ئەبێ و لە پەلوپێ ئەکەوێ. ئینجا خەوی لێ ئەکەوێ. ئەگەرچی خۆی نەی ئەزانی ئاگر بکاتەوە. نەی ئەزانی تەنور چیە و چۆن نان ببرژێنێ. نەی ئەزانی ئاگردان چۆنە و چۆن گۆشت ببرژێنێ. نەی ئەزانی چۆن خواردن ئامادە بکا. چۆن تەڵە دابنێ و چۆن بۆسە بنێتەوە بۆ ڕاوی گیانداری کێوی. لە خەوەکەی دا هەمو ئەوانەیان فێر کرد.

بۆ بەیانی کە بە ئاگا دێتەوە هەرچی لە خەونەکەی دا دی بوی هەموی جێبەجێ ئەکا. تەڵە ئەنێتەوە، بۆسە دائەنێ. جوانەگایەکی کێوی و دو بزن لە بۆسەکەی دا ئەگرێ. دار هەڵئەکەنێ. شوڵیان لێ دروست ئەکا. بە شوڵەکانی ئەیان بەستێتەوە. ئاگردان دروست ئەکا و ئاگر ئەکاتەوە. نان و خەپلە ئەبرژێنێ. مەی و بادە ئامادە ئەکا. جوانەگاکە و بزنەکان ئەکوژێتەوە، ئەیان برژێنێ دوکەڵەکەی ئەچێ بە ئاسمان دا هەواڵ بۆ خواکان بدا. خوێنەکەیان ئەڕێژێتە چاڵێکەوە تا مارەکانی بیابان بۆنی بکەن. سفرەیەکی نایاب ئەڕازێنێتەوە بۆ میوانداری لە خواکان. بۆ خێر - قوربانی خواکان: .ئینلیل (خوای باوک و. با)، ئینکی (خوای ئاو و. ژیریی)، نینهورساگ (ماخوای دایک و. زەوی).

لوگالباندا لە ناوخواکان دا مەلی ئانزود (خوای بروسکە) هەڵئەبژێرێ کۆمەکی بکا.

بۆ ئەو مەبەستە بە هەلی ئەزانێ ئانزود لە هێلانەکەی دور ئەبێ، ئەمیش خزمەتی بەچکەکانی ئانزود ئەکا، هێلانەکەی ئەڕازێنێتەوە. خواردنیان بۆ ئامادە ئەکا. دایکە و باوکەی جوجەڵەکان لە دورەوە کە بانگ لە بەچکەکانیان ئەکەن، بەچکەکان ئەوەندە سەرمەستی خۆشی ئەبن وەڵام نادەنەوە. دایک و باوک گومان ئەکەن کارەساتێ لە هێلانەکانیان قەومابێ. بەڵام کە دێنەوە هێلانەکەیان ئەبینن خۆش کراوە و بەچکەکانیان خزمەت کراوە مەلی ئانزود ئەوەندە دڵی خۆش ئەبێ بەڵێنی گەورە ئەدا بەوەی ئەو چاکەیەی لە گەڵ کردوە ئەڵێ: تۆ ئەی ئەوەی کە ئەمەت لە گەڵ من کردوە ئەگەر خوای ئەوا ئەبم بە هاوڕێت و ئەگەر مرۆڤی چاکەت ئەدەمەوە بەوەی چارەنوست بۆ دیاری ئەکەم.

لە گەڵ لوگالباندا پێک ئەگەن. ئانزود ئەیەوێ لوگالباندا بە هەندێ دەسکەوتی بچوک ڕازی بکا، چەندین پێشنیاری بۆ ئەکا لەوانە:

بە دەستی پڕ بە سەربەرزی بگەڕێتەوە بۆ شارەکەی خۆی

سپایی هەمو مێگەلی سەرئەرزی پێ ببەخشێ

جلوبەرگێکی جەنگیی وەهای لە بەر بکا لە شەڕدا هەرگیز نەشکێ

لوگالباندا بە هیچ کام لەوانە ڕازی نابێ، ئەیەوێ چارەنوسێکی بۆ دیاری بکا بگەڕێتەوە بۆ ناو برا و هێز و شارەکەی بەڵام ببێتە کەسایەتیەکی خوایەنراوی گەورەی خاوەن پلە و پایەی بەرز. ئانـزود بەڵێنەکەی بە جـێ ئەهێنێ بەو مەرجـەی ئەم کارە بە نهێنی بمێنێتەوە. بۆ کەسی باس نەکا: هەم ئەیکا بە پاڵەوانێکی بە هێز، هەم کۆمەکی ئەکا لە دۆزینەوەی هێزەکەیان دا.

لوگالباندا ئەگەڕێتەوە بۆ لای براکانی بۆ لای هێزەکەی. هەمویان بە لایانەوە سەیر ئەبێ گومان لە گەڕانەوەکەی ئەکەن، چۆن نەمردوە، چۆن لەو شاخانە بە تەنیا، بە ناو ئەو هەمو مەترسیانەدا تێ پەڕیوە. بە پرسیار دای ئەگرنەوە. وەڵامی هەمویان ئەداتەوە باوەڕیان پێ ئەهێنێ.

ئینمیرکار ماوەی ساڵێ گەمارۆی شاری ئەراتا ئەدا بێ ئەوەی بتوانێ بیگرێ ئەیەوێ کەسێ بنێرێتەوە بۆ ئونوگ پەیامی چەقینی هێزەکانی لە بەردەم دیوارەکانی ئەراتادا بباتەوە بۆ، ئانانا، ماخێوی ئوروگ، گلەیی لێ بکا لە سەر ئەوەی؛ ئەو کردویەتی بە شا و، لە سەر ڕێنمایی ئەو هەڵی کوتاوەتە سەر ئەراتا، کەچی ئەو ئەمی فەرامۆش کردوە و کۆمەکی ناکا لەشکرکێشیەکەی بە سەرکەوتویی کۆتایی بێ. داوای لێ ئەکا کە یان

بیگێڕێتەوە بۆ کولابا یان کۆمەکی بکا. هیچ کەس لە ناو ئەو هێزەی کە لە گەڵی بون ئامادە نابن ئەو ئەرکە ئەنجام بدەن و ئەو پەیامە بگەیەنن. ئەترسن لە ڕێگا ون بین. لوگالباندا ڕاست ئەبێتەوە ئامادەیی بۆ چون دەرئەبڕێ، بەو مەرجەی خۆی بە تەنیا ڕابسپێردرێ و، کەسی تری لە گەڵ نەنێرن. هاوەڵەکانی گاڵتەی پێ ئەکەن. ئینمیرکار ئەرکەکەی پێ ئەسپێرێ.

لوگالباندا بە سەرکەوتویی ئەگاتەوە ئونوگ. پەیامی شا ئەگەیەنێ بە ئانانا. ئانانا یش لە وەڵامی پەیامەکەی ئەودا ئامۆژگاری بۆ ئەنێرێ کە چەندین جۆر ماسی لە ئاوی ڕوباری پاک دا ئەژین و لە ناو ئەوانەدا یەکێکیان خوای هەمویانە ئەگەر ڕاوی ئەو ماسیە بکەن و، بیکەن بە قوربانی و دەرخواردی خواکانی بدەن، ئەوکات توانایەکی زۆری بردنەوەی شەڕ ئەچێتە چەکەکانیان و خۆیانەوە.

ئەوسا ئەتوانن سەرچاوەی ئاوی ئەراتا، کە سەرچاوەی ژیانی ئەوانە، ببڕن و ناچار ئەبن مل بدەن بۆ فەرمانڕەوایی ئەمان.

ئەوسا هەمو ئەراتا ئەکەوێتە ژێر دەستی ئەو و ئەتوانێ وەستاکانیان، ئاسنگەر و سەنگتاش، بە کەرەستەی پێویستەوە ڕاپێچ بکا بۆ ئونوگ بۆ ئاواکردنەوەی پەرستگاکان.

# لاوژەی لوگالباندا

## لوگالباندا و ئەشکەوت

1 - 19: کاتێ لە ڕۆژانی دێرین دا ئاسمان لە ئەرز جیا بوەوە، کاتێ لە ڕۆژانی دێرین دا شتەکان تەواو کران. کاتێ لە زەمانی زودا جۆخێنەکان هەڵگیران... جۆ هاتە خواردن. کاتێ کەوشەن دیاری کرا و سنورەکان کێشران، کاتێ کێلی سنورەکان چەقێنران و ناوەکانیان لە سەر نوسرا. کاتێ جۆبار و لێوارەکانی جۆماڵ کران، کاتێ بیرەکان ڕاستەوخۆ بە قوڵی هەڵکەنران. کاتێ بنی فورات، ڕوباری ڕێژەنی ئونوگ، کرایەوە. کاتێ... کاتێ... کاتێ نانی پیرۆز جولا.... کاتێ بارەگاکەی ئین و شا لە ئونوگ بە خۆشناویەوە کاریان ئەنجام ئەدا. کاتێ گۆپاڵی شاهی و گورزی کولابا لە نەبەردا... نەبەرد، گەمەی ئینانا، بڵند ڕاوەشێنران. کاتێ سەرڕەشەکان، لەو ڕێگەیەدا کە بڕی بویان، بە ژیانی درێژ پیرۆز کران.... کاتێ ئەوان بزنی چیاییان بە سمی پتەوەوە و کەڵی چیاییان بە قۆچی جوانەوە پێشکەش بە ئینمیرکار ی کوڕی ئوتو کرد...

20 - 34: ئینجا، لەو کاتەدا، شا سەری گورزەکەی ئاڕاستەی شارەکە کرد. ئینمیرکار ی کوڕی ئوتو ئامادەکاری کرد .... بۆ لەشکرکێشی بۆ سەر ئەراتا. کێوی دەسەڵاتی خوایەنراوی پیرۆز. بە نیازی کاولکردنی سەرزەمینی یاخییان، ئاغا کەوتە سازدانی شارەکەی. جارچی، لە سەرانسەری وڵات دا، فوی کرد بە کەڕەنای شاخی دا.

ئێستا ... جەنگاوەرانی ئونوگ، لە گەڵ شاهی ژیردا، چونە مەیدانەوە. ڕاستیەکەی ... جەنگاوەرانی کولابا شوێن ئینمیرکار کەوتن. جەنگاوەرانی ئونوگ لێشاوێ بون، جەنگاوەرانی کولابا... ئاسمانی هەوراوی بون. هەر کە ئەوان، ئەرزیان وەک تەمێکی چڕ داپۆشی، تەپوتۆزی خەستی ئەوان گەیشتە ئاسمان.

بۆ ئەوەی تەفرەیان بدا و هەرە باشەکانیان ئاشکرا بکا هاواری لە جەماوەرەکە کرد. هەریەکەیان نیشانەی خۆی دا بە هاوەڵەکەی....

35 - 46: شاکەیان لە پێشەوەی لەشکرەکەیەوە ئەڕۆیشت.... ئینمیرکار لە پێشەوەیانەوە ئەڕۆیشت بۆ ... لەشکرەکەی

... دانەوێڵەی گو – نیدا... زۆرورزەبەند زیاد بکا.
کاتێ راستاڵ لە گەڵ ئینلیل راوێژی کرد هەمو کولابای بەڕێ خست، وەکو مێگەل لە لێژایی چیاکان دا.... وەکو گاران لە بناری هەورازەکان دا رایان ئەکرد.
ئەو روانیە ... لێوارەکە... رێگەکەیان ناسی. ئەو روانی....

47 - 58: پێنج رۆژ رابورد. لە رۆژی شەشەم دا خۆیان شت... لە رۆژی حەوتەم دا چونە ناو چیاکانەوە.
کاتێ لە رێبازەکە پەڕینەوە لێشاوێکی گەورە بە پێچەوانەی تەوژمی ئاوەکەوە ئەڕژایە ناو گۆمەکەوە...
فەرمانڕەواکەیان، بە سواری گەردەلولەوە، کورەکەی ئوتو، گەوهەری قەشەنگی درەوشەدار، لە ئاسمانەوە دابەزی بۆ سەر ئەرزی فراوان. کەڵەی پرشنگداری دەرکەوت، تیرە تیژەکانی تیشکەکەی وەکو رۆشنایی تێپەڕین.....
قوبیەی تەورە برونزیەکەی کە لە دروشمەکەی دا ئەبریسکایەوە و، لە تەورە رەنگینەکەی دا دەریۆقی بو، ئەتوت سەگە بەربۆتە کەلاک.

59 - 70: لەو کاتەدا حەوت بون، ئەوان حەوت بون... خۆرتەکەیان، لە کولابا لە دایک بوبو، حەوت بون.
ماخوا ئوراک حەوتی هەبو، چێڵەکی کێوی بە شیر پەروەراند بونی. پاڵەوان بون لە سومەر ئەژیان. لەهەرەتی خۆشیی شکۆداری دا بون. هێنران لە سەر خوانی ئان نان بخۆن. ئەم حەوتە سەردەستەی ئەوانە بون کە ژێردەستەی سەردەستەکان بون، کاپتنی ئەوانە بون ژێردەستەی کاپتنەکان بون، جەنەراڵی ئەوانە بون ژێردەستەی جەنەراڵەکان بون.
سەردەستەکان سێ سەد پیاو بون، هەر یەک لەو سێ سەدە، کاپتنی شەش سەد پیاو بون، هەریەکە لەو شەش سەد پیاوە، جەنەراڵی حەوت کار، بیستوپێنج هەزار و دوسەد سەرباز بون، هەر یەکەی بیستوپێنج هەزار و دوسەد سەرباز بون.
ئەوانە هێزی هەڵبژاردە بون لە خزمەتی ئاغا دا راوەستا بون.

71 - 86: لوگالباندا، هەشتەمی ئەوان... لە ناودا شۆرا بو.
بە بێدەنگیەکی سامناک بۆ پێشەوە چو.. لە گەڵ هێزەکان دا رۆیشت. کاتێ نیوەی رێیان بڕی، نیوەی رێیان بڕی بو، توشی نەخۆشی بو، توشی "نەخۆشی سەر" بو. وەکو مارێ پەت خرابێتە سەری رابکێشرێ گینگڵی ئەدا و، وەکو ئاسکێ کەوتبێتە تەپکەوە دەمی لە قوڕ چەقی بو. چیتر نەیئەتوانی دەستی هەڵبێنێتەوە و، چیتر نەیئەتوانی لاقی بەرز بکاتەوە. نە شا و نە دەسوپێوەندەکانی نەیانتوانی یارمەتی بدەن. لە چیا گەورەکان دا، ئەوان پێکەوە وەک هەوری خۆڵاوی بە سەر ئەرزەوە جمەیان ئەهات....
وتیان: "با ئەوان بیبەنەوە بۆ ئونوگ". بەڵام نەیانزانی چۆنی ببەنەوە.
وتیان: "با ئەوان بیبەنەوە بۆ کولابا". بەڵام نەیانزانی چۆنی ببەنەوە.
ددانی چۆقەچۆقی بو، لە شوێنی ساردی چیاوە گواستیانەوە بۆ شوێنێکی گەرم.

87 - 122: کۆگایەک و، کەپرێکیان وەکو هێلانەی مەل بۆ هەڵبەست...
خورما، هەنجیر و جۆری جیاوازی پەنیر، شیرینی کە خواردنی بۆ نەخۆش باش بێ، بۆیان خستە ناو سەبەتەی خورماوە، ئینجا ژوورێکیان بۆ ڕێک خست.
جۆری جیاوازی چەوریی مانگای گەوڕ و، پەنیری تازەی مەڕی پشتیر. ڕۆن و هێلکەی سارد، هێلکەی کوڵاوی سارد، وەکو خوانێ بۆ شوێنی پیرۆز، شوێنی گرنگ، ڕازانەوە.
لە بەر دەم خوانەکەدا، بیرەیان بۆ خواردنەوە، تێکەڵاو لە گەڵ دۆشاوی خورما، بابۆڵەیان... لە گەڵ کەرە بۆ دانا.
شتەکانیان خستە ناو سەتڵی چەرم و، ئاخنییانە ناو هەمانەی چەرمینەوە.. براکانی و هاوڕێکانی، وەکو لە کاتی سەر خەرمان دا شت لە بەڵەم دابگرن، شتەکانیان لە ژوور سەری لە ئەشکەوتی چیادا ریز کرد.
ئەوان ... لە کوندەدا ناو. بیرەی رەش، خواردنەوەی کهولی، بیرەی رونی جۆ، شەرابی تامخۆش بۆ خواردنەوە، لە ژوور سەری، لە ئەشکەوتی چیادا، لە سەر هەرزاڵەی کوندەکەدا ریز کرد.
بوغوردی نایاب، بوغوردی بۆندار... بوغوردی لیگیدبا، بوغوردی باشیان لە ناو بوغوردان دا لە ئەشکەوتی چیادا بە سەر سەریەوە هەڵواسی.
تەورەکەی، کە لە ئاسنی باش دروستکرا بو، لە چیاکانی زوبیەوە هێنرا بو، لە ژوور سەریەوە، بۆیان دانا. نێزە ئاسنینەکەشی، کە لە چیاکانی گیک دەوە هێنرا بو، خستە سەر سنگی.
ئەسرین لە چاڵی چاوەکانی دا... سەرڕێژی کرد بو.. لوگالباندا ی پیرۆز چاوی بە زەقی مابوەوە... وەکو ئوتوی پیرۆز لچ و لێوی بۆ براکانی نەکردەوە. کاتێ ملیان بەرز کردەوە، هەناسەی نەدەدا، براکانی و هاوڕێکانی لە گەڵ یەک کەوتنە راوێژ.

123 – 127: ئەگەر براکەمان، وەکو ئوتو، لە جێگەکەی هەستایەوە، ئەوسا خوا کە نەخۆشی خستوە پشتیوانی نەبێ، ئەگەر ئەم خۆراکە بخوا، ئەگەر ئەمانە بخواتەوە، لە سەر قاچ ڕاوەستێ، بەشکو بتوانێ بە سەر بەرزایی چیاکان دا بگاتەوە کولابای بە خشت دروست کراو.
128 - 132: بەڵام ئەگەر ئوتو براکەمان بانگ بکا بۆ شوێنی پیرۆز، بۆ شوێنی گرنگ، چوارپەلی هێزیان تێ دا نەمێنێ، ئەوسا ئەکەوێتە سەر ئێمە، کە لە ئەراتا گەڕاینەوە، تەرمی براکەمان بەرینەوە بۆ کولابای بە خشت کراو.

133 - 140: وەکو مانگا پیرۆزەکەی دانندا کە تەرە نەبێ و، لە تەمەنی پیری دا، لە گەڵ جوانەگایەک دا کەڵ نەگرێ و، لە پشتەوەی گەوڕی چارەوی دا بە جێ نەهێڵرێ، ئەمانیش: براکانی و هاوڕێکانی لوگالباندا ی پیرۆزیان لە ئەشکەوتی چیادا بە جێ هێشت، برا گەورەکانی بە ڕشتنی فرمێسکی زۆر و ناڵەناڵ، بە شیوەن و، بە پەژارە و رۆرۆ وە، لوگالباندایان لە چیا جێ هێڵا.

141 - 147: دو رۆژ بە سەر نەخۆشکەوتنی لوگالباندا تێپەڕی بو، دانێکی تریشی خایان. کە ئوتو، ڕۆشنایی خۆی بۆ سەر ماڵەکەی ئەو سوڕانەوە، گیاندارەکان ڕویان کردەوە لانەکانیان، ڕۆژ بە ئێوارەیەکی فێنک کۆتایی هات، ئەمیش لەشی وەکو بە ڕۆن هەنورا بێ سوک بو. بەڵام هێشتا بیماریی بەری نەدا بو.

148 - 150: کاتێ چاوی بۆ ئوتو بەرەو ئاسمان هەڵبڕی، بە سەر ئەودا گریا وەکو بە سەر باوکی دا بگری. لە ئەشکەوتی چیادا دەستە پاکەکانی بۆ بەرزکردەوە:

151 - 170: "ئوتو! دروودی منت لێ بێ، دا ئیتر نەخۆش نەبم. کوڕی نینگال! دروودت لێ ئەکەم، دا ئیتر بیمار نەبم.
ئوتو! تۆ ڕێگەت بە من دا بە هاوڕێیەتی براکانم بێمە ناو چیاکانەوە. لەم کەورگەدا، کە سەختترین شوێنی دنیایە، دا ئیتر نەخۆش نەبم! لێرە کە نە دایکمی لێیە نە باوکم، نە شارەزای لێیە، نە کەسێ کە من بیناسم، دایکم لێرە نیە بڵێ: ئای بۆ رۆڵەکەم! براکەم لێرە نیە بڵێ: ئای بۆ براکەم! دراوسێکانی دایکم، کە ئەهاتنە ماڵی ئێمە، لێرە نین، تا بۆم بلاوێننەوە. ئەگەر خواکان و ماخواکان پێکەوە بونایە خوای دراوسێیەتی ئەیوت: ئەم پیاوە نابێ بمرێ!
سەگی ونبو خوێڕیە، پیاوی ونبو داماوە. لە ڕێگایەکی نەزانراوی بناری چیاکان دا، ئوتو! پیاوێکی ونبو، پیاوێکە لە دۆخێک دایە هێشتا دژوارترە.
وام لێ مەکە بە مەرگی سەختی ئاو بچم.
وام لێ مەکە لە داتی جۆ بەردەخوێ بخۆم.
وام لێ مەکە وەکو کۆڵەوژێکی فڕێدراو لە چۆڵەوانیەکی نەناسراودا بکەوم.
گرفتاری داوێکم مەکە براکانم بە پێکەنینەوە لاقرتێم پێ بکەن، دا ئیتر نەخۆش نەبم.
توشی گاڵتەپێکردنی هاوەڵەکانم مەکە، دا ئیتر بیمار نەبم!
دا لەم کێوانە وەکو کابرایەکی بودەڵە کۆتاییم نەیەت!"

171 - 172: ئوتو فرمێسکەکانی گیرا کرد. هاندانی خوایی بۆ ناردە ئەشکەوتی چیا.

173 - 182: ئەو ژنە ئەوەی ئەیکا... بۆ هەژاران، یاریەکی خۆشە، سۆزانیەکە ئەچێتە دەرەوە بۆ ناو خان، ئەوەی ژوری خەوتن روناک ئەکاتەوە، ئەو خوراکی هەژارە.. ئینانا، کچی سوئین، لە بەردەمی دا لە مەڵبەندەکەدا وەکو نێونێک قوت بوەوە. تریفەکەی ئەو، وەکو ئەوەی کارا ی پیرۆز، پرشنگە ئەستێرەییەکەی ئەشکەوتەکەی بۆ روناک کردەوە.
کاتێ ئەو چاوی بەرەوژور بۆ ئینانا هەڵبڕی، بە سەر ئەودا گریا وەکو بە سەر باوکی دا بگری. لە ئەشکەوتی چیادا دەستە پاکەکانی بۆ بەرزکردەوە:

183 - 196: "ئەی ئینانا! ئەگەر هەر ئەمە ماڵی من بێ، ئەگەر هەر ئەمە شارەکەم بێ! ئەگەر هەر ئەمە کولادا بێ، ئەو شارەی کە دایکم منی تێدا بوە...! تەنانەت ئەگەر ئەمە بۆ من وەکو کەلاوەی چۆڵەوانی بێ بۆ مار! ئەگەر ئەمە بۆ من وەکو درزی ئەرز بێ بۆ دوپشک! خەڵکە بەهێزەکەم .. خانمە گەورەکانم... بۆ ئینانا
............
بەردە پچوکەکانی ئەو، بەردە درەوشاوەکانی لە شکۆداریەکەی دا، بەردی ساجکال لە سەرەوە.... لە خوارەوە، هاوارەکەیان کە لە شاخەکانی سەرزەمینی زابو هوە دێ .. ئەکرێتەوە .. چوارپەلم لە شاخەکانی دارسەرو دا نەفەوتێ!"

197 - 200: ئینانا فرمێسکەکانی گیرا کرد. بە توانینی ژیانەوە لێی گەڕا بچێ بنوێ وەک چۆن نوتو ئەنوێ. ئینانا دڵی ئەوی خۆش کرد وەکو جلی خوری لە بەر کرد بێ. ئەوسا، وەک ئەگەر... ئەو ڕۆیشت بۆ کولابای بە خشتکراو.

201 - 214: جوانەگاکەی شۆربا ڕەشەکەی خوارد. گۆلکی جوانەگا پیرۆزە ئەستێرەییەکە هات بۆ ئەوەی نیگاداری ئەو بکا. لە ئاسمان دا وەکو ئەستێرەی بەیانی هەڵهات. ڕۆشناییەکی زۆری لە تاریکی شەودا بڵاو کردەوە. سوئین، کە وەکو مانگی نوێ دروەی لێ کرا. باوە ناننا، ڕێڕەوی هەڵهاتنی نوتوی دیاری کرد.
گەورەی شکۆدار، شایانی تاج، سوئین. کوڕە خۆشەویستەکەی ئینلیل. ئەو خوایەی بریقەکەی گەیشتە ...بنی ئاسمان. تریفەکەی وەکو کارا ی پیرۆز. درەوشانەوە ئەستێرەییەکەی بۆ ئەو. ئەشکەوتی چیای ڕۆشن کردەوە.
کاتێ لوگالباندا چاوی بەرەو ئاسمان بۆ سوئین هەڵبڕی بە سەر ئەودا گریا. وەکو بە سەر باوکی دا بگری، لە ئەشکەوتی چیادا دەستە پاکەکانی بۆ بەرزکردەوە:

215 - 225: "شاها! ئەی ئەوەی لە ئاسمانی دور کەس ناتوانێ بتگاتێ! سوئین، ئەی ئەوەی لە ئاسمانی دور کەس ناتوانێ بتگاتێ. شا کە حەزی لە چاکەیە و، قینی لە بەدییە! سوئین کە حەزی لە چاکەیە و، رقی لە بەدییە! چاکەیە کە خۆشی ئەهێنێ بۆ دڵی تۆ. لە داری عەرعەر، داردەستێکی گەورە، گۆپاڵێکی شاهانە بۆ تۆ ئەکرێ، تۆ کە پەیوەندیت لە گەڵ چاکە پچڕاوە و، پەیوەندیت لە گەڵ بەدیی نەپچڕاوە. تۆ ئەگەر بەدیی بانگ بکەیتە بەردەمی خۆت، بە زۆر کێشی بکەی... کاتێ دڵی تۆ بئێشێنێ، چۆن مار زەهر ئەڕێژێ تۆش ژار بە سەر بەدیی دا بکە!"

226 - 227: سوئین فرمێسکەکانی گیرا کرد ژیانی پێ دا، توانینی دا بە لاقەکانی لە سەر پێ ڕابوەستێ.

228 - 239: جاری دوەم، کە جوانەگا ڕۆشنەکە لە ئاسۆوە هەڵهات، جوانەگا لە ناو دارسەرووەکان دا ئەسوڕایەوە، قەڵغانێ لە سەر ئەرز دانرابو، لە لایەن ئەنجومەنەوە سەیری ئەکرا، قەڵغان لە گەنجینە دەرهێنرا بو، پیاوە گەنجەکان سەیریان ئەکرد.. نوتوی خۆرت تیشکی پیرۆزی لە ئاسمانەوە دابەزیوی بڵاو کردەوە، ... ئەوانەی بەخشی بە لوگالباندای پیرۆز لە ئەشکەوتی چیادا.
خوای پارێزگاری باشە بە سەریەوە وەستا، ماخوای پارێزگاری باشە لە پشتیەوە ڕۆیشت. ئەو خوایەش کە ئەوی نەخۆش خست بو بە تەنیشتی دا هەنگاوی نا. کە چاوی بەرەو ئاسمان بۆ ئوتو هەڵبڕی، بە سەر ئەودا گریا وەکو بە سەر باوکی دا بگری، لە ناو ئەشکەوتی چیادا دەستە پاکەکانی بۆ بەرز کردەوە:

240 - 263: "ئوتو! شوانی وڵات، باوکی سەر ڕەشەکان، کاتێ تۆ ئەچی بۆ خەوتن، خەڵک لە گەڵ تۆ ئەچن بۆ خەوتن، ئوتوی گەنج، کاتێ تۆ لە خەو هەڵئەستی، خەڵک لە گەڵ تۆ لە خەو هەڵئەستن.
ئوتو! بە بێ تۆ، لە دەرەوە هیچ تۆڕێ بۆ مەل دانانرێ، هیچ کۆیلەیەک لە دەرەوە بە دیل ناگیرێ. بۆ یەکێ کە بە تاکی تەنیا ئەڕوا، تۆ هاوڕێی برایانەی ئەوی. ئوتو تۆ سێیەمی ئەوانەی بە جوتە سەفەر ئەکەن. تۆ چرای بۆ ئەوانەی گەردانەیان لە ملدایە.
وەکو بەرگی زولوەهی پیرۆز، هەڵهاتنی خۆرەکەت جل ئەکاتە بەری هەژاران و داماوان، ڕوتوڕەجاڵ پۆشتە ئەکاتەوە، کەوایەکی ناودامانی خوری سپیە لەشیان داپۆشی تەنانەت هی کۆیلەی کڕدراویش.

پیرەپیاوانی زەنگین، وەکو پیرەژنەکان بە خۆشیەوە ستایشی خۆرهەڵهاتنەکەت ئەکەن، تا دواکاتی ڕۆژئانیان خۆرهەلاتنەکەت ئەوەندەی ڕۆن کاریگەرە.
گاکێویە گەورەکان رایان کرد بۆ پێشەوە.
قارەمان، کوڕی نینگال، .. بۆ تۆ
....
برای.. براکەی ئەو..... بە شیرینی ستایشی کردی، گەیشتە ئاسمان. قارەمان، کوڕی نینگال، ئەوانە ستایشت ئەکەن چۆن تۆ شایانی ئەوەی.

264 - 275: لوگالباندای پیرۆز لە ئەشکەوتی چیا هاتە دەرەوە. سەرڕاستەکە لە گەڵ ئینلیل راوێژی کرد، ئەمامی رزگاری ژیان لە دایکبو. روباری رەوان، دایکی گردەکان، ئاوی رزگاری ژیانی هێنا. دوای ئەوەی گازی لە ئەمامی رزگاری ژیان گرت، دوای ئەوەی قومی لە ئاوی رزگاری ژیان دا، لێرە لە شوێنەکەی خۆی لە سەر ئەرز تەڵەی دایەوە، ئەوسا لەو شوێنەوە وەکو ئەسپی شاخ. وەکو ماکەری کێویی تەنیای کاکان بە سەر چیاکان دا بە خێرایی ڕۆیشت. وەک کەرێکی زەبەلاحی خورت، کەرێکی لەڕ، رای کرد، بە ئارەزوی غاردانەوە، بە درێژایی ڕێگە هەڵبەزیەوە.

276 - 299: ئەو شەوە لە ئێوارەوە، بە هەڵەداوان بە ناو شاخەکان دا، بە چۆڵەوانی دا، لە ژێر تریفەی مانگەشەو دا کەوتە جوڵان. ئەو بە تەنیا بو، سەرەڕای چاوە تیژەکانی، یەک کەسی لێ نەبو ببینێ. توێشویەکێ پێ بو کە لە هەمانەدا هەڵگیرا بو، خۆراکێ کە خرابوە پێستەوە.
براکانی و هاوەڵەکانی ئەیانتوانی نان ببرژێنن لە سەر ئەرز، بە هەندێ ئاوی ساردەوە. لوگالباندای پیرۆز شتەکانی کە لە ئەشکەوتی شاخەوە هەڵی گرت بو. لە تەنیشت کۆتەرەیەکەوە دانا. سەتڵەکەی پڕ کرد... لە ئاو. لە بەرچاوی ئەو ئەوەی دایئابو بڵاو کردەوە. هەندێ بەردی هەڵگرت... چەند جارێ پێکەوە ریزی کردن. خەڵوزە داگیرساوەکانی لە سەر ئەرزی کراوە دانا. بەردەئەستێ جوانەکان پریشکیان دا. ئاگرەکەی لە دەرەوە بۆ ئەو لە ناو چۆڵەوانی دا وەکو ڕۆژ هەڵهات.
ئەی ئەزانی چۆن نان یا خەپلە ببرژێنی، ئەی ئەزانی تەنور چۆنە، بە تەنیا حەوت خەڵوز هەویری گیزیکەتای برژاند. لە کاتێک دا نانەکە خۆی ئەبرژا، زەلی کولەی چیای هەڵکێشا، رەگەکانی و هەمو لقەکانی هەڵپاچی. هەمو خەپلەکانی وەکو توێشوی ڕۆژ هەڵگرت.
ئەی ئەزانی نان یا خەپلە چۆن ئەبرژێ، ئەی ئەزانی تەنور چۆنە، تەنیا بە حەوت خەڵوز هەویری گیزیکاتای برژاند. دۆشاوی شیرینی خورمای تێ هەڵسو.

300 - 313: گاکێویەکی قاوەیی، گاکێویەکی جوان، گایەک قۆچەکانی راتەوەشان، گایەک لە برسانا، ئەسوڕایەوە، لە گەڵ گاکێویە قاوەییەکانی گردەکان، ئەیوڕان و ئەگەڕا بۆ شوێنێکی خۆش.. لەم ڕێگایەدا جیمگیکی بۆنداری ئەجو وەک جۆ بێ، داری سەروی ئەهاڕی... وەکو گیای ئیسپارتو بێ... بە لوتی بۆنی گەڵای دەوەنی سینوبی ئەکرد وەک گیا بێ. ئاوی روباری رەوانی ئەخواردەوە، بە ئیلینوک، ئەمامە پاکەکانی چیا، قرقینەی ئەدایەوە.
لە کاتێک دا گاکێویە قاوەییەکان، گاکێویەکانی شاخ، لە ناو ئەمامەکان دا... ئەگەڕان، لوگالباندا ئەو یەکەیانی لە بۆسەکەی دا گرت...

دارعەرعەری شاخی لە بن دا هەڵکەند، لقەکانی لێ داماڵی. لوگالباندای پیرۆز رەگەکانی، کە وەکو زەلی کێلگەکان دریژ بون، بە چەقۆ هەڵپاچی. بەوە گاکێویە قاوەییەکە، گاکێویەکەی شاخی، بەستەوە.

314 - 325: بزنی قاوەیی و بزنی دایکانە، بزنی کێچاوی، بزنی رشکن، پەریشان بون... لەم ریگایەدا جیمگیکی بۆنداریان ئەجو وەک جۆ بێ، داری سەرویان ئەهاڕی... وەکو گیای ئیسپارتو بێ... بە لوت بۆنی گەڵای دەوەنی سینوبییان ئەکرد وەک گیا بێ. ئاوی روباری رەوانیان ئەخواردەوە، بە ئیلینوک، ئەمامە پاکەکانی چیا، قرقێنەیان ئەدایەوە.
لە کاتێک دا بزنی قاوەیی و بزنی دایکانە لە ناو ئەمامەکان دا ئەگەڕان، لوگالباندا هەردوکیانی لە بۆسەکەی دا گرت...
دارعەرعەری شاخی لە بن دا هەڵکەند، لقەکانی لێ داماڵی. لوگالباندای پیرۆز رەگەکانی، کە وەکو زەلی کێلگەکان دریژ بون، بە چەقۆ هەڵپاچی. بەوە بزنە قاوەییەکە و بزنە دایکانەکە، هەردو بزنی، بەستەوە.

326 - 350: ئەو بە تەنها بو، بە چاوە تیژەکانی تەنانەت تەنیا یەک کەسی بە دی نەئەکرد.
شا لە شیرین خەودا بو... نوستن: مەڵبەندی ستەمکاری، وەک سێڵاوێ کە هەڵبستێ، وەک دەستێ کە دیواری خشت هەڵ بوەشێنێ، دەستێ بەرز بێتەوە، قاچێ بەرز بێتەوە، وەک دۆشاو لە بەردەم ئەودا، وەکو دۆشاو کە لە بەردەم ئەودا بو سەرریژ بکا، نە چاودێر ئەناسێ، نە کاپتان، ئەمە هێزێکی زۆرە بۆ پاڵەوان. بە هۆی کاسە دارینەکەی ئینکاسی دوە سەرەنجام خەو بە سەر لوگالباندا زاڵ بو. ئیلینوک، پوشی نەرمی شاخی، وەک جاجم راخست، پۆپەشمینی زولومەی بڵاو کردەوە، لەوێ مەوجی سپی کەتانی دا بە خۆی دا. لەوێ... ژوری خۆشتنی لێ نەبو، ئەو لەو شوێنە دروستی کرد.
شا خۆی دا بو بە ئەرزا نەک بۆ خەوتن، بەڵکو پاڵکەوت بو بۆ خەوبینین... نەک بۆ گەڕانەوە لە بەردەرگای خەوبینین، نەک بۆ گەڕانەوە لە لای گرێژەنەی دەرگاکەیەوە، ئەو (خەون) درۆ بۆ درۆزن ئەکا، راستی بە راستگۆ ئەڵێ. ئەتوانێ یەکێ بەختیار بکا، ئەتوانێ یەکێکی کە بخاتە گۆرانی، بەڵام ئەمە سەبەتەی تەختەی داخراوی خواکانە. خەوتنگای قەشەنگی نینلیل ە. راوێژکاری ئینانا. زاووزێکەری مرۆڤێتی.. دەنگی یەکێکە کە زیندو نیە ... زانگارا، خوای خەونەکان، خۆی وەکو جوانەگا بۆڕانی، بۆڕانی بە سەر لوگالباندا. وەکو گۆلکی مانگا بۆڕانی:

351 - 360: "ئەوەی گاکێویی قاوەیی بۆ من سەرئەبڕێ، ئەوەی چەوریەکەی بۆ من ئەتوێنێتەوە، ئەوە ئەبێ تەورەکەی من، کە لە ئاسنی باشە بیبا، ئەبێ نێزە ئاسنینەکەی من بە کار بهێنێ .وەک وەرزشکار گاکێویە قاوەییەکە بهێنێ، گاکێویە قاوەییەکەی شاخ، وەکو زۆرانگر بکاتە ژێردەستەی خۆی. برستی لێ ببڕێ، ئەگەر پێش هەتاوکەوتن ئامادەی بکا، سەری بزنی قاوەیی و سەری بزنی دایکانە، وەکو دەنکی جۆ سەری هەردو بزن تۆپەڵ بکا، خوێنەکەیان برژێنێتە ناو چاڵێکەوە تا بۆنەکەی بە بیابان دا بڵاو بێتەوە. مارە زیتەکانی شاخەکان لە بیابان دا بۆنی بکەن و وریا ببنەوە."

361 - 370: لوگالباندا خەبەری بوەوە.. ئەوەی دی بوی خەون بو. هەڵ لەرزی.. خەوی دی بو. چاوی خۆی هەڵ گلۆفی، ترسێکی زۆری لێ نیشت. تەورەکەی کە لە ئاسنێکی باش بو هەڵگرت، نێزە ئاسنینەکەی کە لە ئاسن بو دەر هێنا. وەک وەرزشکار گاکێویە قاوەییەکە، گاکێویەکەی شاخی، هێنا وەک زۆرانگر کردی بە

ژێردەستە. بڕستی لێ بڕی. پێش هەتاوکەوتن ئامادەی کرد. سەری بزنە قاوەیی و سەری بزنی دایکانەکە، وەک دەنکەجۆ سەرەکانی هەردو بزنی، تۆپەڵ کرد خوێنەکەیانی ڕژانە ناو چاڵێکەوە، بۆنەکەی بە ناو بیابان دا بڵاو بوەوە. مارە زیتەکانی شاخەکان بۆنیان کرد و وریا بونەوە.

371 – 393: کاتێ خۆر هەڵات... لوگالباندا، بە ناوی نینلیل هوە بانگهێشتی کردن. نان، نینلیل، ئینکی، نینهورساگ، لە سەر خوان دانیشتن.
لە شوێنێکی شاخ کە ئەو ئامادەی کرد بو. سفرە ڕاخرا، خواردنەوەکانی تێ کرد... بیرەی خەست، خواردنەوەی کهولی، بیرەی ڕون، شەرابی تامخۆش، ئاوی ساردی وەک شەراب، هەموی ڕشتە سەر تەختاییەکە. چەقۆی خستە سەر گۆشتی بزنە قاوەییەکە، جگەرە ڕەشەکەی برژاند. دوکەڵەکەی بەرز بوەوە، وەک بوغوردی سەر ئاگر. وەک دومموزی لە گەورەی ئاژەڵەوە بۆن و بەرامەی خۆشی هێنا بێ،
ئاوا ئان، ئینلیل، ئینکی، نینهورساگ، باشترین بەشی ئەو خواردنەی کە لە لایەن لوگالبانداوە ئامادە کرا بو خوارد.
وەک شوێنی هەڵهاتنی هێزی پاک، قوربانیگای پیرۆزی سوئێن... قوربانیگای ئوتو و قوربانیگای سوئێن... هەردو قوربانیگای بە لاجیوەرد ڕازانەوە... هی ئینانا، سوئێن.. ئەی ئان کار مەڵەی کرد... ئەو کاتەی ئەو مەڵەی کرد، هەمو خەپلەکانی بە جوانی دانا بو.
(هەندێ لەم دێڕانەی نوسینەکانی سەر سواڵەتەکان، بە هۆی شکان و سوان و ڕوشانەوە، فەوتاون، بۆیە ساخکردنەوەی ڕوداوەکانی ئەم بەشەی لاوژەکە، تا ڕونوسێکی تری تەواوی ئەدۆزرێتەوە، دژوارە)

394 – 432: ئەوان ئەیکەن... ئینکی، باوکی خواکان، ئەوانن... ئەوان.. ، وەک چۆن کشتەکی ڕستەی هەنجیر شۆڕ بوبێتەوە... قۆڵیان هەڵواسیوە. ئەوان ئاسکی سوئێن لە هەوا دا ڕائەکەن، ئەوان جلی لوسی ئەرمی نینلیلن، ئەوان یارمەتیدەری ئیکورن. کەتانی زەردباو کۆ ئەکەنەوە، جۆ کۆ ئەکەنەوە، ئەوانە گیانداری، کێوین بەلەسە بون، ئەوانە وەک گەردەلولن هەڵیان کردۆتە سەر وڵاتی یاخی کە سوئێن ڕقی لێیانە، بەڕاستی ئەوانە وەک گەردەلول هاتونەتە خوارێ، بە درێژایی ڕۆژی درێژ پاڵ ئەکەون، بە شەوی کورت ئەچنە... ناو خانوەکانەوە؟ بە ڕۆژی درێژ و بە شەوی کورت، لە جێدا کەوتون، ئەیدەن... لە .. کپی شەودا گۆرانی ئەڵێن... .... هەڵلوشینی ئوتو، خانو لە دوای خانو تێ ئەچن... شەقام لە دوای شەقام ڕائەکەن، ئەوانە قسەکەرن... ئەوانە وەڵامدەرەوەی قسەکەرەکانن، ئەگەڕێن بۆ وشە لە گەڵ دایکێ، وەڵامی خانمی گەورە بداتەوە، ... لە لای تەختی خەودا پاڵدانەوە، توشیان ئەکەن... کاتێ ڕەش.. ئەدزرێن... بە جێی ئەهێڵن... دەرگا و مێزی مرۆڤ، ئەوان ئەیگۆڕن... ئەوان شیپانەی دەرگاکان بە یەکەوە ئەبەستنەوە. پاڵەوانەکە کە... ئوتو کە... گەنجی قارەمان ئوتو ی وشەی باش...

دوعاکان ... هی ئوتوی گەنج، ئەوەی کە ئانونا، گەورەخواکان، نایزانن، لەو کاتەوە...

433 – 461: پیری ژیری شار....
دوعاکانی ... ئوتوی گەنج کە ئانونا، گەورە خواکان، نایزانن ....

ئەوان ئەتوانن بچنە حزوری ئوتو، هی ئینلیل، خوای ... کوڕی ریشداری نینگال.. دایان بە سوئین... بە هێزی خۆیان چارەنوسی وڵاتانی بێگانەیان دیاری کرد. لە کێی شەودا بەرازی رەشی کێوییان ناسیەوە، لە نیوەرۆدا بۆ ئوتو... توانی ... دوعاکانی.

چونە ژوری بۆ بەردەم ئان، ئینلیل، ئینانا، خواکان، ئەوان زانییان... ئەوان روانییان... ئەوان... لە بەر پەنجەرەدا... دەرگا، شوێنی پاسەوانی...... راوەستان...

462 – 484: شوێنی کەوتن... ئینانا... ئەوەی کەوتۆتە بەر دڵی ئینانا، ئەوەی کە لە ئەبەردا چەقی، ئەوانە چوارده مەشخەڵی ئەبەردن... ئەوانە لە نیوەشەودا، لە کێی شەودا وەک ئاگری کێویی شوێنی کەوتن، لە دەستەیەک دا پێکەوە بروسکە ئەدەن وەک رۆشنایی، لە گەردەلولی پێویستی ئەبەردا. کە ئەرەنەرێ بەرز وەک گرمەی لافاوێکی گەورە بەرز ئەبێتەوە، ئەوانەی کەوتونەتە بەر دڵی ئینانا، ئەوانەی لە ئەبەردا چەقیون، ئەوانە حەوت بروسکەکەی ئەبەردن..، ئەوانە وا بە خۆشیەوە وەستاون وەک ئەوەی ئەو لە ژێر ئاسمانێکی ساماڵ دا تاج لە سەر بنێ، بە تەوێڵ و چاویان لە ئێوارەیەکی رون دا. گوێیان... بەڵام، لە گەڵ دەمیان ئەوان بەرازی کێوی بون ئەحەسانەوە لە ناو زەلی قامیشەڵان دا، وەستا بون لە گەرمەی ئەبەردا، بە هێزی ژیانیانەوە

کێیە لە بەر دڵی ئینانا یە، ئەوەی لە ئەبەردا چەقی، بە ئینتودی ئاسمان ئەوانە زۆر بون، بە ژیانی ئاسمان ئەوان هەڵیان گرت... دەرەوشانەوەی پیرۆزی دروشمی ئەبەرد.. ئەگاتە کەناری ئاسمان و ئەرز... ئەگات.

....

485 – 499: کاتێ ئوتو لە خەوتنگاکەی هاتە دەرەوە، گورزی ئەبەردی پیرۆزی ئان.. کە خوا لە لای پیاوێ دایناوە خوای بەدکارین بە دڵی بەدەوە.. ئەوانە.. خوان، ئەوان، وەک داننا، وەک ئوتو، وەک ئینانای پەنجا دەسەڵاتی خوایی... لە ئاسمان و لە ئەرز... ئەوان لێکدەرەوەی قسەکانی شەڕن، جاسوسی رەوایەتین

....

ئاسمانی رون و ژمارەیەکی زۆر ئەستێرە

....

دارکاژی تازە لە چیاکانی دارسەرو دا... تۆڕی جەنگین لە ئاسۆوە تا بنی ئاسمان.

## لاوژەی
## لوگالباندا و مەلی ئانزود

1 – 27: لوگالباندا لە چیاکان، لە شوێنە دورەکان، سەرگەردان داما بو، ملی نا بۆ ناو چیاکانی زابو. نە دایکی نە گەڵ بو مۆچیاری بکا، نە باوکی لە گەڵ بو قسەی لە گەڵ بکا، نە کەسی لە گەڵ بو بیناسێ و، رێزی بگرێ، هاورازێکی لێ نەبو لە گەڵی بدوێ. لە دڵی خۆی دا لە گەڵ خۆی ئەدوا:

"ئەبێ لە گەڵ مەل رەفتارێ بکەم شایانی بێ، ئەبێ لە گەڵ ئانزود رەفتارێ بکەم شایستەی ئەو بێ. ئەبێ دروێکی خۆشەویستانە لە هاوسەرەکەی بکەم. ئەبێ هاوسەری ئانزود و منالەکانی ئانزود لە سەر خوانێ دابنیشێنم. ئان لە ماڵەکەیەوە لە چیا، نینگوانانا، بنێرێ بۆ لام .. ژنە پسپۆڕەکە، کە متمانە بۆ دایکی

ئەگێڕێتەوە. نینکاسی پسپۆڕ، کە متمانە بۆ دایکی ئەگێڕێتەوە: کوپەی ترشاندنی لە لاجیوەردی سەوزە و، جامی بیرەکەی لە زیو و زێڕی پاڵاوتەیە. ئەگەر لە لای (کوپەی) بیرەکەوە رابوەستێ، خۆشیی ئەهێنێ. ئەگەر لە لای (گۆزەی) بیرەکەوە دابنیشێ، شادیی ئەهێنێ، مادامەوان بیرە تێکەڵاو ئەکا، لە هاتن و گەڕانەوەی ئەمسەر و ئەوسەر ماندو نابێ، نینکاسی کە گۆزەی بیرەی بە لاوەیە و، کیتەڵەیەکیش وا بە سەر کەلەکەیەوە، بەزمی بیرەنۆشینەکەم خۆش ڕێک ئەخا. کاتێ مەل بیرەی خواردەوە و شادمان بو، کاتێ ئانزود بیرەی خواردەوە و شادمان بو، ئەوسا ئەتوانێ رێنوێنیم بکا ئەو شوێنە بدۆزمەوە کە هێزەکانی ئوروگ بۆی چون. ئانزود ئەتوانێ بمخاتە سەر شوێنپێی براکانم."

27 – 49: ئێستا دار هەڵۆی ئینکی لە سەر لوتکەی چیای ئینانا ی ئاقیقی رەنگاورەنگ، کە لە سەر ئەرز وەکو بورج وەستاوە، گەشاوەیە و لقوپۆپەکانی وێنەی دارو ە. سایەی سێبەرەکەی وەکو کەوا بەرزایی چیاکانی داپۆشیوە و وەکو کراسی ناودامان بە سەری دا دراوە. رەگەکانی وەکو ماری ساجکال لە روبارەکەی نوتو ی حەوت زار دایە.

لەو نزیکە، لەو شاخانەی کە دارسەرویان تێدا دارِوێ، کە ماری تێدا داخشێ، کە دوپشکی تێدا داکشێ، لە داوقەدی شاخەکان دا مەلی بورو ئاز هێلانەی کرد و هێلکەکانی تێدا دانا.

لەو نزیکە، مەلی ئانزود بەچکەکانی لە ناو هێلانەیەک دا جێگیر کرد، کە لە چڵوچێو دروست کرا بو، لە چڵوچێوی داری عەرعەر و درەختی زەنوێر، مەل کەپرێکی فراوانی چیلکەی دروست کرد بو.

کاتێ مەل لە بەرەبەیان دا خۆی کێشایەوە، کاتێ ئانزود چریکانی، بەو چریکەیە زەمینی چیاکانی لولوبی لەرزان. ددانی ئەهەنگ و چنگی هەڵۆی هەبو. لە ترسا گاکێویەکان هەڵیان تیزان بۆ گردەکان و ئاسکەکان رەوینەوە بۆ چیاکان.

50 - 89: لوگالباندا کارزانە، کارەکانی ژیرانە ئەنجام داوە. لە ئامادەکردنی خەپلەی شیرینی خوایی دا وریایی خستە سەر وریایی. هەویری لە گەڵ هەنگوین شێلا، هەنگوینی زیاتری تێ کرد. لە پێش زەرنەقوتەکانی دا دانا، لە پێش جوچکەکانی ئانزودا، قاورمەی دایە بەچکەکان بیخۆن. پرپوڵەی کرد بە دەنوکیان دا. جوجەڵەکانی ئانزود ی لە هێلانەکەیان دا جێگیر کرد، چاوی بە کل رشتن، گوڵاوی دارسەروی سپی بە سەر دا پژاندن، دابۆڵەی قاورمەی بۆ دانان.

خۆی لە هێلانەکەی ئانزود کشایەوە، لە چاوەروانی ئەودا لە شاخەکان، کە دارسەروی لێ دارِوێ، راوەستا.

لەو کاتەدا مەل گاکێویەکانی گلێر ئەکردەوە، ئانزود گاکێویەکانی گلێر ئەکردەوە. بە چنگ گا زیندوەکەی هەڵگرتبو، مردارەکەشی هاویشت بوە سەر شانی. بە قەد دە گور ناو زەرداوی بە سەردا رژاندن.

مەل جارێک بە دەوری دا فڕی، ئانزود جارێک بە دەوری دا فڕی. کاتێ بانگی لە هێلانەکەی کرد، کاتێ ئانزود بانگی لە هێلانەکەی کرد، جوجەڵەکانی لە هێلانەکەیەوە وەڵامیان نەدایەوە، بەچکەکانی لە هێلانەکەیانەوە وەڵامیان نەدایەوە.

پێشان، ئەگەر مەل بانگی لە هێلانەکەی بکردایە، بەچکەکانی لە هێلانەکەیانەوە وەڵامیان ئەدایەوە، بەڵام ئێستا کە مەل بانگی لە هێلانەکەی کرد، بەچکەکانی لە هێلانەکەوە وەڵامیان نەدایەوە. مەل زریکەیەکی خەمناکی دەربڕی گەیشتە ئاسمان، ژنەکەی زریکانی "وەی"، زریکەکەی گەیشتە ئابسو. مەل بەم زریکەی "وەیە" و ژنەکەی بەو زریکە خەمناکە، ئانونا، خوای شاخەکانی، وا لێ کرد وەکو مێروولە بە سکەخشکێ بچێتەوە بۆ ناو کونەکەی. مەل بە ژنەکەی ئەڵێ، ئانزود بە ژنەکەی ئەڵێ:

"روناوێکی شوم لە هێلانەکەم قەوماوە، وەکو ئەوەی بە سەر تەویلە گەورەکەی ئانانا هات. تۆقین باڵی بە سەر دا کێشاوە، ئەڵێی گاکێویەکان شەڕەقۆچیانە. کێ منداڵەکانی منی لە هێلانەکەم بردوە؟ کێ ئانزودی لە هێلانەکەی دەرهێناوە؟"

90 – 110: بەڵام بۆ مەل دەرکەوت، کاتێ روی کردەوە هێلانەکەی. بۆ ئانزود دەرکەوت، کاتێ روی کردەوە هێلانەکەی، کە وەکو نشینگەی خواکانی لێ کراوە. بە قەشەنگی رازێنراوەتەوە. بەچکەکەی لە هێلانەکەی دا جێگیر کراوە، چاوی بە کل رێژراوە، دڵۆپە گوڵاوی دارسەروی سپی بە سەردا کراوە، بابۆڵەی قاورمە بە ژورسەریەوە هەڵواسراوە. مەل شادمانە، ئانزود شادمانە:

"من ئەو میرەم کە چارەنوسی روباری رەوان بڕیار ئەدەم. من دروستیی رێبازی بەرز و نزمی پێرەوانی ئەنجومەنی ئینلیل ئەپارێزم. باوکم، ئینلیل، منی هێناوە بۆ ئێرە. ئەو منی لە بەر دەرگای شاخەکان دا، لە بەر دەروازەی گەورە دا، بە راگر داناوە.

من ئەگەر چارەنوسێ دابنێم کێ ئەتوانێ بیگۆڕێ؟

من ئەگەر قسەیەک بکەم، کێ ئەتوانێ لێی لا دا؟

کێیە! ئەوەی هێلانەکەمی وا لێ کردوە؟

ئەگەر تۆ خوای، من لە گەڵت ئەدوێم، بە راستی ئەبمە هاورێت!

ئەگەر تۆ پیاوی، چارەنوست دیاری ئەکەم، ناهێلم لەم شاخانەدا هیچ ملۆزمێکت هەبێ!

تۆ ئەبی بە پاڵەوانێ، ئانزود پشتیوانت ئەبێ."

111 – 131: لوگالباندا، بەشێکی لە ترس دا و بەشێکی لە خۆشی دا، بەشێ لە ترس و بەشێ لە خۆشیەکی قوڵ، پەسنی مەلی ئەدا، ستایشی ئانزودی ئەکرد:

"مەل بە چاوی پرشنگدارەوە، لەم ناوچەیەدا لە دایک بوە، ئانزود بە چاوی پرشنگدارەوە، لەم ناوچەیەدا لە دایک بوە، خۆشحاڵی وەکو لە گۆم دا مەلە بکەی. باپیرەت، میری هەمو میرایەتیەکان، ئاسمانی لە ناو لەپی دەستی تۆدا داناوە و، ئەرزی خستۆتە بەر پێت.

باڵەکانی تۆ وەکو تۆڕی مەل بە ناو هەوری ئاسمان دا بڵاوە!....

چنگەکانی تۆ لە سەر ئەرز ئەڵێی تەڵەیە بۆ گاکێوی و مانگاکێوی شاخەکان نراوەتەوە!

بڕبڕاگەت راستە وەکو ستونی نوسەر!

سنگی تۆ کە ئەفڕی وەکو نێرا ناو دو شەق ئەکا!

پشتیشت ئەڵێی باخی زەنوێری خورمایە، دیتنی هەناسە سوار ئەکا.

دوێنێ بە سەلامەتی رام کرد بۆ لای تۆ، لەوساوە ئێتر متمانەم بە تۆ داوە بمپارێزی. هاوسەرەکەت ئەشێ بە دایکم بێ" (ئەو وتی)، "ئەشێ تۆ بە باوکم بی" (ئەو وتی)، "لە گەڵ بچوکەکانیشت وەکو برای خۆم رەفتار ئەکەم.

لە دوێنێوە، لەو شاخانەی دارسەرویان لێ دارووێ، لە چاوەڕوانی تۆ دام. با هاوسەرەکەت بە تەنیشت تۆوە رابوەستێ تا دروەم لێ وەربگرێتەوە. من دروەی خۆم پێشکەش بە تۆ ئەکەم و، تۆش جێ ئەهێڵم چارەنوسی من بڕیار بدەی."

132 - 141: مەل لە بەرامبەر ئەودا خۆی نواند، بەو خۆشحاڵ بو، ئانزود خۆی لە بەردەم ئەودا نواند، بەو خۆشحاڵ بو. ئانزود بە لوگالباندا ی پاکی وت:
" لوگالبانداکەی من! ئێستا وەرە. برۆ وەک بەلەمێکی پڕ لە مەعدەنی گرانبەها، وەک بارخانەی دانەوێڵە، وەک بەلەمێ ئەچێ بۆ گواستنەوەی سێو، وەک بەلەمێ بارە خەیاری تێدا کەڵەکە کرابێ..... وەک بەلەمێ لە سەر خەرمان پڕ کرابێ. بە سەربەرزی بگەڕێرەوە بۆ کولابا ی بە خشتکراو!"
لوگالباندا کە حەزی لە یەکەمیە ئەمەی پەسەند نەکرد.

142 - 148: وەکو کارا، کوڕە خۆشەویستەکەی ئینانا، وەک تیشکی خۆر تیرە تیژەکەت بهاوێژیی، وەکو تریفەی مانگ تیرە قامیشیەکەت بهاوێژی، وەک ماری شاخدار تیرە تیژەکەت بگەزێ! وەک چەپەجاخ ماسی بکوژێ، ئەشێ ئەوانە بڕینی جادویی بێ! ئەشێ تۆ ئەوانە بکەی بە دەستەوارەیەک هێزم، تەورئاسا بڕندە بێ..."
لوگالباندا کە حەزی لە یەکەمیە ئەمەی پەسەند نەکرد.

149 – 154: ڕەنگە نینورتا، کوڕەکەی ئینلیل، کڵاوشێری ئەبەرد بکاتە سەرت، زرێ بکاتە بەرت، بە جۆرێ، لە کێوە گەورەکان دا لە شکاندن نەیەیت! ڕەنگە تۆ ... تۆڕی ئەبەرد دژی دوژمن! کاتێ ئەچی بۆ شار ...!"
لوگالباندا کە حەزی لە یەکەمیە ئەمەی پەسەند نەکرد.

155 – 159: مەشکە بە بەرەکەتەکەی کەرەتاوی پیرۆزی دوموزی، کە چەوریەکەی چەوریی هەمو دنیایە، بە تۆ ببەخشرێ. شیرەکەی کە شیری هەمو دنیایە. بە تۆ ببەخشرێ."..
لوگالباندا کە حەزی لە یەکەمیە ئەمەی پەسەند نەکرد.
وەک مەلی کیب، وەک ئاوی ڕەوانی کیب، کە بە درێژایی گۆمەکە ئەڕوا، ئەو بە قسە وەڵامی دایەوە.

160 - 166: مەل گوێی لێ گرت. ئانزود بە لوگالباندا ی پاکی وت:
"ئێستا سەیرکە، لوگالبانداکەم. جارێکی تر بیری لێ بکەرەوە. ئەمە وەکو ئەوە وایە: گاجوتێ جەنەی کرد بێ بگەڕێنرێتەوە سەر ڕێ، ماکەرێ سینی کرد بێ بخرێتەوە سەر ڕاستەرێ. هێشتا، من ئەوەت پێ ئەبەخشمەوە کە تۆ بۆ منت داناوە. من چارەنوسێ بۆ تۆ دیاری ئەکەم کە خۆت گەرەکتە."

167 – 183: لوگالباندا ی پاک بەرسڤی دایەوە:
"وا بکە لاقم دەوان بێ، مەهێڵە هەرگیز ماندو بێ! باسکم بەهێز بێ و، بە پانی بڵاوی بکەمەوە، مەهێڵە باسکم هەرگیز لاواز بێ! وەک تیشکی خۆر بجوڵێم، وەک ئینانا، وەک حەوت گەردەلولەکەی ئیکور، وەک بڵێسە قەڵەمباز بدەم، وەک ڕۆشنایی بدرەوشێمەوە، بچم بۆ ئەو شوێنەی بۆی ئەڕوانم، پێ دابنێم لەو شوێنەی چاوی تێ ئەبڕم، بگەم بەو شوێنەی دڵم ئارەزویەتی، کەوشەکانم لەوێ دابکەنم کە دڵم ناوی بۆ لێ ناوم! کاتێ ئوتو ئەهێڵێ بگەمەوە شارەکەم کولابا، مەهێڵە ئەوەی ئەفرینی لێ کردوم لەوێ بەوە دڵی خۆش بێ، ئەوەی حەز ئەکا لە گەڵ من تەقەلا بدا، مەهێڵە هەرگیز پێم بڵێ: "لێ بگەڕێ با بێ!" خۆم دارتاشێکم هەبێ کە پەیکەرێ بۆ تۆ دابتاشێ، ئەگەر سەیری بکەی هەناسەت سوار ببێ. ناوەکەت لێرە لە سومەر بەناوبانگ ببێ. متمانە بگەڕێتەوە بۆ پەرستگاکانی خوا مەزنەکان."

184 – 202: ئانزود بە لوگالباندای پاکی وت:
"با لاقت دەوان بێ، هەرگیز ماندو نەبێ! باسکت بەهێز بێ و، بە پانی بلاّوی بکەیتەوە، باسکت هەرگیز لاواز نەبێ! وەک تیشکی خۆر بجولێی، وەک ئینانا، وەک حەوت گەردەلولەکەی ئیکور، وەک بلێسە قەڵەمباز بدەی، وەک رۆشنایی بدرەوشێیتەوە، بچی بۆ ئەو شوێنەی بۆی ئەروانی، پێ دابنێی لەو شوێنەی چاوی تێ ئەبڕی، بگەی بەو شوێنەی دڵت ئارەزویەتی، کەوشەکانت لەوێ دابکەنی کە دڵت داوی بۆ لێ داوی! کاتێ ئوتو هێشتی بگەیتەوە شارەکەت کولابا، ئەوەی ئەفرینی لێ کردوی لەوێ بەوە دڵی خۆش نەبێ، ئەوەی حەز بکا لە گەڵ تۆ تەقەلا بدا، هەرگیز پێت ئەڵێ: "لێ بگەرێ با بێ!" خۆت دارتاشێکت هەبێ کە پەیکەرێ بۆ من دابتاشێ، ئەگەر سەیری بکەم هەناسەم سوار ببێ. ناوەکەم لە وێ لە سومەر بەناوبانگ ببێ، متمانە بگەرێتەوە بۆ پەرستگاکانی خوا مەزنەکان."

203 - 219: لە دەستی دا توێشوەکەی وەکو نەخورا بێ و، چەکەکانیشی یەک بە یەک هەڵگرت. ئانزود بە بەرزی فڕی، لوگالباندا بە سەر ئەرزا ئەرۆیشت. مەل لە سەرەوە ئەیروانی، چاودێری هێزەکانی ئەکرد. لوگالباندا‌ش، لە ژێرەوە ئەیروانی، چاودێری ئەو تەپوتوزەی ئەکرد کە لێیان هەڵئەستا. مەل بە لوگالباندای وت:
" لوگالباندا کەی من! ئێستا وەرە، هەندێ ئامۆژگاریت ئەکەم، ئەبێ پێرەوی ئامۆژگاریەکانم بکەی. هەندێ قسەت پێ ئەڵێم، ئەبێ لە بیرت بمێنێ. ئەوەی پێم وتی، ئەو چارەنوسەیە کە بۆم دیاری کردوی، ئەوە بە هاورێکانت مەڵێ، ئەوە بۆ براکانت رون مەکەرەوە: "بەختی باش هەڵە ئەشارێتەوە." ئەوە بە راستی وایە. با من بچمەوە هێلانەکەی خۆم، تۆش بچۆرەوە بۆ لای هێزەکانت."
مەلەکە بە هەڵەداوان گەرایەوە هێلانەکەی. لوگالباندا‌ش دەرچو بۆ دەرێ بەرەو ئەو شوێنەی براکانی لێ بون.

220 – 237: وەک سەقاقوش لە جێگا حەسیرە پیرۆزەکەیەوە دەربکەوێ، وەک لاهاما ی خوایەنراو لە ئابزو سەر بکەوێ، وەک یەکێ لە ئاسمانەوە هەنگاو بنێ بۆ سەرئەرز، لوگالباندا هەنگاوی نا بەرەو ناوجەرگەی هێزی هەڵبژاردەی براکانی.
براکانی چەقەچەقیان بو، هێزەکان چەقەچەقیان بو، براکانی و هاوەڵەکانی بە پرسیار شێرزەیان کرد:
"وەرە ئێستا، لوگالباندا‌کەم، دیسانەوە لێرەی! هێزەکان بە جێیان هێشتی وەک یەکێ لە شەردا کوژرا بێ. بێگومان، تۆ کەرەتاوی باشی مێگەلت نەخواردوە! بێگومان تۆ، پەنیری تازەی پەچەی رانەکەت نەخواردوە، جا چۆنە وا تۆ لەو چیا گەورانەوە هاتویتەوە، شوێنێ کەس بە تەنیا پێی دا ناروا، شوێنێ کەسی لێ نەهاتۆتەوە بۆ مرۆڤێتی؟"
دیسان براکانی و هاوەڵەکانی بە پرسیار دایان گرتەوە:
"گۆلاوی روباری چیاکان، دایکی فەر، بە پانی هەڵساون. چۆن لەو ئاوانە پەریتەوە؟ .. وەک هەڵت قوراندبێ؟"

238 – 250: لوگالباندا ی پاک بەرسڤی دایەوە:
" گۆلاوی روباری چیاکان، دایکی فەر، بە پانی هەڵساون. بە پێ هەنگاوم نا بە سەریان دا، هەڵم قوراندن وەکو لە ناوی کوندە بخۆمەوە، ئەوسا وەکو گورگ لورانم، لە مێرگەکان دا لەوەرام، وەکو کۆترە کێوی لە ئەرزەکەدا چینەم کرد، بەرۆی چیاکانم خوارد."

براکان و هاوەڵەکانی لوگالباندا باوەڕیان بە قسەکانی کرد ئەتوت پۆلە مەلی بچوکن لە یەک کۆ ئەبنەوە بە درێژایی ڕۆژ باوەشیان پێدا ئەکرد و ماچیان ئەکرد. وەکو بەچکەی گامگام بێ و لە هێلانەکەی دا هەڵنیشت بێ، خواردن و خواردنەوەیان ئەکرد بە دەمی دا. بیمارییان لە لوگالباندا ی پاک دا دەرکرد.

251 – 283: ئەوسا پیاوانی ئونوگ وەک یەک پیاو شوێنیان کەوتن. ڕێگەکەیان بە ناو گردەکان دا بڕی چۆن مار بە سەر پەڵەی گەنم دا ئەکشێ. کاتێ گەیشتنە دوریی ماوەی دو سەعاتی دوبارە لە شار، لەشکری ئونوگ و کولابا بارگەیان خست و لە سەنگەر و خەندەک دا دامەزران. لە شارەکەوە ئەتوت هەورەتریشقەیە تیر ئەباری، بەردی قۆچەقانی بە زۆری وەکو لێزمەی باران بە درێژایی ساڵ لە دیوارەکانی ئەراتاوە گڤەی ئەهات.

ڕۆژان رابوردن، مانگ درێژەی کێشا، ساڵ بە تەواوی وەرسوڕایەوە. خەرمانی زەرد لە ژێر ئاسمان دا پێ گەیشت. بە تیلەی چاو سەیری کێڵگەکانیان ئەکرد. بە زەحمەت ئەچونە سەری. بەردێکی زۆری قۆچەقانی بە درێژایی ساڵ باری بو بە سەر ڕێگەکەدا. ئەوان لە ناوێنی دیواری چیادا لە شەخەڵێکی دڕکاوی پڕ لە هەژدیها دا بون. کەس ئەی ئەزانی چۆن بگەڕێتەوە بۆ شار، کەس پەلەی ئەبو بڕواتەوە بۆ کولابا.

ئینمیرکار کوڕی ئوتو لە ناوەڕاستیان دا بو، ئەترسا و پەشۆکا بو، بەم دڵتەنگیە وەرس بو. چاوی ئەگێڕا بۆ یەکێ بۆ شاری بنێرێتەوە، چاوی ئەگێڕا بۆ یەکێ بۆ کولابا ی بنێرێتەوە. کەس پێی نەئەوت: "من ئامادەم بچم بۆ شار". کەس پێی نەئەوت: "من ئامادەم بچم بۆ کولابا".

چوە ناو میوانخانەی بێگانەکان. کەس پێی نەوت: "من ئەچم بۆ شار". کەس پێی نەوت: "من ئەچم بۆ کولابا".

لە بەردەم هێزی هەڵبژاردەدا ڕاوەستا. کەس پێی نەوت: "من ئەچم بۆ شار". کەس پێی نەوت: "من ئەچم بۆ کولابا".

بۆ جاری دوەم چوە دەرەوە بۆ میوانخانەی بێگانەکان. کەس پێی نەوت: "من ئەچم بۆ شار". کەس پێی نەوت: "من ئەچم بۆ کولابا".

لە بەر چاوی هێزی هەڵبژاردە چوە دەرەوە.

284 – 289: لە ناو خەڵکەکەدا بە تەنیا لوگالباندا هەستا پێی وت:

"شاهم، من ئەچم بۆ شار، بەڵام نابێ کەسم لە گەڵ بێ. من بە تەنیا ئەڕۆم بۆ کولابا. نابێ کەسم لە گەڵ بێ."

"ئەگەر تۆ بچی بۆ کولابا، نابێ کەست لە گەڵ بێ، تۆ بە تەنیا بچی بۆ کولابا، نابێ کەست لە گەڵ بێ."

سوێندی دا بە ئاسمان و بە ئەرز. "سوێند بخۆ کە ناهێڵی دروشمە گەورەکەی کولابا لە دەستت بکەوێ!"

290 – 321: دوای ئەوەی لە بەردەم ئەنجومەنی بانگکراودا ڕاوەستا، لە ناو ئەو کۆشکەدا کە لە سەر ئەرز وەکو کێوێکی گەورە دانرا بو، ئینمیرکار کوڕی ئوتو ڕاوێژی بە ئینانا کرد:

"جارێ لە جاران خوشکی شکۆدارم، ئینانای پاک، لە شاخەکانەوە بانگی کردم بۆ ناو دڵی پیرۆزی خۆی، منی کرد بە ناو کولابای بە خشتکراودا. لە وێ لە ئونوگ، زەلکاوی لێ بو، پڕ بو لە ئاو. لەوێ ئەرزی وشکی لێ بو، چناری فوراتی لێ ڕوا بو.

ئەوێ قامیشەڵان بو، زەلی کۆن و زەلی تازەی لێ ڕوا بو.

نینکی خوایی، کە شای ئەریدویە، قامیشە کۆنەکانی بۆ هەڵکێشام، هەمو ئاوەکەی لێ دەرهێنا.

بۆ ماوەی پەنجا ساڵ بینام کرد، بۆ ماوەی پەنجا ساڵ بڕیارم دەرکرد. ئەوسا خەڵکی مارتو، کە کشتوکاڵ نازانن، لە سومەر و ئاکاد پەیدا بون. بەڵام دیواری ئونوگ، کە وەکو تۆڕی مەل لە دەرەوەی، دریژ بۆتەوە بە ناو بیابان دا، رای گرتن.

ئینجا ئێستا، لەم شوێنەدا، کاریگەریی من لە سەر ئەو کز بوە.

هێزەکان بەستراون بە منەوە وەکو چۆن مانگا بەستراوە بە گۆلکەکەیەوە، بەڵام وەکو کوڕێ رقی لە دایکی بێ، شارەکەی بە جێ هێشتی. خوشکی شکۆدارم نینانا ی پاک لە من هەڵاتوە گەڕاوەتەوە بۆ کولابای لە خشتکراو. ئەگەر ئەو شارەکەی خۆی خۆش ئەوێ و رقی لە منە، بۆچی شارەکەی بەستوە بە منەوە؟ ئەگەر خۆ رقی لە شارەکەیە و هێشتا منی خۆش ئەوێ، بۆچی من ئەبەستێ بە شارەکەوە؟

ئەگەر یار خۆی لە من دور ئەخاتەوە ئەچێ بۆ خەوتنگا پیرۆزەکەی و، من وەکو بەچکەی ئانزود بە جێ ئەهێڵێ، ئەوسا ئەبێ ئەو هیچ نەبێ بمباتەوە بۆ ماڵ بۆ کولابای بە خشتکراو: ئەو رۆژە من رمەکەم ئەنێمە لاوە و، ئەویش قەڵغانەکەم وردوخاش بکا.

ئەم قسانە بکە بۆ خوشکی شکۆدارم، ئینانا ی پاک."

322 – 344:..؟ لوگالباندا ی پاک لە کۆشک هاتە دەرەوە.

ئەگەرچی براکانی و هاوەڵەکانی پێی وەڕین وەکو چۆن بە سەگێکی نامۆ کە بیەوێ بچێتە ناو سەگەلەوە ئەوەڕن، وەکو کەرەکێویەکی ناوەکی بە شانازیەوە بیەوێ بچێتە ناو کەرگەلەوە هەنگاوی نا.

"هەندێ کەسی کە بنێرە بۆ ئونوگ بۆ لای ئاغا" ...

" من بە تەنیا ئەڕۆم بۆ کولابا بۆ لای ئینمیرکار کوڕی ئوتو. نابێ کەسم لە گەڵ بێ" ... چۆن ئەو قسەی بۆ کردن!

"بۆچی تۆ بە تەنیا ئەڕۆی ناتەوێ لەو سەفەرەدا کەس هاوڕێیەتیت بکا؟ ئەگەر گیانی خێرخوازانەی ئێمە لەوێ لە گەڵ تۆ نەوەستێ، ئەگەر خوای باشەی پارێزگاری ئێمەت لە گەڵ نەیەت بۆ ئەوێ، تۆ هەرگیز جارێکی تر لێرەدا کە لێی راوەستاوین لە گەڵ ئێمەدا راناوەستی، تۆ هەرگیز جارێکی تر لە گەڵ ئێمە نیشتەجێ نابی لەو شوێنەی ئێمەی لێ نیشتەجێین، تۆ هەرگیز جارێکی تر پێ لە سەر ئەو ئەرزە دانانێی کە پێی ئێمەی لە سەرە. تۆ لە شاخە گەورەکان نایەیتەوە، کە کەس بە تەنیا بۆی ئەچوە، کەسی لێوە ئەهاتۆتەوە بۆ مرۆڤێتی!"...

"کات تێ ئەپەڕێ، من ئەزانم. کەس لە ئێوە لە سەر ئەرزی فراوان لە گەڵ من نایەت."

لە کاتێک دا دڵی براکانی بە بەرزی تریەی ئەهات، لە کاتێک دا دڵی هاوەڵەکانی داخورپا بون، لوگالباندا توێشوەکەی لە ناو دەستی دا وەکو نەخورا بێ، چەکەکانیشی یەک بە یەک هەڵگرتبو. لە بناری چیاکانەوە، بە سەر چیا بەرزەکان دا، بەرەو تەختایی ئەرز، لە دامێنی ئانکان هوە بۆ لوتکەی ئانکان، پێنج، شەش، حەوت، کێوی بڕی.

345 – 356: لە نیوەشەودا، بەڵام بەر لەوەی خوان بۆ نینانای پاک دابنرێ، ئەو بە خۆشیەوە پێی نایە کولابای بە خشتکراو. خانمەکەی ئەو، نینانای پاک، لە سەر دۆشەکێ دانیشت بو. ئەم لە سەر ئەرزەکە کڕنوشی برد و بە چۆک دا هات .

نینانا بە چاو سەیری لوگالباندا ی پاکی کرد، وەکو سەیری شوانی ئاما – ئوجومگالانا بکا. ئینانا بە دەنگ قسەی بۆ لوگالباندا ی پاک کرد، وەکو قسە بۆ کوڕەکەی، ئاغا کارا، بکا:

"وەرە ئێستا، لوگالبانداکەم، چی هەواڵت لە شارەوە هێناوە؟ چۆن لە ئەراتا وە بە تەنیا هاتیتەوە بۆ ئێرە؟"

357 – 387: لوگالباندا ی پاک بەرسڤی دایەوە:

"ئەوەی ئینمیرکار کوڕی ئوتو وتی و ئەوەی ئەو وتویەتی، ئەوەی براکەت وتی و ئەوەی ئەو وتویەتی، بریتیە لەمە:
جارێ لە جاران خوشکی شکۆدارم، ئینانای پاک لە شاخەکانەوە بانگی کردم بۆ ناو دڵی پیرۆزی خۆی، منی کرد بە ناو کولابای بە خشتکراودا. لەوێ، لە ئونوگ، زەلکاوی لێ بو، پڕ بو لە ئاو. لەوێ ئەرزی وشکی لێ بو، چناری فوراتی لێ ڕوا بو،
ئەوێندەرێ قامیشەڵان بو، زەلی پیر و زەلی گەنجی لێ ڕوا بو،
ئینکی خوایی، کە شای ئەریدویە، قامیشە پیرەکانی بۆ هەڵکێشام، هەمو ئاوەکەی لێ دەرهێنا.
بۆ ماوەی پەنجا ساڵ بینام کرد، بۆ ماوەی پەنجا ساڵ فەرمانم دەرکرد. ئەوسا خەڵکی مارتو، کە کشتوکاڵیان نەئەزانی، هاتن بۆ سومەر و ئاکەد. بەڵام دیواری ئونوگ، کە بە ناو بیابان دا وەکو تۆڕی مەل لە دەرەوەی، درێژ بۆتەوە ڕای گرتن.
ئێستاش، لێرە لەم شوێنەدا، کاریگەریی من لەسەر ئەو کز بوە.
هێزەکان بەستراونەتەوە بە منەوە وەکو چۆن مانگا بە گۆلکەکەیەوە بەستراوەتەوە، بەڵام وەک کوڕێ، کە ڕقی لە دایکی بێ، شارەکەی بە جێ هێشتبێ، خوشکی شکۆدارم ئینانای پاک لە من هەڵاتوە گەڕاوەتەوە بۆ کولابای بە خشتکراو. ئەگەر ئەو شارەکەی خۆی خۆش ئەوێ و ڕقی لە منە، بۆچی شارەکەی بەستۆتەوە بە منەوە؟ خۆ ئەگەر ڕقی لە شارەکەیە و منی هێشتا خۆش ئەوێ، بۆچی منی بەستۆتەوە بە شارەکەوە؟
ئەگەر یار خۆی لە من دور ئەخاتەوە ئەچێ بۆ خەوتنگا پیرۆزەکەی و، من وەکو بەچکەی ئانزود بە جێ ئەهێڵێ، ئەوسا ئەبێ هیچ نەبێ بمباتەوە بۆ ماڵ بۆ کولابای بە خشت دروستکراو، ئەو ڕۆژە من ڕمەکەم ئەنێمە لاوە و، ئەویش قەڵغانەکەم وردوخاش بکا.
ئەم قسانە بڵێ بە خوشکی شکۆدارم، ئینانا ی پاک."

388 – 398: ئینانا ی پاک ئەم وەڵامەی دایەوە:
"ئێستا، لە کۆتایی دا، لە لێوار و، زۆنگاوەکان دا، لە ڕوباری خاوێن، ڕوباری ئاوی ڕون، ئەو ڕوبارەی کە کونەی بریقەداری ئینانایە، ماسی سوهورماک گیای ئاسک ئەخوا، ماسی کیجتور بەڕوی چیا ئەخوا، ماسی... کە خوای ماسی سوهورماکە، بە خۆشیەوە یاری ئەکا و دێتوئەچێ. بە کلکە پولەکەدارەکەیەوە لەو شوێنە پیرۆزەدا قامیشە پیرەکان ئەگرێ. دارگەزی شوێنەکە، وەکو زۆری تر کە لەوێن، ئاو لەو گۆمە ئەخواتەوە.

399 – 409: "بە تەنیا ڕاوەستاوە، بە تەنیا ڕاوەستاوە! یەک دارگەز بە تەنیا لە لایەکەوە ڕاوەستاوە. ئەگەر ئینمیرکار کوڕی ئوتو ئەو دارگەزە ببڕێ و هەڵیپاچێ و بیکا بە ماشە، قامیشە پیرەکانی لەو شوێنە پیرۆزە ریشەکێش بکا و لە دەستی خۆی دا کۆیان بکاتەوە.... ئەگەر دوی بکەوێ... ماسی...، کە خوای ماسی سوهورماکە، بگرێ و بیکوڵێنێ، بیبرازێنێتەوە و، بیهێنێ بیکا بە قوربانی لە پێناوی چەکی ئەی ئان کارا، توانای جەنگینی ئینانا دا، ئەوسا هێزەکانی سەرکەوتنی بۆ بە دەس ئەهێنن، ئەوسا ئەو کۆتایی ئەهێنێ بە ئاوەکانی ژێرزەمین، کە هێزی ژیانی بۆ ئەڕاتا دابین کردوە.

410 – 412: "ئەگەر ئەو لە شارەوە، کەرەستەی کار و ئاسنگەر بهێنێ، ئەگەر بەردی تاشراو و سەنگتاش بهێنێ، ئەگەر شارەکە نوێ بکاتەوە و تیا نیشتەجێ بێ، هەمو خاکی ئەراتا ئەبێتە هی ئەو."

413 – 416: ئێستا بارووەکانی ئەراتا لاجیوەردی سەوز و، خشتی دیوارەکانی و قوللەکانی سورێکی زەق و گڵی کەرپوچەکانی لە خاکی ئەو شاخانەن کە داری سەرویان لێ ئەڕوێ.

417 ئافەرین بۆ لوگالباندا ی پاک!

## تێوەردان

ئەوانەی کە لەم داستانەیان کۆڵیوەتەوە، رووداوەکانیان بردۆتەوە بۆ شوێنێکی دور لە کوردستانی ئێستا. کریمەر بردویەتیەوە بۆ وڵاتی فارس (صمویل کریمر: من الواح سومر، ص 67) و بە دیاریکراوی بۆ ناوچەی دەریای قەزوین (کریمر: السومریون، ص 57) بەڵام تێکستی لاوژەکە ئاماژەیەکی دیاری تێدایە، کە پشتیوانی لەو بۆچونە ناکا. لە بەشێکی لاوژەدا وا ئەگێڕێتەوە:

"کاتێ ئانزود چریکانی، بەو چریکەیە زەمینی چیاکانی لولوبی لەرزان..."

ئەمە نیشانەیە کە ئەشکەوتەکەی لوگالباندای تێدا دانراوە لە ناوچەی ژیانی لولوبی دا بوە. ناوچەی ژیانی لولوبی، کە بە پێی پشکنینی ئارکیۆلۆجەکان و لێکۆڵینەوەی مێژونوسەکان و، بە پێی نوسینی "ئینسکلۆپیدیا بریتانیکا: چاپی 1974، بەرگی (V. IV)، ل 385" کەوتۆتە کوردستانی ئێستای عیراقەوە، بە دیاریکراوی کەوتۆتە ناوچەی شارەزوری سەر بە پارێزگای سلێمانی.

جگە لەوە، لە بەشی یەکەمی لاوژەکەدا: باسی تەورەکەی ئەکا، کە لە ئاسنێ دروست کراوە، لە چیاکانی "زوبی" یەوە هێنراوە. هەروەها باسی هاوارێ ئەکا لە چیاکانی "زابو" وە هاتوە.

لە بەشی دووەمی لاوژەکەدا: باسی ئەوە ئەکا کە لە ئەخۆشیەکەی هەستاوەتەوە و، لە ئەشکەوتەکە هاتۆتە دەرێ ملی ناوە بۆ ناو چیاکانی "زابو".

لە کوردستان دو روباری گەورە هەن بە ناوی: "زاب" ی گەورە و "زاب" ی بچوک هەردوکیان لە چیاکانی کوردستان هەڵئەقوڵێن، رەوان و پێچاوپێچ بە ناو شاخەکانی کوردستان دا تێ ئەپەڕن تا ئەرژێنە روباری دیجلەوە.

## وشەی نائاشنا

ئاوەکی: گیاندارێکی چوارپێ کە لە ران و رەوە و گاگەلەکەی خۆی بە تەنیا دائەبرێ.

باسک: قۆڵ. نالی ئەڵێ:

"ئەلا ئەی ئاسکی ئاسک، بە باسک شکانت گەردنی سەد شێری شەرزە"

بادە: شەراب، خواردنەوەی ئەلکهول کە مرۆڤ مەست ئەکا. فایەق ئەڵێ:

"شادم لە غەمی هیجران مەیخانە کە مەئوام بێ

مەستم کە مەزەی بادە ماچی لەبی ساوام بێ."

بادەوان: مەیگێڕ. ئەو کەسەی خواردنەوەی ئەلکهولی پێشکەش بە دانیشتوانی کۆڕی مەینۆشان ئەکا.

بارو: پایەی کورت کە ناوبەناو لە سەر دیواری شورای شار یا قەڵا دروست کراون بۆ ئەوەی ئەگەر هێرشی کرایە سەر، پاسەوانەکان لە سەر دیوارەکەوە لە پەنای ئەو پایە کورتانەدا ناکۆکی لە شارەکە بکەن دژی هێرشهێنەرانی دەرەوە.

بەرەنەستێ: بەردێکی رەقی شینە کە ئاسنی لێ بدرێ بریسکەی لێ ئەبێتەوە ئەتوانرێ ئاگری پێ بکرێتەوە. لە سەردەمی کۆن دا لە باتی شقارتە و چەرخ "بەردەنەستێ" و "پوشو" بە کارهێنراوە بۆ ئاگرکردنەوە.

بەرسف: وەڵام.

بوغورد: جەوری هەندێ دەرەختە دوای وشککردنەوەی ئەکرێتە ئاگرەوە ئەسوتێنرێ. جاران جادوگەر بۆ راونانی گیانە بەدەکان سوتاندویانە. ئێستا بۆ خۆشکردنی بۆنی ناوماڵ.

پۆپەشمین: تەنراوێکی تەنک و شاش و زبرە، جۆڵا، لە لۆکە یا کەتان یا ئاوریشم ئەیچنێ. کەسێ بنوێ ئەشێ بۆ خۆداپۆشین بیدا بە خۆی دا.

پەچە: شوێنێکی سەر نەگیراوە، بە تەیمان بە بەرزایی مەترێ زیاتر چواردەوری گیراوە، تەرخان کراوە بۆ مۆڵدانی مەڕ و بزن، بە تایبەتی لە شەوانی بەهار و هاوین دا.

پرپۆڵە: ئارد دوای تەڕکردنی بکرێتە کلۆی بچوک بۆ خواردنی مەلی تازە هەڵهاتو.

توێشو: تۆشە. ئەو خۆراکەی کە ڕێبوار بۆ خواردن لە ڕێگا لە گەڵ خۆی هەڵی ئەگرێ. مەولەوی ئەڵێ:

"یا خەلیل، دەخیل! کێ عادەت کەردەن      تۆشە وە دەرگای کەریمان بەردەن؟"

تەویلە: گەوڕ: ژورێکی سەرگیراوە تەرخان کراوە بۆ بە خێوکردنی چارەوێ، بە تایبەتی ئەسپ و ئێستر و کەر و مانگا.

جاجم: تەنراوێکی تەنک و شاش و زبرە. جۆڵا، لە دەزوی خوری ئەیچنێ. کەسێ بنوێ ئەشێ بۆ خۆداپۆشین بیدا بە خۆی دا.

جۆماڵ: خاوێنکردنەوەی جۆگا لە گژوگیا و قوڕ و لیتە.

جۆبار: جۆگا. نالی ئەڵێ:

"خاکی میزاجی عەنبەر و داری رەواجی عود

بەردی خەراجی گەوهەر و، جۆباری عەینی نور."

جۆخێن: خەرمانی گەنم و جۆ و دانەوێڵەی تر.

جوانەگا: لە تەمەنی سێ ساڵی دا کە ئیتر ئەتوانرێ جوتی پێ بکرێ.

جەنە کردن: لە کاتی جوت و گێرەدا کە گا لە ئەنجامی ماندویەتی یا برسێتی دا لە شوێنی خۆی دا ڕائەوەستێ و مان ئەگرێ لە ڕۆیشتن، ئەڵێن: (جەنە) ی کردوە. ئەم وشەیە جوتیاری دۆڵی جافەتی بە کاریان هێناوە.

چۆقەچۆقی ددان: هەڵلەرزین و پێکدادانی کاکیلەی سەر و خواروی دەم بە هۆی ئەخۆشی سەخت و لەرز لێهاتن یا لە بەر سەرمای زۆر بە تین.

چەقەچەق: زۆروتنی بێ سەروبەری چەند کەسێ پێکەوە.

چێڵەک: مانگا.

چیلکە: لقی باریک و دریژی دار، کە مرۆڤ بۆ دروستکردنی کەپر و بۆ سوتاندن و، مەلی گەورە بۆ دروستکردنی هێلانە بە کاری ئەهێنن.

چڵوچێو: چیلکەی خواروخێچ. مەحوی ئەڵێ:

**"دیارم دێری عەشقە، بە سوتن چم، چێ هەر لەوێ دەگرم**
**کە من مشتێ چلوچێوم بە چی بم، کەڵکی کێ دەگرم؟"**

خەپلە: جۆرێکە لە کولێرەی ئەستور لە جۆ، هەرزن، گاڵ، دروست کراوە.

خۆرت: گەنج.

خورت: بەهێز.

درود: سڵاو.

دان: نیوەی یەک رۆژ.

دۆڵچە: دەفرێکی چەرمینە، لە شێوەی سەتڵ دا لە پێستی خۆشەکراوی ئاژەڵ دروست کراوە بۆ هەڵێنجانی ئاو لە بیر و چاڵاو.

دەوان: راکردنی خێرا. نالی وتویەتی:
"وەک ئاهەکەم دەوان بە هەتا خاکی کۆیی یار
وەک ئەشکەکەم رەوان بە هەتا ئاوی شیوەسور!"

راستاڵ: کەسێکی راستگۆ و سەرڕاست.

رەوان: نەوەستاو.

رێژەن: فەڕ و بەرەکەت.

زەڕنەقوتە: بەچکەی مەل کە لە هێلکە دەردێ هێشتا پەڕی دەرنەکردوە.

زەنگین: دەوڵەمەند.

زەنوێر: گژو گیا و داری هەمیشە سەوز.

سین کردن: لە کاتی کاروان و کاردا کە وڵاخی بەرزە، بە تایبەتی ئەسپ، لە ئەنجامی برسێتی یا ماندویەتی دا لە شوێنی خۆی دا رادەوەستێ و مان دەگرێ لە رۆیشتن، دەڵێن: (سینی) کردوە. ئەم وشەیە سوارەی جاف بە کاریان هێناوە.

کەوش: جۆرێکە لە پێڵاو لە چەرم دروست دەکرێ.

کەوشەن: سنوری نێوان دو زەوی.

کێلی سنور: بەردێکی بەرز کە بۆ جیاکردنەوەی سنوری ناوچەیەک لە ناوچەیەکی تر دانراوە.

کەڕەنا: شەیپور. ئامرازێ بوە لە شاخی گا یا لە مەعدەن دروستکراوە. بۆ وریاکردنەوەی خەڵک، بە تایبەتی لە کاتی شەڕدا، فوی پێ دا کراوە دەنگێکی گەورەی لێ دەرهاتوە.

کەورگ: ئەشکەوت. کونێکی گەورە یا دەلاقەیەکە لە چیادا کە مرۆڤ یا گیانداری تر دەتوانن وەکو شوێنی ژیان بۆ حەوانەوە، بۆ خۆپاراستن لە بەفر و باران و سەرما و گەرما بە کاری بهێنن. هەروەها پێی دەوترێ: شکەفت، مەڕ، کاچ، کەڵۆز.

کۆڵەوژ: دارێکی باریکی سەختە ئاگری پێ تێک دەدرێ. شوکری فەزلی وتویەتی:
**"حەیفە چاوێ کە جەفا کۆڵەوژی تێ دەشکاند**
**تۆ بە کلچێوکی وەفا عەینی گەلاوێژی دەکەی."**

کوندە: دەفرێکی چەرمینە، لە پێستی خۆشەکراوی بزن دروست کراوە، کە لاشەکەی لە ملەوە بە ساغی، بێئەوەی پێستەکەی پارچە کرابێ، دەرهێنراوە. ناوی خواردنەوەی تێ کراوە. پێشینان وتویانە: "کەر لە کوێ کەوتوە، کوندە لە کوێ دراوە."

کوپە: گۆزەی گەورە. دەفرێکە لە گڵی تایبەتی دروست ئەکرێ لە ئاگردا سور ئەکرێتەوە. شێوەی لولەیی ورگنی هەیە. بنەکەی و ملەکەی لە ناوقەدەکەی باریک ترە. ئەشێ بۆ بەرزکردنەوە و هەڵگرتنی دو قوڵف یا یەکێکی هەبێ. زۆر پێویستی پێ جێبەجێ ئەکرێ، لەوانە: شلە، بە تایبەتی بادە، سرکە، ترشیات، دۆشاو، رۆن. هەروەها خۆراکی وشک، بە تایبەتی وشکەبان و دانەوێڵەی تێدا هەڵئەگیرێ. لە سەردەمی زودا پێشەی مردوی تێ کراوە و خراوەتە ژێر زەوی. نالی ئەڵێ:

**"نەواڵەی تۆبە دەربێنە، هەتا تەن نەبوەتە سفرە**

**پیاڵەی شیشە بشکێنە، هەتا وەک کوپە نەشکاوی"**

کیتەڵە: دەفرێکە لە گڵ دروست کراوە، لە ئاگردا سور کراوەتەوە، لە گۆزە بچوکترە، بە زۆری ئافرەت بەکاری هێناوە بۆ گواستنەوەی ئاو و شلەی تر. بۆ ئاسانکردنی هەڵگرتنی لە کاتی گواستنەوەدا خراوەتە سەر کەلەکەی لەش.

لاجیوەرد: بەردێکی گرانبەهایە رەنگەکەی پیرۆزەییە.

لاقرتێ: گاڵتە پێ کردن.

گلێر کردنەوە: کۆکردنەوە، بە تایبەتی بۆ کۆکردنەوەی کەلوپەل و ئاژەڵ.

گەوڕ: ژورێکی سەرگیراوە تەرخان کراوە بۆ بەخێوکردنی ئاژەڵ، بە تایبەتی مەڕ و بزن و مانگا.

گۆپاڵ: گۆچان.

گۆپاڵی شاهانە: سەولەجان.

گۆلک: گوێرەکە، بەچکەی یەکساڵەی مانگا.

گیرا کردن: قبوڵ کردن.

لێوار: قەراغ، کەنار.

ماشە: ئامرازی راوە ماسیە، لە شوڵی دار دروست ئەکرێ و، لە شێوەی سەبەتەدا لە ناو ئاوی خوڕدا جێگیر ئەکرێ. ماسی کە تێ کەوت گیر ئەکا و ئەگیرێ.

مابادەوان: مەیگێڕی مێینە.

مۆچیاری: فێرکردن، ئامۆژگاری.

مەوج: تەنراوێکی تەنک و سفت و نەرمە. جۆلا، لە دەزوی لۆکە یا کەتان یا ئاوریشم ئەیچنێ. کەسێ بنوێ ئەشێ بۆ خۆداپۆشین بیدا بە خۆی دا.

مەشکە: دەفرێکی چەرمینە، لە پێستی خۆشەکراوی گوێرەکە دروست کراوە، کە لاشەکەی لە ملەوە بە ساغی، بێئەوەی پێستەکەی پارچە کرابێ، دەرهێنراوە. ماستی تێدا ژەنراوە، بۆ ئەوەی کەرە لە دۆ جیا بکرێتەوە. پێشینان وتویانە: "تۆ مەشکەی من بژەنە، من مەشکەی ماڵی میر."

مەل: باڵندە. پێشینان وتویانە: "لە گایە چی بدەم بە برایە؟ لە مەلێ هەر یەکی پەلێ"

مەی: خواردنەوەی ئەلکهولی کە مرۆڤ مەست ئەکا. نالی ئەڵێ:

"بۆچی نەگریم سەد کەڕەتم دڵ دەشکێنی بۆ مەی ئەرژێ، شیشە لە سەد لاوە شکاوە"

نامۆ: بێگانەیەکی نەناسراو.

نەمام: درەختێ کە تازە ئەروێنرێ یان روێنراوە بەڵام لە بەر کەمی تەمەنی هێشتا بەری نەگرتوە. مەحوی ئەڵێ: "پیری نەمامی باخی جوانیمی کرد بە پوش/ تازەم درەختی تولی ئەمەل دەر دەکا چرۆ."

نێون: گۆلکی دوساڵەی مێ. بەرامبەر نۆوەن: گۆلکی دو ساڵەی نێر.

هێزم: داری سوتاندن. نالی وتویەتی:

"لەم خۆشیە کە هێزمی مەتبەخ سەوز بوە ماوم عەجەب لە دیدەیی سۆفی کە داڕوێ."

هیزە: خیگە. دەفرێکی چەرمینە، لە پێستی خۆشەکراوی مەڕ دروست کراوە، کە لاشەکەی لە ملەوە بە ساغی، بێنەوەی پێستەکەی پارچە کرابێ، دەرهێنراوە. شلە بە تایبەتی رۆن و چەوری و دۆشاوی تێ کراوە. نالی ئەڵێ:

**"بوغزت لە زەعیفان چیە قوربان، وەکو قەساب**

**بەو خەز و بەزی ریشوەتە، هەی هیزە، قەڵەو بە!"**

هەمانە: دەفرێکی چەرمینە، لە پێستی خۆشەکراوی ئاژەڵ دروست کراوە. کەلوپەل و شتی وشکی تێ دا هەڵگیراوە. لە سەفەردا وەکو جانتا بە کار هێنراوە. پێشینان وتویانە: "مشتەی ناو هەمانەکە کوشتومی."

هەرزاڵە: کەپرێکی نزمە لە دار و گیا و پوشی بۆنخۆش دروست کراوە. کوندە و گۆزەی لە سەر دانراوە، هەندێ جار لە سەری نوستون.

**سەرچاوە**

لەبەر تێکستی ئینگلیزی وەرگیراوە، بۆ تێکستی ئینگلیزی بڕوانە:

The Electronic Text Corpus of Sumerian Literature- Oxford University

بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەم لاوژەیە بە عەرەبی بڕوانە:

صمويل كريمر: من الواح سومر. ترجمة: طه باقر. دار الوراق. بيروت 2010. (ل 394 تا 396) و (ل 396 تا 397)

صاموئيل نوح كريمر: السومريون. احوالهم - عاداتهم - تقاليدهم. ترجمة: الدكتور فيصل الوائلي. وكالة المطبوعات. الكويت. 1973. (ل 394 تا 396)

الدكتور فاضل عبدالوحد علي: سومر - اسطورة وملحمة. وزارة الثقافة والاعلام. بغداد 1997. (ل 159 تا 160)

# لاوژەی گلگامێش

## چکاوەی بابەت

گلگامێش شای شاری ئیروکە. شایەکی زۆردارە. خەڵک ئەچەوسێنێتەوە، هەمو بەیانیەک بۆ کارکردن بە دەنگی تەپڵ خەبەریان ئەکاتەوە. هەرکەس ژن بهێنێ ئەم شەوی یەکەم لەگەڵ بوکەکەی بەسەر ئەبا. زۆرداری گلگامێش ئەگاتە رادەیەک خەڵکی ئورورک بۆ سکاڵا لە دەس ئەو پەنا ئەبەنە بەر خواکان سنورێ بۆ بەدکارییەکانی دابنێن.

خوا، ئەنکیدو وەکو هاوتایەک ئەخوڵقێنێ تا ببێتە ملۆزمی گلگامێش و بچێ بە گژی دا.

هاوتاکەی لەگەڵ گیانداری کێویدا هەڵسوکەوت ئەکا ئەویش خوی گیانداری کێوی ئەگرێ.

راوکەرێک لەسەر کانی ئەنکیدو ئەبینێ، لەسەروسەکوتی ئەترسێ راوی لێ تێک ئەدا.

ئەم روداوە بۆ باوکی ئەگێرێتەوە، باوکی ئامۆژگاری ئەکا بچێ بۆ ئورورک بۆ لای گلگامێش باسەکەی بۆ بگێرێتەوە بۆ ئەوەی ژنێکی لەگەڵ بنێرێ ئەنکیدوی دڕندە بە خۆشیی ژیان و ژن تاو بکا بیبا بۆ ئورورک بۆ ململانێ لەگەڵ گلگامێش. ژنەکە لەئەرکەکەی دا سەرکەوتو ئەبێ. ئەنکیدو واز لە ژیانی کێوی دێنێ و ئەچێ بۆ ئورورک.

لە ئورورک لەگەڵ گلگامێش ئەکەونە زۆران. بەڵام لەباتی ئەوەی یەکێکیان ئەوی تریان لە ئەرز بدا ئەبن بە دۆستی گیانی بە گیانی. گلگامێش لە شایەکی بەدکارەوە ئەبێ بە کەسێکی باش و پێکەوە زنجیرەیەک ئەبەرد دەست پێ ئەکەن بۆ ئەوەی بەدیی لەسەر روی ئەرز بسڕنەوە.

گلگامێش و ئەنکیدو یەکەم ئەبەرد ئەچن بۆ شەڕی خومبابای دێو کە ناوەکەی ترس و تۆقانی بڵاوکردەوە. ئەیکوژن و بەسەرکەوتویی ئەگەڕێنەوە.

ئیشتار، داوا لە گلگامێش ئەکا بیێ بە مێردی. گلگامێش نەک ڕازی نابێ بەڵکو سوکایەتی پێ ئەکا. لە سەر ئەوە ئیشتار ئەبێتە دوژمنی گلگامێش و داوا لە باوکی ئەکا گای ئاسمانی بنێرێ بۆ کوشتنی گلگامێش. بەڵام گلگامێش و ئەنکیدو گای ئاسمانی ئەکوژن.

ئەنکیدو ئەخۆش ئەکەوێ ئەمرێ.

مردنی ئەنکیدو ئەبێتە هۆی ترساندنی گلگامێش لە مردن. ئەترسێ ئەمیش بە دەردی هەمان چارەنوس بچێ لەبەر ئەوە ئەکەوێتە سەر کەڵکەڵەی گەڕان بەدوای نەمریی دا.
بە ناو دەریای مەرگ دا ڕێگەی پڕ مەترسی ئەگرێ ئەچێتە لای باوکی رازی ژیانی جاویدانی پێ بڵێ، ئەویش چیرۆکی تۆفانی بۆ ئەگێڕێتەوە. لەو تۆفانەدا تەنیا ئەو و ژنەکەی دەرباز بون. ئەمیش پێداگری ئەکا لەسەر ئەوەی رازەکەی بۆ بدرکێنێ. گرەوی لەگەڵ ئەکا کە ئەگەر شەش ڕۆژ و حەوت شەو نەنوێ پێی بڵێ، بەڵام بەرگە ناگرێ لە بەر شەکەتی خەوی لێ ئەکەوێ گرەوەکە ناباتەوە.



**گلگامێش شەڕ لەگەڵ گامێشێکی وەحشی ئەکا**

ژنی نوتونوپشتم بەزەیی پیا دێتەوە داوا لە مێردەکەی ئەکا شتێکی بداتێ لە گەڵ خۆی. دوای ئەم سەفەرە درێژە بیباتەوە بۆ ئوروک. ئاگاداری ئەکا گیایەکی دڕکاوی لە بنی دەریادا رواوە ئەگەر بتوانێ بیگاتێ و بیهێنێ ژیانی بۆ نوێ ئەکاتەوە.
ئەچێتە بن دەریا و گیاکە بە دەست ئەهێنێ.
بە دڵی خۆش و بە هیوای ژیانی جاویدان بەرەو ئوروک ئەگەڕێتەوە.

لە ڕێگاماندو ئەبێ. لە ئیستگەیەک دا لا ئەدا لە گۆمێک دا خۆی بشوا. مارێک گیاکە بۆن ئەکا بەدزیەوە دێ ئەیرفێنێ و ئەیخوا. مارەکە بەوە کاش فڕێ ئەدا و ژیانی تازە ئەبێتەوە. بەڵام ئەم ئیتر گیای تازەبونەوەی ژیانی لە دەست ئەچێ و بە تەمای ژیانی جاویدان نامێنێ.
لە گەڵ هاوڕێکەی ئەگەڕێتەوە بۆ ئوروک.

داوا لە هاورێکەی ئەکا سەر بکەوێتە سەرشورەی شاری ئورک، سەیری شورە و بینا و پەرستگا و باخەکانی ئوروک بکا، کە ئەم دروستی کردون. بۆ ئەوەی پیشانی بدا ئەمریی مرۆڤ لە ئەنجامدانی کاری گەورەدایە نەک لە ژیانی زۆر و تەمەنی درێژدا.

## تێچاندن

لاوژەی گلگامێش لە بنەڕەت دا ئەفسانەیەکی سومەریە و، نزیکەی چوار هەزار ساڵ پێش ئێستا بە زمانی سومەری دانراوە و بە خەتی مێخی لە سەر خشتی قوڕ نوسراوەتەوە. بەڵام هەمان لاوژە، لە سەردەمی جیاواز و لە شوێنی جیاوازدا، بە زمانەکانی بابلی و ئاکەدی و ئاشوری و هتد... نوسراوەتەوە، لە چەند جێگایەکی تر هەندێ بەشی بە پچڕ پچڕی لە سەر خشت دۆزراوەتەوە. چەند بەشێکی لە مۆزەخانەی عیراقە، بەشی زۆری لە موزەخانەکانی دەرەوەی عیراقە بە تایبەتی مۆزەخانەی بەریتانی. گرنگترینی ئەم کۆمەڵە خشتە، ساڵی 1872 لە کتێبخانەکەی شای ئاشوری ئاشور ناسر باڵ (668 – 626 پ ز) لە نەینەوا دۆزراوەتەوە. بە لێکدانی هەمو ئەو خشتانە و بە یارمەتی چەندین خشتی تری مۆزەخانە جیاوازەکان توانیویانە کۆی لاوژەکە بە یەکخراوی بگێڕنەوە.

لاوژەی گلگامێش بە خەتی مێخی لە سەر دوانزە خشتی سورەوەکراو نوسراوەتەوە. هەر خشتەی دابەش کراوە بۆ شەش ستون، هەر یەکێ لەو خشتانە بە گشتی سێ سەد دێری تێدا نوسراوە، تەنیا خشتی دوانزەهەم دێرەکانی نیوەی ئەوانی ترە. هەندێ لە ستونەکانی خشتەکان و هەندێ دێری ناو ستونەکان، لە بەر شکان و فەوتانی سواڵەتی خشتەکە یان لە بەر سوانی نیشانەکانی، نوسینەکەی شێواوە یا ناخوێنرێنەوە. خشتەکانی چوارەم و پێنجەم و شەشەم تەنیا چەند سواڵەتێکی شکاوی لێ دۆزراوەتەوە لە بەر ئەوە خراونەتە سەر یەک. زۆری وەرگێڕەکان خشتی دوانزەهەمیان ئەخستۆتە سەری چونکە پێیان وا بوە بەشێ نیە لە گێڕانەوەی چیرۆکەکانی لاوژەکە.
لاوژەی گلگامێش سەردەمێ هۆنراوەتەوە هێشتا یەکتاپەرستی نەبۆتە باوەڕی باوی خەڵک، بەڵکو باوەڕیان بە فرەخواپەرستی هەبوە. بۆ هەر دیاردەیەکی سروشتی خوایەکیان پەرستوە، بە تایبەتی خواکانیان لە گەڵ مانگ و رۆژ و ئەستێرەکانی ئاسمان دا هاوناو بون، لەوانە: شاماش، بۆ رۆژ. سین، بۆ مانگ. ئیشتار، بۆ ئەستێرەی زوهرە. نابو، بۆ ئەستێرەی عەتارید. نیرگال، بۆ مەریخ. نینورتا، بۆ زوحەل...هتد

زمانەکانی سۆمەری و بابلی و ئاکەدی و ئاشوری مردون. لە بەر ئەوە لێکدانەوەی وشەکان و گۆکردنی دروستی ناوەکان جێگەی مشتومڕن. هەر وەرگێڕە کە بە زمانی خۆی وەری گێڕاوە گۆکردنی ناوی قارەمان و کەسەکانی لاوژەکەی بە پێی گۆکردنی زمانەکەی خۆی دەربڕیوە. تا ئێستاش لە ناو زانا شوێنەوارناسەکان دا لە سەر جۆری گۆکردنیان مشتومڕ هەیە. لە سەر یەکجۆرە گۆکردن رێک نەکەوتون. بە تایبەتی چونکە هەمو ئەو زمانانەی دەقە ئەسڵیەکانیان پێ نوسراوە بە زمانی مردو دائەنرێن لە ئێستادا گەلێک ئەماوە پێیان بدوێ.
مێژونوسەکانی عەرەب و شوێنەوارناسەکانیان لە عیراق، بە تایبەتی لە سەردەمی دەسەڵاتی بەعس دا، هەوڵیان داوە شارستانێتی میزۆپۆتامیا بکەن بە شارستانێتیەکی سامی و، بەوەش بیکەن بە کەلەپوری دێرینەی عەرەبی، ئەگەرچی هەمویان دان بەوەدا ئەنێن کە سومەریەکان سامی نەبون، بەڵام هەوڵێکی زۆریان داوە سامی بونی رێچەڵەکی بابلی و ئاکەدی و زمانەکەیان بسەلمێنن و. هەوڵیان داوە لە وەرگێڕانی دەقەکان دا، ئەگەرچی هەندێ

دەنگی وەکو "گاف" و "پێ" لە زمانەکەی ئەوان دا نیە، گۆکردنی ناوەکان و وشەکان لە گەڵ گۆکردنی عەرەبی بگونجێنن و لە وشەی عەرەبی نوێ نزیکی بخەنەوە.

لاوژەی گلگامێش دەیان جار و بە زمانی جیاوازی دنیا تەرجومەکراوە و بڵاوکراوەتەوە لەوانە بە: زمانەکانی ئینگلیزی، ئەڵمانی، فەرەنسی، روسی، هۆڵەندی، سویدی، دانیمارکی، نەرویجی، هەروەها بە زمانەکانی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەوانە: عەرەبی، فارسی، تورکی، کوردی.... هەندێ لەو تەرجومانە، راستەوخۆ لە زمانە ئەسڵیەکەیەوە تەرجومە کراوە و، هەندێکی تری تەرجومەی تەرجومەیە. هەندێ لەم تەرجومانە کەموزۆر جیاوازن لە گەڵ یەکتری، بەڵام بیرۆکەی چیرۆکەکانی لە گشتی دا وەکو یەکن.
دو نوسەری کورد، هەر یەکە بە جیا، لاوژەی گلگامێشیان کردوتە کوردی و هەردوکی چاپ و بڵاوکراوەتەوە:
ئەحمەدی قازی، گەل گەمێش،
جەلیل ئازادیخواز، گێل گەمێش، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی 2005.
تەرجومەی یەکەم وەکو وەرگێڕ خۆی نوسیوێتی لە زمانی فارسیەوە وەری گێڕاوە. شاعیری ناسراوی ئێران ئەحمەدی شاملو لە زمانی فەرەنسیەوە کردویەتی بە فارسی و ئەویش لە زمانی فارسیەوە کردویەتی بە کوردی.
تەرجومەی دوەمیش وەرگێڕ خۆی نوسیوێتی کە لە فارسیەوە وەری گێڕاوە، بەڵام ئاماژەی بە سەرچاوەکەی نەداوە.
ئەمەی لێرەدایە سێیەم تەرجومەی کوردی گلگامێشە. جیاوازی ئەم لەگەڵ ئەوانی تردا ئەوەیە:

یەکەم، ئەمەیان لە تەرجومەی عەرەبیەوە کراوەتە کوردی. وەرگێڕی عەرەبی، تەها باقیر، زانایەکی شوێنەوارناسی عیراقی بوە، کە خۆی پسپۆڕی بواری شوێنەوارناسی بوە و، یەکسەر لە زمانی ئەسڵی و لە دەقی ئەسڵیەوە کە بە خەتی مێخی نوسراوە، وەری گێڕاوە.
بڕوانە: (طه باقر، ملحمة كلكامش، بغداد، 1961)
ئەم کتێبە سێ جار لە بەغداد چاپ کراوە، چاپی یەکەم (1961) و چاپی دوەم (1971) و چاپی سێیەم (1974). جاری دوەم و سێیەم لە لایەن "وزارة الثقافة والاعلام" ی عیراقیەوە چاپ و بڵاوکراوەتەوە. بۆ دوایین چاپی ئەم کتێبە بڕوانە: (طه باقر: ملحمة كلكامش، دار الوراق، لندن، 2009).
جگە لە تەها باقیر چەند کەسی تر "ملحمة" ی گلگامێشیان وەرگێڕاوە بۆ عەرەبی لەوانە: دکتور انيس فريحة، عبد الحق فاضل، هەروەها چەند تەرجومەیەکی تری لە سەر ئینتەرنێت بڵاوکراوەتەوە.

دوەم، وەرگێڕی عەرەبی، ئەگەرچی وەکو وەرگێڕی هەندێ لە زمانەکانی تر ژمارەی ئەخستۆتە سەر دێڕەکانی، بەڵام هەوڵی داوە دێڕ بە دێڕ و ستون بە ستون تەرجومەی بکا. تەنانەت بۆ کاری بەراوردکاری دەقی ئەسڵی بە خەتی مێخی و دەقی ئەسڵی بە پیتی لاتینی لە گەڵ بڵاو کردوتەوە.

سێیەم، لە هەر دێڕێکی ئەم وەرگێڕانەدا ریزی نوقتە دانرابێ واتە ئەو دێڕە یان چەند دێڕێ فەوتاوە. لە هەر جێیەکیش دێڕێ بە سێێتی بە جێ هێڵرابێ، ئەوە لە بنەڕەت دا سەرەتای خشتێ یا ستونێکی نوێیە، هەندێکیشی بۆ ئاسان تێگەیشتنی بابەتەکە دانراوە، دانانی ژمارە لە سەر هەندێ پەرەگرافی بابەتەکە نیشانەی ژمارەی ئەو خشتەیە لە ریزی ئەو یانزە خشتەی لاوژەکەی لە سەر نوسراوە.

## ناونامە

بۆ ئەوەی خوێنەر ئاشنا بێ بە ناوی هەندێ کەس و شوێنی ئەم داستانە چاک وایە پێشتر چاوێ بەم لیستەدا بگێرێ، کە بۆ ئاسانکردنی خوێندنەوەی هەندێکی بڕبڕ کراوە و، بە پیتی لاتینی لە بەر دەقێکی ئینگلیزی، نوسراوەتەوە:

ئانو: ( ah noo: anu) خوای ئاسمان و باوکی هەمو خواکانە.

ئانوناکی: (ah noo nah kee: anunnaki) خوای جیهانی ژێرو، بڕیاردەری چارەنوسی مردوانە.

ئارورو: (ah roo roo: aruru) دایکی گەورەی خواکان. خوڵقێنەری ئەنکیدویە. یەکێ لە ناوەکانی تری مامیتومە (mammetum).

ئای یا: (ah ea: ay ) خوای ئاو و ژیریە. پارێزەری مرۆڤایەتیە. پێشی ئەوترێ ئینکی (enki)

ئەنکیدو: (enkidu: en kee doo) کەسێکی ئاسایە بۆ هاوتایی گلگامێش خوڵقێنراوە.

خومبابا: (humbaba: hoom bah bah) دێوێکە دانراوە بۆ پاراستنی جەنگەڵی دارکاژ.

ئینلیل: (enlil: en lil) خوای زەوی و باوبۆرانە.

ئینئوگی: (ennugi: en noo gee) خوایەکی پچوکە یا خێو.

گلگامێش: (gilgamesh: gil gah mesh) پاڵەوانی ئەفسانەکەیە.

نینسون: (ninsun: neen soon) خواژنێکی ژیرە. دایکی گلگامێشە. هاوسەری لوگالباندایە. ناوێکی تری خاتو مانگایە.

نینورتا: (ninurta: neen oor tah) خوای شەڕ و کشتوکاڵە. ئەنکیدو لە شێوەی ئەم دروست کراوە.

نیسابا: (nisaba: nee sah bah) خواژنی گەنم و دانەوێڵە. قژی ئەنکیدو وەکو لاسکەکانی ئەم بوە.

شاماش: (shamash: shah mahsh) خوای رۆژە.

سیدوری: (siduri: see door ee) ژنە مەیخانەوان.

سین: (sin: seen) خوای مانگە.

ئوباراتوتو: (ubaratutu: oo bahr ah too too) خوا و باوکی ئوتناپیشتیم.

ئورشانابی: (urshanabi: oor shah nah bee) کەشتیەوانی تایبەتی .

ئوتناپیشتیم: (utnapishtim: oot nah peesh teem) تەنیا کەسە لە گەڵ هاوسەرەکەی لە تۆفان دەرباز بوە، لە بەر ئەوە ژیانی جاویدانی پێ براوە.

ئوروک: (uruk: oo rook) شارێکی سومەری بوە.

شوروپاک: (shuruppak: shoo roo pahk) شارێکی سومەری بوە لە سەروی ئوروک دا. نشینگەی پێشوی ئوتناپیشتیم بوە. خواکان لەوێوە تۆفانیان هەڵساندوە.

نیپور: (nipur: nee poor)- شاری ئینلیل بوە. پایتەختی ئایینی میزۆپۆتامیا بوە.

ئای ئانا: (eanna: ay ahn ah) نشینگەی ئانو و ئیشتار بوە لە شاری ئوروک.

ئای گال ما: (ay gahl mah: egalmah) پەرستگای نینسون بوە لە شاری ئوروک.

ئەدەد: خوای باهۆز.

سمۆگان: خوای گاوگۆتاڵ.

ئولای: (ulay: oo lie) ناوی روبارێ بوە.

ماشو: (mashu: mah shoo) ناوی ئەو چیایە بوە خۆری لێ هەڵ هاتوە و خۆری لێ ئاوا بوە.

نیموش: (nimush: nee moosh) ئەو لوتکەیەی نوتناپیشتیمی لە سەر گیرساوەتەوە. پێی ئەوترێ نیسیر (nisir).

نیکو: ئەندازەیەک بوە بۆ پێوانەی پانتایی.

شار (سار): ئەندازەیەک بوە بۆ پێوانەی پانتایی و کێشانی قورسایی.

کر: ئەندازەیەک بوە بۆ پێوانی قەوارە.

مەن: ئەندازەیەک بوە بۆ پێوانەی قورسایی. ئەم وشەیە تا ئێستاش لە زمانی کوردی دا بۆ کێشانی قورسایی بە کار ئەهێنرێ. پێشینان وتویانە: "تۆ یەک مەنی، من دو مەنم. بێجگە لە گورز و کەمەنم."

هەمو نیگارەکانی ئەم بەشە لەم سەرچاوەیە وەرگیراون: "المهندس الدکتور سوسة، أحمد، تاریخ حضارة وادي الرافدین في ضوء مشاریع الري الزراعیة والمکتشفات الآثاریة والمصادر التاریخیة، الجزء الاول، دار الحریة للطباعة، سنة الطبع 1983، ص209- 2011"

# لاوژەی گلگامێش

## خشتی یەکەم

## ستونی یەکەم

ئەوە ئەو بو کە هەمو شتێکی بینی، جا وڵاتەکەم گۆرانی پێدا هەڵبڵێ
ئەوە ئەو بو کە هەمو شتێکی زانی و سودی لە پەندەکانی وەرگرت
ئەوە داناى ئاگاداری هەمو شت
نهێنیەکانی دی و رازە شاردراوەکانی ئاشکرا کرد
هەواڵەکانی زەمانی پێش تۆفانی بۆ هانین
رێگەی دوری بڕی لە نێوان شەکەتی و حەسانەوەدا گینگڵی دا
لە سەر تاشەبەردێ هەرچی دی بو نەخشاندی
شورە سەختەکانی ئوروکی دانا
پەرستگای پیرۆزی ئەی ئانا، رێرەوی پیرۆز
بڕوانە دیواری دەرەوەی وەکو مس ئەبریسکێتەوە
بڕوانە دیوارەکانی ناوەوەی وێنەیان نیە
دەرگاکانی لە کۆنەوە جێگیر بون
نزیک بەرەوە لە ئەی ئانا نشینگەی ئیشتار
هیچ شایەکی تر، هیچ کەسێکی تر، لەوانەی دێن، نمونەی کاری ئەو داهێنن
سەرکەوە سەر شورەی ئوروک، بە تێرامانەوە بە بانی دا بڕۆ
بناغەکەی و کەرپوچەکانی بپشکنە
ئاخۆ  بە خشتی سورەوەکراو دروست نەکراون؟
ئایا حەوت داناکە بنچینەکەیان دانەناوە؟
یەک سار پانتایی شارەکەیە، یەک سار بۆ لەوەڕ و یەک ساریش بۆ گلێنجان
ئەوەش ئەرزی تەرخانە بۆ پەرستگای ئیشتار
هەموی سێ سارە، هەروەها بەشێ ئەرزی چۆڵەوانیی شاری ئوروکە
بگەڕێ بۆ تەختە هەڵگیراوەکەی ناو دورجی مسینەی خشتەکان
قفڵە برونزیەکە بکەرەوە
دەمە نهێنیەکەی ئاشکرا بکە
تاشە بەردە لاجیوەردیەکە بهێنە و بە دەنگی بەرز بیخوێنەوە
ئەوسا ئەزانی گلگامێش چەندە رەنجی داوە و چەندە ماندویەتی دیوە
هەمو شاکانی بە جێ هێشتوە، سیمایەکی جوانی شکۆداری هەیە
پاڵەوانی ئەوەی ئوروک، گای شاخدار
لە پێشەوە بڕوا پێشەنگە
لە دواوەش بێ بۆ ئەوەیە برا و کەسوکارەکانی بپارێزێ
چەترێکی گەورەیە، پارێزەری ژێردەستەکانێتی

شەپۆلی تۆفانێکی بەخورە تەنانەت دیواری بەرد دەڕوخێنێ
ئەوەی لوگالباندا، ئەو گلگامێشی خورتە
کوڕی چێڵی ترسناک، ڕات نینسون
گلگامێشێ پڕە لە قەشەنگی و خوایی
ئەوە کە تەنگەی شاخەکانی داگیرکرد
لە بناری کێوەکان دا چاڵاوی هەڵکەند
دەریا زلەکانی بڕی بەرەو شوێنی هەڵهاتنی خۆر
هەر چوار گۆشەی جیهانی پشکنی
هەوڵی دا ژیانی جاویدان بە دەس بهێنێ
بە تەقەلای خۆی توانی بگاتە ئوتناپیشتیمی دورەدەست
ژیانی گەڕانەوە بۆ ئەوەی تۆفان تێکی دا بو
ئاخۆ لە هیچ شوێنێکی کە شایەکی وا هەیە؟
ئایا جگە لەو کێی تر ئەتوانێ بڵێ: من شام؟
جگە لەو کێی تر لە کاتی لە دایکبونی دا ناوی نرا گلگامێش؟
دوسێیەکی خوایە و سێیەکەکەی تری مرۆڤە
بیچمی جەستەی خواژنە مەزنەکان دایان ڕشتوە

ستونی دوەم
دوای ئەوەی گلگامێش خوڵقێنرا، خوای گەورە باشی خوڵقاند
شاماشی ئاسمانی چاکە و ئەدەد پاڵەوانێتی پێ بەخشیوە
خوا گەورەکان شێوەیان داڕشت
باڵای یانزە باڵ و پانی سنگی نۆ بست بو
دوسێیەکی خوا و سێیەکی مرۆڤە
بیچمی جەستەی ترسناکە وەکو گاکێوی
بڕندەیی چەکەکەی هیچ بەرگەی ناگرێ
ژێردەستەکانی بە دەنگی تەپڵ لە خەو هەڵئەستێنێ

پاڵەوانەکانی ئوروک بە خەم و سکاڵاوە لە ماڵەکانیان خزاون
گلگامێش کوڕی سەربەستی بە باوک نەهێشت بو
شەو و ڕۆژ زوڵم و زۆری ئەکرد
بەڵام گلگامێش شوانی ئوروک و شورەکەیەتی
ئەو شوانە بەهێزەکەمانە قۆز و ژیرە
گلگامێش نە کچی هیچ دایکێکی بە پاکیزەیی هێشتۆتەوە
نە کیژی هیچ جەنگاوەرێک و نە دەزگیرانی هیچ پاڵەوانێک
سەرەنجام داخوا کرۆزانەوە و سکاڵاکانی بیستن

خوازنی ئاسمان خێوی ئوروکی بانگ کرد و پێی وت:
"ئەی ئارورو ئەم گا نرِندە خورتەی ئەخولقاند؟
ئەوەی کە هیچ چەکێ ناگاتە برِندەیی چەکەکەی
ژێردەستەکانی بە دەنگی تەپڵ لە خەو هەڵئەستێنێ
گلگامێش، ئەوەی کوری سەربەستی بە باوک نەهێشتوە
شەوورۆژ بە زۆر و زۆرداری خەڵک ئەچەوسێنێتەوە
لە گەڵ ئەوەی ئەو شوانی ئوروک و شورەکەیەتی
هەم شوانی ئەوانە و هەم ئەیان چەوسێنێتەوە، خورت و قۆز و ژیرە
گلگامێش نە کچێکی بە پاکیزەیی بۆ خۆشەویستەکەی هێشتۆتەوە
نە کیژی جەنگاوەرێ نە دەزگیرانی پاڵەوانێ"
کە ئانوی شکۆدار گوێبیستی سکاڵاکانیان بو
ئارووری مەزنی بانگ کرد پێی وت:
"ئەی ئارورو تۆ ئەم کابرایەت خولقاندوە
ئێستاش هاوتایەکی بۆ بخولقێنە لە دڵ و دەرون دا مێملی ئەو بێ
بۆ ئەوەی لە ململانێیەکی بەردەوام دا بن تا ئوروک بحەوێتەوە"



**گلگامێشی پاڵەوانی ئەفسانەیی دو گامێشی وەحشی ئەبەزێنێ و قاچیان ئەگرێ**

ئارورو کە ئەمەی بیست، لە دڵی خۆی دا نیگاری ئانوی هێنایە بەرچاوی
دەستەکانی شۆری، چنگێ گڵی هەڵگرت، بە هەردەکان دا وەشاندی
لە هەردەکاندا ئەنکیدوی پاڵەوانی بەهێز، لە توخمی نینورتای خولقاند
لەشی تیسکن و قژی سەری وەکو قژی سەری ژن
تاڵی موەکانی سەری وەکو پرچەکانی نیسابا بو
نە کەسی ئەناسی و نە هیچ شوێنێ، وەکو سوموگان بەرگی ئەپۆشێ

لە گەڵ ئاسکەکاندا گیا ئەخوا
لە گەڵ گیانداری کێوی دا ئەچێتە سەر کانی
دڵی بەوە خۆش ئەبێ کە گیاندارەکان لە سەر ئاوەکە مۆڵ ئەبن
راوکەرێکی تۆڕەوان جارێکیان لە سەر کانیاوەکە ئەوی بینی
رۆژێک و دوان و سێیان لە کانیاوەکە ئەیبینیەوە
نێچیروانەکە بە بینینی ئەو حەپەسا لە ترسا پەشۆکا
خۆی و نێچیرەکانی گەڕایەوە کۆڵیتەکەی
وەها تۆقی بو، هەر چوارپەلی لە جوڵە کەوت بو
دڵی داخورپا و رەنگی هەڵبزرکا
ترسی لێ نیشت، چرچاوی هەڵقرچا بو وەکو ئەوەی رێیەکی دوری بڕی بێ

ستونی سێیەم
نێچیروان هاتە لای باوکی، دەمی کردەوە، پێی وت:
"باوکە! کابرایەکی سەیرم بینی لە هەردەکانەوە هاتۆتە خوارێ
ئەو، بەهێزترینی ئەوانەیە کە لەم وڵاتەدان، خاوەن توانایەکی زۆرە
لە هێز و توانای زۆردا وەکو ئانویە
بە دەشتەکان و هەردەکان دا ئەسوڕێتەوە
لە گەڵ گیاندارانی کێوی ئەلەوەڕێ
لە گەڵ ئەوان ئاو لە سەرچاوەکە ئەخواتەوە
ترسام نەموێرا لێی نزیک بېمەوە
هەمو چاڵی تەپکەکانی هەڵم کەندبون ئەو پڕی کردونەوە
تۆڕەکانی دام نابونەوە پچڕاندونی
وای کردوە نێچیر و گیانداری کێوی لێم ئەڕەوینەوە
لە راو بەشبڕاوی کردوم"

باوکی دەمی کردەوە بە کوڕە راوکەرەکەی وت:
"کوڕم! لە ئوروک گلگامێشی لێیە
لە هێز و توانادا بێ وێنەیە
لە زەبروزەنگ دا وەکو ئانویە
بڕۆ بۆ ئوروک، بچۆ بۆ لای
هەواڵی توانای زۆری ئەم زەلامە بە گلگامێش بدە
با کەنیزێکی سۆزانیت لە گەڵ بنێرێ بیبەی بۆ ئەوێ، ئینجا ئەی نێچیروان!
لێی بگەڕێ زاڵ بێ بە سەری دا و دەستەمۆی بکا
کاتێ دێ بۆ سەرچاوەکە ئاو لە گەڵ گیاندارەکان بخواتەوە
ئەم با جلەکانی دابکەنێ و شوێنە داپۆشراوەکانی لەشی دەربخا و قەشەنگی خۆی بنوێنێ
ئەگەر چاوی پێ کەوت لێی نزیک ئەبێتەوە و بۆی ئەکشێ

ئەوسا گیاندارەکانی کە لە دەشتەکان دا لە گەڵی گەورە بون لێی دەتەکنەوە"
ئامۆژگاریەکانی باوکی لە گوێ گرت
نێچیروان چو بۆ لای گلگامێش
کەوتە رێ گەیشتە شاری ئوروک
لە بەر دەم گلگامێش دا راوەستا و پێی وت:
"کابرایەکی سەیر هەیە لە هەردەکانەوە هاتۆتە خوارێ
لە هەمو ئەوانەی ئەم وڵاتە بەهێزترە، توانایەکی بێئەندازەی هەیە
لە هێز و توانای زۆردا وەکو ئانویە
بە دەشتەکان دا ئەسوڕێتەوە و گیا ئەخوا
لە گەڵ گیاندارانی کێوی ئەلەوەڕێ و لە گەڵ ئەوان ئاو لە سەرچاوەکە ئەخواتەوە
ترسام، ئەموێرا لێی نزیک بکەومەوە
هەمو چاڵی تەپکەکانی هەڵم کەند بون ئەو پڕی کردونەتەوە
تۆڕەکانی دام نابونەوە پچڕاندونی
وای کردوە نێچیر و گیانداری کێوی لێم ئەڕەوێنەوە
لە راوی دەشت بەشبڕاوی کردوم"

گلگامێش داخافت، بە نێچیروانی وت:
"هەی نێچیروان! رابە برۆ کەنیزێکی سۆزانی لە گەڵ خۆت ببە
کاتێ ئەو دێت بۆ سەر چاوە بۆ ئاوبانی گیاندار
با ئەم جلەکانی داکەنێ و جوانیە داپۆشراوەکانی لەشی خۆی دەر بخا
ئەگەر بینی لێی نزیک ئەبێتەوە و رائەکێشرێ
ئەوسا گیاندارەکانی کە لە دەشتەکان دا لە گەڵی گەورە بون لێی دەتەکنەوە"

راوکەرەکە کەنیزێکی سۆزانی لە گەڵ خۆی برد
چمین، کەوتنە رێ
رۆژی سێیەم گەیشتنە جێی مەبەست
نێچیروان و کەنیز لە شوێنەکەدا خۆیان مەڵاس دا و مانەوە
رۆژێک و دوان لە سەرچاوەکە چاوەڕێ بون
ئینجا گیانداری کێوی بۆ ئاوخواردنەوە هاتنە سەر ئاوەکە

## ستونی چوارەم

گیاندارە کێویەکان هاتنە سەر ئاوەکە، شاد و دڵی خۆش بو
ئەنکیدو کە لە هەردەکان لە دایک بوبو
لە گەڵ ئاسکەکان دا گیای ئەخوارد و، لە گەڵ گیاندارەکان دا ئەهاتە سەر ئاوەکە
بەوە دڵی خۆش ئەبو لە گەڵ چوارپێکان دا لە سەر ئاوەکە بو
کەنیز چاوی پێ کەوت، کابرا دڕندەکەی بینی

کەنیز زەبەلاحێکی دی کە لە قوڵایی دەشتەکانەوە هاتوە
نێچیروان چرپانی بە گوێی دا:
"کەنیز! ئەمە ئەوە ئیتر مەمکەکانتی بۆ روت کە
شوێنە داپۆشراوەکانی لەشتی بۆ هەڵماڵە تا قەشەنگیەکانی ببینێ
مەسڵەمێرەوە، تێکەڵی بە، ئارەزوی تێدا بخرۆشێنە
هەر کە بینیتی لێت ئەئاڵێ
تۆش کراسەکەت فڕێ بدە، با خۆی بدا بە سەرتا
کابرای درندە فێری هونەری ژن بکە
گیاندارەکانی لە دەشتەکان دا لە گەڵی گەورە بون لێی ئەتەکنەوە
ئەگەر هۆگری تۆ بێ و خۆشی بوێی"

کەنیز مەمکی دەرهێنا، خۆی هەڵماڵی
ئەویش خۆشیی لە قەشەنگیی لەشی ئەم وەرگرت
ئەسڵەمیەوە، ئارەزوی بەتینی تێدا خرۆشان
ئەم جلەکانی داکەند، ئەویش خۆی دا بە سەری دا
کابرای درندەی فێری هونەری ژن کرد
کەوتە داوی و هۆگری بو

ئەنکیدو شەش رۆژ و حەوت شەو لە گەڵ کەنیز رایبوارد
پاش ئەوەی لە جوانیەکانی تێری خوارد
روی وەرگێرا بە لای ئاشنا گیاندارە کێویەکانی دا
بەڵام ئاسکەکان هەر کە ئەنکیدویان بینی یەکسەر هەڵیان تیزان
درندەکانی دەشتەکە لە نزیکی رەوینەوە
ئەنکیدو، تاسا، برستی لێ برا
ویستی شوێنیان بکەوێ، کەچی ئەژنۆکانی لە دوی نەئەهاتن
ئەنکیدو داهێزرا بو، وەکو جاران، نەیئەتوانی را بکا
بەڵام بو بە یەکێکی ژیر، خاوەن هەست و هۆشێکی فراوان
گەڕایەوە لە بەر پێی کەنیزدا هەڵتوتا
چاوی بڕیە دەموچاوی
گوێی بۆ شل کرد چی پێ ئەڵێ، پێی وت:
"ئەنکیدو تۆ ئێستا ژیری شێوەی خودات لێ نیشتوە
ئیتر بۆچی لە دەشتەکان دا لە گەڵ گیانداران دا ئەسوڕێیتەوە؟
وەرە بتبەم بۆ ئوروکی شورەدار
بۆ یانەی پیرۆز، نشینگەی ئانو و ئیشتار
کە گلگامێشی خاوەن زۆر و توانای لێ ئەژی
وەکو گاکێوی بە سەر هەمو خەڵک دا زاڵە"

قسەکانی لێ وەرگرت. دڵی خۆش بو چونکە ئەیویست هاورێیەکی هەبێ
ئەنکیدو وەڵامی کەنیزی دایەوە پێی وت:
"ئەی ژنەکە! بمبە
بۆ یانەی پاک، نشینگەی ئانو و ئیشتار
کە گلگامێشی خاوەن زۆر و توانای لێ ئەژی و
وەکو گاکێوی بە سەر هەمو خەڵک دا زاڵە
من روبەڕوی ئەبمەوە و بە قسەی رەق ئەیدوێنم"

## ستونی پێنجەم

لە ناو جەرگەی ئوروک دا ئەنەڕێنم: "من بەهێزترم
بەڵێ! منم ئەوەی چارەنوسەکان ئەگۆڕێ
ئەوەی لە هەردەکان لە دایک بوبێ، ئەوە بەهێزترە"
(کەنیز وتی):
"ئەی وەرە با بڕۆین تا روخسارت ببینێ
رێنوێنیت ئەکەم بۆ لای گلگامێش، من ئەزانم لە کوێیە
بەڵێ! ئەی ئەنکیدو وەرە بۆ ئوروکی شورەدار
لەوێ کە خەڵک بە جوانترین خشڵ خۆیان ئەڕازێننەوە و
هەمو رۆژێ وەکو جەژن ئاهەنگ ئەگێڕن
لەوێ.... کوڕان...
کچانی... قەشەنگ
بۆنی عەتریان لێ دێ
مەزنەکان کێش ئەکەن بۆ ناو خەوتنگەکانیان
تۆش ئەی ئەنکیدو کە بە تەمای خۆشگوزەرانیت
گلگامێشی ئەهلی رابواردنت پیشان ئەدەم
ئەبێ سەیری بکەیت و لە روخساری بڕوانی
ئەیبینی بە پیاوەتی و توانای خۆیەوە ئەنازێ
لەشی بە رابواردن و ئارەزو رازاوەتەوە
لە تۆ بە تواناترە، شەو و رۆژ ناسرەوێ
تۆش ئەی ئەنکیدو واز بێنە لە غەڕایی و خۆهەڵکێشان
شاماش ئاگای لە گلگامێشە و خۆشی ئەوێ
ئانو و ئینلیل و ئایا تێگەیشتنێکی زۆریان پێ بەخشیوە
پێش ئەوەی تۆ لە هەردەکانەوە بجمێی
گلگامێش لە ئوروک تۆ لە خەودا ئەبینێ"

بە راستی گلگامێش لەو کاتەدا لە خەو بێدار بوەوە
دەستی کرد بە گێڕانەوەی خەونەکەی بۆ دایکی، وتی:

"دایکە! دوێشەو خەونێکم دیوە
بینیم من بە فیزەوە بە ناو پاڵەوانەکان دا دەڕۆیشتم
ئەستێرەکانی ئاسمان دەرکەوتن
یەکێکیان، وەکو هەسارەی ئاسمانیی ئانو، بە سەر من دا کەوت
ویستم لە سەر خۆمی لابدەم قورس بو نەمتوانی
ویستم بیلەقێنم نەمتوانی بیجوڵێنم
خەڵکی ئوروک لێی کۆبونەوە
خەڵک تێی وروکان و پاڵیان بەیەکەوە ئەنا
پاڵەوانەکان دەوریان دا
هاورێکانم قاچیان ماچ ئەکرد
منیش خۆشم ویست و دانەویمەوە بۆی وەکو چۆن بۆ ژنێ دائەنەوم
هەڵمبڕی و هاویشتمە بەر پێت
تۆش کردت بە هاوتای من"

نینسون، دایکی گلگامێش، بینای زانا، شارەزای هەمو شت، بە گلگامێشی وت:
"بینینی ئەستێرەی ئاسمان، هاوتاکەتە
کە وەکو هەسارەی ئاسمانیی ئانو بە سەر تۆدا کەوت
ئەوەی ویستت لایبەری و قورس بو نەتتوانی
ویستت بیلەقێنی و نەتتوانی
تۆش خۆشت ویست و بۆی دانەویتەوە وەکو چۆن بۆ ژنێ دائەنەوی
ئینجا هاویشتتە بەر پێی من
من خۆم کردومە بە هاوتای تۆ
ئەوە هاوەڵێکی بەهێزە، لە تەنگانەدا دۆستێکی هاوکارە
بەهێزترینی وڵاتە و خاوەن زاتێکی پتەوە
وەرەی وێنەی وەرەی ئانویە خاوەن توانایەکی زۆرە
ئەوەش کە تۆ خۆشت ویستوە و بۆی دانەویوی وەکو چۆن بۆ ژنێ دائەنەویت
واتە لە گەڵت ئەبێ و دەستت لێ بەر نادا
ئەمەیە لێکدانەوەی خەونەکەت"

ئینجا گلگامێش خەونێکی تری بۆ دایکی گێڕایەوە:
"دایکە! خەونێکی ترم دیوە
لە ئوروکی شورەداردا تەورێک دانرا بو
خەڵکی ئوروک لێی کۆبونەوە و تێی وروکان
منیش حەزم لێ کرد، بۆی دانەویمەوە وەکو ژن بێ
ئینجا هاویشتمە بەر پێت تۆش کردت بە هاوتای من"

دایکی گلگامێش، دانای خۆشەویست، بە کورەکەی وت
نینسون، دانای بینا، بە گلگامێشی وت:
"ئەو تەورەی بینیوتە، پیاوە
ئەوەش کە خۆشت ویستوە و بۆی دانەویوی کە وەکو بۆ ژن دانەویتەوە
من ئەیکەم بە هاوتای تۆ
لێکدانەوەکەی ئەوەیە: هاورێیەکی بەهێز، دۆستێکی هاوکار، دێتە لات
بەهێزترینی وڵاتە و خاوەن زاتێکی پتەوە
وەی وێنەی ورەی ئانویە خاوەن توانایەکی زۆرە"
گلگامێش دەمی کردەوە بە دایکی وت:
"خۆزگە ئەم دوقڵانەیە، بە ویستی ئینلیلی مەزن، ئەهاتە دی
هاورێیەکم ئەبو دۆستێکی ئامۆژگاریکار بوایە
منیش ئەبومە هاورێ و دۆستی دڵسۆزی ئەو"

## خشتی دوەم

لە کاتێک دا گلگامێش لێکدانەوەی خەونی دوەمی ئەپرسی
کەنیز ئەنکیدوی ئەدوان، ئەویش لە بەردەمی دا هەڵتوتا بو
هەردوکیان خەریکی خۆشەویستی و رابواردن بون
ئەنکیدو هەردەکانی شوێنی لە دایکبونی خۆی لە بیر چوبوەوە
ئەنکیدو شەش رۆژ و حەوت شەوی بە دڵداری لە تەک کەنیز بەسەربرد
ئینجا کەنیز بە ئەنکیدوی وت:
"ئەنکیدو هەرچەند سەیرت ئەکەم، لای من لە خوا ئەچی
لە بەرچی بە دەشتەکان دا ئەسورێیتەوە و لە گەڵ گیانداران ئەلەوەرێی
وەرە با من دەستت بگرم بتبەم بۆ ئوروکی پڕ لە بازاڕ
بۆ یانەی پیرۆزی نشینگەی ئانو
هەستە ئەنکیدو دەستت بگرم بتبەم بۆ ئایئانا نشینگەی ئانو
ئەو جێیەی گلگامێشی توانا و بەکاری لێیە
ئەوسا تۆ چەندە خۆتت خۆش ئەوێ ئەوەندەش ئەوت خۆش ئەوێ
دەی رابە لە سەر ئەرزی مافوری شوانان"

قسەکانی بیست و لە گوێ گرت
ئامۆژگاری ژنەکە کاری کردە دڵی بە قسەی کرد
ئەویش کراسەکەی کرد بە دو کەرتەوە
نیوەی کردە بەری ئەو، خۆیشی نیوەکەی تری پۆشی
پەلی گرت وەکو چۆن پەلی منداڵ ئەگیرێ
بردی بۆ کۆڵێتی شوانەکان، بۆ لای کۆزەکان
شوانەکان لێی کۆبونەوە

## ستونی سێیەم

بە شیری گیانلەرانی کێوی پەروەردە بوبو
کاتێ نانیان بۆ دانا سەری سوڕما و پەشۆکا
بە وردی تێی ڕوانی
بەڵێ ئەنکیدو نازانێ چۆن نان ئەخوات
چونکە بە مژینی شیری گیانداری کێوی ڕاهاتبو
فێر نەکرابو بادەی بەهێز چۆن ئەخورێتەوە
کەنیز دەمی کردەوە بە ئەنکیدوی وت:
"ئەنکیدو! نانەکە بخۆ ئەمە مایەی ژیانە
بادە بەهێزەکە بخۆرەوە ئەمە نەریتی وڵاتە"

ئەنکیدو لە نانەکەی خوارد تا تێر بو
لە بادە بەهێزەکەش حەوت پەرداخی خواردەوە
گیانی کەوتە فڕین و سنگی کرایەوە، دڵی خۆش بو، ڕوی گەشایەوە
لەشە تیسکنەکەی پاک کردەوە بە ڕۆن چەوری کرد
بو بە مرۆڤ، بەرگی پۆشی وەک زاوای لێ هات
چەکەکەی هەڵگرت کەوتە ڕاونانی شێرەکان بۆ ئەوەی شوانەکان بە شەو ئاسودە بن
گورگی ڕەتاند و شێری بەزاند
شوانەکان توانییان بە شەو بە دڵنیایی هەڵناژێن
ئەنکیدو بو بە پاسەوان و یاریدەدەریان
ئەوە پیاوی بەهێز و یەکە پاڵەوان
......

## ستونی چوارەم

......
ئەنکیدو دڵخۆش بو، بەزم و ئاهەنگی گێڕا
کە چاوی هەڵبڕی کابرایەکی بینی
بە کەنیزی وت: "هەی کەنیز! ئەو کابرایەم بۆ بێنە
بۆچی هاتوە بۆ ئێرە؟ ئەمەوێ ناوی بزانم"
کەنیز کابرای بانگ کرد، هاتە لای، بینی و پێی وت:
"کابرا پەلەی چیتە؟
لەبەرچی ئەم ڕێ سەختەت پێواوە؟"
کابرا دەمی کردەوە بە ئەنکیدوی وت:
"هەڵی کوتاوەتە سەر یانەی کۆبونەوە کە دانراوە بۆ خەڵک و بۆ زەماوەن
ئەنگی و گڵاویی لە شارەکەدا بڵاو کردۆتەوە
ڕەوشتی قێزەون و بێگاری بە سەر شارە ئەگبەتەکەدا سەپاندوە
تەپڵیان تەرخان کردوە بۆ شای ئوروکی خاوەن بازاڕەکان

بۆ ئەوەی بە پێی دەنگەکەی، ئەو بوکە هەڵبژێرێ کە ئارەزوی لێیەتی
بۆ گلگامێش، شای ئوروکی خاوەن بازاڕ، تەپڵ لێ ئەدرێ تا بوک هەڵبژێرێ پێش هاوسەرەکەی
ئەو، لە پێش مێردەکەی دا، ئەبێ بە زاوای یەکەم
(ئەوان ئەڵێن) خودا وای ویستوە
بڕیاری بۆ دراوە لەوەتی ناوکی براوە"
کابرا کە ئەم قسانەی گێڕایەوە ئەنکیدو روی گرژ بو
.....

## ستونی پێنجەم

ئەنکیدو پێش کەوت، کەنیزیش لە دوایەوە
کاتێ گەیشتە ناو ئوروکی خاوەن بازاڕی گەورە
خەڵک لێی کۆبونەوە
کاتێ لە شەقامی ئوروک، لە شوێنی بازاڕ، راوەستا خەڵک لێی گردبونەوە، ئەیان وت:
"ئەمە لە بیچم دا هاوتای گلگامێشە
بەڵام باڵای لەو کورتترە و ئێسقانی لەو پتەوترە
بەهێزترینی ئەوانەی دەشتەکانە، خاوەن توانای زۆرە
شیری گیانداری دەشتەکانی خواردوە
ئوروک دەنگی تەقەتەقی چەکی لێ نابڕێ"
پاڵەوانەکان خۆشییان پێ کەوت و وتیان:
"پاڵەوانێکی ملۆزم بۆ پاڵەوانە قوزەکە پەیدا بوە
بەڵێ بۆ گلگامێش، هاوشێوەی خودا، هاوتا و هاووێنەی بۆ پەیدا بوە"
کە خەوتنگەیان بۆ ئاشخارا ئامادە کرد
گلگامێش هاتە نزیکی بۆ ئەوەی شەو بچێتە پاڵ خواژن
ئەنکیدو لە سەر رێی دا وەستا رێگەی چونە ژورەوەی لە رودا داخست

## ستونی شەشەم

.......
گلگامێش ئەنکیدوی خرۆشاوی بینی
کە لە هەردە لە دایک بوە و قژە درێژەکەی سامی داوە بە سەری
هەڵی کوتایە سەری و پەلاماری دا
.......
لە بازاڕی وڵات دا بە یەک گەیشتن
ئەنکیدو  بە قاچ دەرگای ماڵەکەی لە گلگامێش گرتوە
رێی نەدا گلگامێش بچی بۆ ناو خەوتنگاکە
باوەشیان کرد بە یەکتری دا

زۆرانیان ئەگرت، وەکو دو گاکێوی ئەیانبۆڕاند
ئەستونی دەرگاکەیان شکان و دیوارەکە لەرزی
هەردوکیان یەکتریان گرت بو
گلگامێش و ئەنکیدو وەکو دو گاکێوی خۆیان ڕاگرت بو، یەکتریان ئەهێنا و ئەبرد کاتێ گلگامێش دانەویەوە و پێی لە زەوی گیر کرد بو (بۆ ئەوەی ئەنکیدو بەرز بکاتەوە) ئاوڕی دایەوە ویستی بەردەوام بێ
بەڵام توڕەبونەکەی نیشتەوە
کە توڕەبونەکەی نیشتەوە ئەنکیدوش پێی وت:
"تۆ یەکە پیاوی، دایکێ تۆی بوە، نینسون، چێڵی کێوی پیرۆزە،
ئینلیل سەری بە سەر خەڵک دا بەرز کردی
شاهێتی مرۆڤی بە تۆ بەخشی"

## خشتی سێیەم

## ستونی یەکەم

(سەرەتاکەی شێواوە.
بۆ ئەوەی ڕوداوەکانی پێکەوە ببەسترێنەوە لە گەڵ پاشماوەی خشتەکانی چوارەم و پێنجەم و شەشەم لێک دراون

....

وا دەرئەکەوێ گلگامێش و ئەنکیدو بون بە هاوڕێ گلگامێش لە کابرایەکی زۆرداردەوە گۆڕاوە بۆ کەسێکی تر کە ئەیەوێ بچێ بۆ جەنگەڵی دارکاژ خومبابا ڕەمزی بەدیی لە ناو ببا.

.......

ئەنکیدو گەرەکێتی ژیوانی بکاتەوە)

لە بەر چی گەرەکتە ئەم کارە ئەنجام بدەی؟
بۆچی بڕیارت داوە بچی بۆ جەنگەڵەکە؟

.....

یەکتریان ماچ کرد و پەیمانی دۆستایەتییان بەست

.....

دایکی گلگامێشی، شارەزای هەمو شت، دەستی بۆ شاماش بەرز کردەوە

## ستونی دوەم

........

دڵی ئەنکیدو پڕ بو لە خەم، چاوەکانی پڕ بون لە فرمێسک
هەناسەی ساردی هەڵکێشا
گلگامێش دڵی دایەوە پێی وت:

"هاورێ! بۆچی چاوەکانت فرمێسکیان تێ زاوە
دڵت پڕ بوە لە خەم، هەناسەی سارد هەڵ ئەکێشێ؟"
ئەنکیدو دەمی کردەوە بە گلگامێشی وت:
"هاورێ! وا هەست ئەکەم خەریکە ئەخنکێم
هەردو باسکم داهێزراون
تینوتاوم تێدا نەماوە"

گلگامێش روی دەمی کردە ئەنکیدو وتی:
"لە جەنگەڵەکە خومبابای ترسناکی لێیە
با بچین من و تۆ بیکوژین
بۆ ئەوەی بەدیی لە سەر ئەرز بسڕینەوە"
....
ئەنکیدو دەمی کردەوە بە گلگامێشی وت:
"هاورێ! کاتێ لە دەشتەکان و هەردە بەرینەکان دا
لە گەڵ گیاندارەکان دا ئەسوڕامەوە، زانیم
جەنگەڵەکە لە هەر لایەکیەوە ماوەی دەهەزار سەعات درێژ ئەبێتەوە
کێ ئەوێرێ بچێتە ناو قوڵاییەکەیەوە
نەڕەی خومبابا وەکو گرمەی تۆفانە
ئاگر لە دەمی دەر دێ، هەناسەکانی کوشندەن!
لە بەرچی گەرەکتە ئەم کارە ئەنجام بدەی؟
کەس ناتوانێ پەلاماری خومبابا بدا"
گلگامێش دەمی کردەوە بە ئەنکیدوی وت:
"بریارم داوە بە چیاکانی دارکاژدا هەڵ زنێم
بچمە ناو جەنگەڵەکەوە، بۆ ناو نشینگەی خومبابا
لە گەڵ خۆم تەورێ ئەبەم شەڕی پێ بکەم
تۆ بۆ خۆت لێرە بە، من بە تەنیا ئەڕۆم"
......
ئەنکیدو دەمی کردەوە بە گلگامێشی وت:
"چۆن ئەتوانین بچینە ناو جەنگەڵی دارکاژەوە،
پاسەوانەکەی، ئەی گلگامێش، جەنگاوەرێکە خەو ناچێتە چاوی؟
......
ئینلیل دایناوە جەنگەڵی دارکاژ بپارێزێ
بیچمەکەی وا دارشتوە خەڵک بترسێنێ
نەڕەی خومبابا وەکو گرمەی تۆفانە"
گلگامێش دەمی کردەوە بە ئەنکیدوی وت:
"هاورێ! کێ ئەتوانێ هەڵکشێ بۆ ئاسمان

تەنیا خواکانن کە هەتا سەر لە گەڵ شاماش ئەژین
بەڵام ڕۆژگاری مرۆڤ دیاری کراوە
هەرچییان کردوە بە با ئەچێ
کەچی تۆ وەهات لێ هاتوە هێمان ئێمە لێرەین لە مردن ئەترسی
ئەی کوا هێزی قارەمانێتییەکەت
کەواتە من پێشت ئەکەوم با دەنگی تۆ بانگم بکا: پێشکەوە، مەترسە!
ئەگەر کوژرام ناوم ئەمر ئەبێ. ئەوەکانی داهاتو کە لە دایک ئەبن پێم ئەڵێن:
گلگامێش لە زۆرانی خومبابای دێودا کوژراوە"
........
"بەم قسانەت دڵتەنگت کردوم
من دەستم درێژ ئەکەم و درەختەکانی کاژ ئەبڕم
بۆ ئەوەی ناوێکی ئەمر بۆ خۆم دروست بکەم
هاوڕێ! فەرمان دەر ئەکەم بۆ چەکسازەکان. بە ئامادەبونی خۆمان چەکمان بۆ دروست بکەن"

فەرمان دەرچو بۆ چەکسازەکان. ئەوانیش کۆبونەوە و کەوتنە ڕاوێژ
چەکی گەورەیان دروست کرد: تەوریان دارشت هەریەکەیان سێ وەزنە بو
شمشێری گەورەیان دارشت دەمی هەر یەکێکیان دو وەزنە و مشتۆکانیان سی مەن و، کێلانەکانی لە زێڕ هەریەکەیان سی مەن بو
گلگامێش و ئەنکیدو چەکدار بون بە چەکی هەر یەکەیان دە وەزنە بو

خەڵک لە شەقامەکانی ئوروک لە بەر دەرگای حەوت لاشیپانەیی دا کۆبونەوە
خەڵک گلگامێشی لە کۆڵانەکانی ئوروکی خاوەن بازاڕدا بینی
پیرەکانی ئوروک لە بەردەم گلگامێش دا هەڵتروشکان، ئەویش قسەی بۆ کردن. بەمجۆرە بۆیان دوا:
"ئەی پیرەکانی ئوروکی خاوەن بازاڕ گوێ بگرن
ئەمەوێ، من گلگامێش، ببینم ئەوەی باسی ئەکەن
ئەوەی ناوەکەی وڵاتانی لە ترس پڕ کردوە
بڕیارم داوە لە جەنگەڵی کاژدا بە سەری دا زاڵ بم
وڵات هەواڵی کوڕی ئوروک ببیستێ
دەربارەی من بڵێن: ئەوەی ئوروک چەند ئازا و خورتە!
دەستم درێژ ئەکەم. دارکاژ ئەبڕم بەوەش ناوێکی ئەمر بۆ خۆم تۆمار ئەکەم"

پیرەکانی ئوروکی خاوەن بازاڕ وەڵامیان دایەوە. بە گلگامێشیان وت:
"ئەی گلگامێش تۆ هێمان لاوی و
ئەنجامی ئەوەی بە تەمای بیکەی نازانی
ئێمە بیستومانە خومبابا بیچمێکی سەیر و ترسناکی هەیە
کێ بەرگەی چەکەکانی ئەگرێ؟

لێرەوارەکەش لە هەمو لایەکیەوە دەهەزار سەعاتی دوبارە درێژ ئەبێتەوە
کێ ئەتوانێ بچێتە ناویەوە
ئەرەی خومبابا وەکو گرمەی تۆفانە
ئاگر لە دەمی دەردێ و هەناسەکانی کوشندەن
لەبەرچی ئارەزوی ئەنجامدانی ئەم کارەت هەیە
کەس بەرگەی خومبابا ناگرێ"

کاتێ گلگامێش ئەم قسانەی لە ئامۆژگاریکارەکانی بیست لە دەوری خۆی روانی و روی کردە هاورێکەی و پێکەنی، وتی:
"هاورێ! چۆن وەڵامیان بدەمەوە؟
وەڵامیان بدەمەوە بڵێم من لە خومبابا ئەترسم؟
بە درێژایی ژیانم ئیتر لە ماڵ دەرناچم؟
........
ئینجا پیرەکانی ئوروک بە گلگامێشیان وت:
"بە هیوای ئەوەی خوای پارێزەر پشتیوانت بێ
بە هیوای ئەوەی بە سەلامەتی لە رێگەی گەرانەوەت دا بتگێرێتەوە
بە سەلامەتی بتهێنێتەوە بۆ مینای ئوروک"

ئینجا گلگامێش کرنوشی بۆ خوا شاماش برد و نزای کرد
"ئەی شاماش من ئەرۆم دەستی نزا بۆ تۆ هەڵئەبرم
بە سەلامەتی بمهێنەرەوە بۆ مینای ئوروک
بە هیوای ئەوەی گیانم چاکە و فەری بەر بکەوێ"
ئینجا گلگامێش هاورێکەی داوا کرد و بەختی لێ پرسی

## خشتی شەشەم

فرمێسک بە روی گلگامێش دا هاتە خوارێ
.......
چەکەکانیان بۆ هێنا و شیرە گەورەکانیان پێدا کرد
کەوان و تیریان دایە، تەورەکانی هەڵگرت
کەوانی ئەنشانی کردە شانی و شیرەکەی کرد بە قەدی دا
خەڵک هاتن بۆ لای گیل گامێش و هیوای گەرانەوەی زویان بۆ خواست
پیرەکان دەستخۆشییان لێ کرد و ئامۆژگارییان بۆ سەفەرەکەی پێ دا
پێیان وت:
"شاها! ئێمە لە ئەنجومەنی راوێژدا گوێرایەڵی تۆ بوین
تۆش گوێ لە ئێمە بگرە پێرەوی ئامۆژگاریەکانمان بکە

بە تەنیا پشت بە هێزی خۆت مەبەستە
لە کارەکەت ورد بەرەوە و خۆت بپارێزە
با ئەو پێش بکەوێ تۆ بکەوەرە دوای
با ئەنکیدو لە پێشتەوە بڕوا، ئەو ڕێگاکە شارەزایە پێشتر پێی دا ڕۆیشتوە
ڕێگەی جەنگەڵی دارکاژ بەڵەدە، با بچێتە ناو کون و کەلێنەکانیەوە
ئەوەی لە پێشەنگ دا بێ هاوڕێکەی ئەپارێزێ
با وریا بێ و، هوشیاری پاراستنی خۆی بێ
خۆزگە شاماش ئارەزوەکانی بە دی ئەهێنای
خۆزگە چاوەکانت ئەوەی بدیایە کە بە دەم وتت
خۆزگە کوێرەڕێ داخراوەکانی بۆ ئەکردیتەوە
ڕێگەی ڕۆیشتنی بۆ خۆش ئەکردی و گەوەی شاخەکانی لە بەر پێت دا تەخت ئەکرد
خۆزگە شەو مایەی خۆشی و شادی بۆ ئەهێنای
خۆزگە لوگالباندا پشتگیری ئەکردی
وای لێ بکردیتایە ئارەزوەکانت بێنە دی
وەکو منداڵ ئاواتەکانت جێبەجێ بونایە
پاش کوشتنی خومبابا، کە تۆ بۆی ئەچی، هەردو پێت بشۆرە
لە حەسانەوەی ئێوارەدا چاڵاوێ هەڵکەنە
با جەوەندەکەت هەمیشە پڕ بێ لە ئاوی پاک
ئاوی سارد لە شاماش نزیک بکەرەوە
ئاوی لوگالباندا سەروەر بڵێرەوە"

## ستونی سێیەم

گلگامێش دەمی کردەوە بە ئەنکیدوی وت:
"ئەی هاوڕێ با بچین بۆ پەرستگای ئەیگالما
بۆ بەردەم نینسون، شاژنی مەزن
نین سونی دانای بینای هەمو شت زان
ئامۆژگاریمان ئەکات و هەنگاوەکانمان پێەو ئەکا"

گلگامێش و ئەنکیدو بەرەو ئەیگالما چون
گلگامێش چوە بەردەم نینسون، شاژنی مەزن
گلگامێش چوە ژورەوە و لێی نزیک بوەوە، وتی:
"ئەی نینسون! بڕیارم داوە کارێکی گەورە بکەم
بە تەمای سەفەرێکی دورم بۆ نشینگەی خومبابا
ئەچم بۆ شەڕێ ئەنجامەکەی نازانم
بە تەمای پێوانی ڕێگایەکم تولەڕێکانی شارەزا نیم
تا ئەو ڕۆژەی تێی دا ئەڕۆم و ئەگەڕێمەوە

تا ئەگەمە جەنگەڵی گەورەی دارکاژ و
خومبابا ئەکوژم و
هەرچی بەدییەک لە سەر روی ئەرزە، شاماش رقی لێیەتی، ئەیسڕمەوە
لای شاماش بۆم بپاڕێرەوە"

ئەودەم نینسون چوە ژورەکەی خۆی
کەوایەکی پۆشی شایستەی لەش و لاری بێ
خشڵێکی رازاوەی کرد بە خۆی تا شایستەی سنگی بێ
تاجێکی نایە سەری
ئینجا سەرکەوتە سەربان و پێشکەوت بۆ لای شاماش
بوغوردی سوتان
قوربانیی پێشکەش کرد و دەستی بۆ شاماش هەڵبڕی، وتی:
"بۆچی دڵێکت داوە بە کوڕەکەم نائارامە ئۆقرە ناگرێ؟
ئێستاش هانت داوە سەفەرێکی دور بکا بۆ نشینگەی خومبابا
توشی شەڕێ ئەبێ ئەنجامەکەی نازانێ
ڕێگایەک ئەپێوێ ڕێچکەکانی شارەزا نیە
تا ئەو ڕۆژەی تێی دا ئەڕوا و ئەگەڕێتەوە
تا ئەگاتە جەنگەڵی دارکاژ و
خومبابا ئەکوژێ
هەرچی بەدییەکی لە سەر روی ئەرزەو تۆ رقت لێیەتی ئەسڕێتەوە
خۆزگە بوکەکەت دای بیری ئەخستیتەوە
تا بە پاسەوانی شەو و ئەستێرە و سینی داوکتی بسپێری
کاتێ تۆ لە ئاسمان ئاوا ئەبی"

## ستونی چوارەم

......

ئینجا بغوردی کوژاندەوە، کەوتە نزاکردن، ڕەبەنەکان و کەنیزەکە پیرۆزەکان و زێوانەکانی کۆکردەوە
ئەنکیدوی بانگ کردە لای خۆی، ڕاسپاردەی دایە، وتی:
"ئەی ئەنکیدوی خورت، ئەگەرچی لە منداڵدانی من دا نەگوراوی
بەڵام لە ئێستاوە تۆم کرد بە کوڕی خۆم"
ئینجا ملوانکەیەکی گەوهەری کردە ملی بۆ ئەوەی لێی دڵنیا بێ
پێی وت:
"وا من ئێستا متمانەت پێ ئەکەم کوڕەکەمت پێ بسپێرم بە سەلامەت بۆم بگەڕێنەرەوە"
..........

پاش بیست سەعاتی دوبارەی سەفەر بە توێشویەکی کەم
پاش سی سەعاتی دوبارە راوەستان بۆ بەسەربردنی شەو
ماوەی سەفەری مانگ و نیوێکیان بە سێ رۆژ بڕی
چاڵاوێکیان هەڵکەند و لە خوا شاماش نزیک بونەوە
پاش ئەوەی ئەو رێ درێژەیان پێوا گەیشتنە نزیک دەراوی جەنگەڵ
دەراوێکی سەیر بو دیمەنەکەی سەری سورمانن، هێشتا نەگەیشتبونە جەنگەڵ
دیمەنی درەختی کاژ لە دەراوەکەی دا سەرنجی راکێشان
بەرزاییان حەفتاودو باڵ و پانیی دەراوەکەش بیست و چوار باڵ بو

دێوێکیان بینی خومبابا لەوێ دانا بو بیپارێزێ
ئەنکیدو، گلگامێشی هاورێی هان دا پێش بکەوێ
بۆ ئەوەی پاسەوانەکە بگرێ بەر لەوەی چەکەکەی لێ بسێنێ
گلگامێش غیرەت گرتی، هەردو هاورێ بە پەلە پەلاماریان دا و کوشتیان
بەڵام کە ئەنکیدو ویستی بچێتە ناو جەنگەڵەکە
بە هۆی دەرگا ئەفسوناویەکەوە هێزی لە بەر بڕا. گلگامێشی گاز کرد، لە هاتن هوشیاری کردەوە
بەڵام گلگامێش هاورێکەی هان دا پێی وت:
"پاش ئەوەی ئەم هەمو نارەحەتیەمان دی و
ئەم رێگە دورەمان پێوا ئەشێ بە نائومێدی بگەرێینەوەی بۆ ئەو جێیەی لێوەی هاتوین؟
تۆ کە شەڕ و چورتمت دیوە. غیرەت بدە بەر خۆت و لە گەڵم بە
ئازایەتیەکەتت بۆ دێتەوە، ترس و سستیت ئەرەوێتەوە
ئاخۆ هاورێکەم شایانی ئەوەیە سڵ بکاتەوە و دوا بکەوێ؟
نەخێر هاورێ ئەبێ بڕۆین بۆ پێشەوە بچینە ناو جەرگەی جەنگەڵەکەوە
هەر یەکەمان ئەویتر بپارێزێ، خۆ ئەگەر لەم شەڕەدا گلاین
دوای خۆمان ناوێکی ئەمر بەجێ ئەهێڵین"

هەردو پاڵەوان لە دەراوی جەنگەڵ تێپەڕین گەیشتنە ناوجەرگەکەی، چیای سەوزیان بەدی کرد، لە دیمەنی جەنگەڵی دارکاژ و جوانیە ئەفسونیەکەی سەریان سوڕما. شوێنپێی دێوی جەنگەڵ خومبابایان هەڵگرت لە ناو ئەوانەی بینییان کێوی کاژی تایبەت بە ماخوایان بینی کە تەختی ماخوا ئەرنینی نیشتار بو کە دارکاژەکان لەبەردەم ئەو کێوەدا بە بەرزیی سێبەریان کرد بو کە خۆشی و شادییان ئەهێنا

لە کاتی ئاوابونی رۆژدا گلگامێش چاڵاوێکی هەڵکەند و نزیک کەوتەوە بە شاخەکەدا هەڵزنا و ئاوی پیرۆزی رشت و توێشوی دەرهێنا
داوای لە کێوەکە کرد خەوێکی پێ ببینێ مزگێنی شادی بداتێ
ئینجا هەردو هاوەڵ بۆ حەسانەوە هەڵئاژیان زۆرزو خەویان لێ کەوت
گلگامێش خەونێکی دی
لە خەو هەستا خەونەکەی بۆ هاوەڵەکەی گێڕایەوە وتی:

"کێ بو بە ئاگای هێنام ئەگەر تۆ نەبویت؟
هاورێ خەونێکم دی، بینیم ئێمە لە بناری کێوێک دا راوەستا بوین
لە ناکاو کێوەکە هەرەسی هێنا، ئێمەش، من و تۆ، وەکو دو مێشی پچکۆلە بوین
لە خەونی دوەم دا بینیم کێوەکە هەرەسی هێنا
بە سەر من دا روخا و قاچی گرتم. ئینجا روناکیەکی بلێسەدار دەرکەوت پرشنگی بڵاو بوەوە بە سەر ئەرزدا
منی لە ژێر کێوەکەدا دەرهێنا و ئاوی دەرخوارد دام دڵم خۆش بو"
ئەنکیدو وەڵامی گلگامێشی هاوەڵی دایەوە و خەوەکەی بۆ لێکدایەوە وتی:
"خەونەکەت، هاورێ، مانایەکی باشی هەیە و مژدەیەکی خۆشە
ئەو کێوەی بە سەرتا روخا خومبابایە، ئێمەش بە سەری دا زاڵ ئەبین و ئەیکوژین"
دیسان بە کێوەکەدا هەڵزنانەوە گلگامێش خەونێکی تری دی وای لێکدایەوە مژدەی سەرکەوتنیانە لە روبەروبونەوەی دێو خومبابا دا

دەمی روبەروبونەوەی یەکلاکەرەوە نزیک بوەوە، کاتێ گلگامێش بە وەشاندنی تەورەکەی دەستی کرد بە برینەوەی دارکاژەکان، خومبابا دەنگەکەی بیست
تورە بو، خرۆشا و ئەڕاندی:
"چ بێگانەیەک هاتۆتە ناوەوە
هێمنی جەنگەڵ و ئەونەمامە تازەکانی لە کێوەکەم دا تێک داوە؟
کێیە دارکاژەکان ئەبڕێتەوە؟"
خومبابا خۆی ساز دا بۆ پەلاماردانیان، هەردو هاوەڵ ترسیان لێ نیشت
لە سەرەڕۆیی خۆیان و لە هاتنیان بۆ ناو جەنگەڵی دارکاژ ژیوان بونەوە
لە خوا شاماش پارانەوە پشتیوانییان بێ لەم چورتمە دەربچن
خوا بە هاواریانەوە چو، پرسەکە هەڵگەڕایەوە
شاماش گێژەڵوکەیەکی توندی هەڵکرد، کردی بە گژ خومبابا دا
شپرزەی کرد، لە جوڵەی خست، خۆی دا بە دەستەوە
پاڕایەوە نەیکوژن، بێتە نۆکەری دیلی گلگامێش و
جەنگەڵی جادولێکراو و درەختەکانی بکاتە موڵکی ئەو
گلگامێش دڵی نەرم بو خەریک بو وازی لێ بهێنێ، بەڵام ئەنکیدوی هاورێی هانی دا بیکوژێ، کوشتیان و سەریان بڕی

## خشتی شەشەم

گلگامێش قژە درێژەکەی شۆرد و چەکەکەی تیژ کرد
پرچەکانی بە سەر شانی دا بەردایەوە
جلە چڵکنەکانی داکەند بەرگی خاوێنی پۆشی
بە خشڵی جوان خۆی رازانەوە
کاتێ تاجەکەی دایە سەری

ئیشتاری شکۆدار چاوی هەڵبڕی
لە قەشەنگیی گلگامێشی نۆڕی، گازی کرد:
"گلگامێش! وەرە ببە بە هاوسەری هەڵبژێردراوم
تۆوی خۆتم پێ ببەخشە خۆشیی لێ وەربگرم
تۆ ببە بە مێردم و منیش ئەبم بە ژنت
گالیسکەیەکت بۆ سازئەکەم لە بەردی لاجیوەرد و لە زێڕ
پێچکەکانی لە ئاڵتون و شاخەکانی لە برونز بێ
بۆ راکێشانی لە باتی ئێستری گەورە دێوی بروسکەی لێ ئەبەستین
کە هاتیتە ناو ماڵەکەوە بۆنی دارکاژی لێ هەڵبسێ
ئەگەر بچیتە ناوی لاشیپان و سەکۆکانی پێشوازی قاچەکانت بکەن
شا و سەردار و گەورەکان لە بەرامبەرت دا بچەمنەوە
لە بەروبومی دەشت و شاخ سەرانەت بدەنێ
بزنەکانت سێ سێیان بێ و مەڕەکانت دودو و کەرەکانیشت باری قورستر لە ئێستر هەڵبگرن
ئەسپەکانی گالیسکەکەت لە پێشکەوتنا ناوبانگ دەر بکەن
گاکانت بە نیرەکانی ملیانەوە نمونەیان نەبێ"
گلگامێش دەمی کردەوە، وەڵامی ئیشتاری شکۆداری دایەوە:
"ئەبێ چیت بدەمێ ئەگەر کردمیت بە ژنی خۆم؟
ئایا رۆن و بەرگت بدەمێ بۆ لەشت؟
ئایا نان و خواردنت بدەمێ
کام خۆراک و بادەت بدەمێ شایستەی خەندەی خوایانەیە؟
...............
چ خێرێکم پێ ئەبڕێ ئەگەر تۆم هەڵبژارد بە ژنی خۆم؟
تۆ کوانویەکی لە سەرمادا ئاگرەکەی دائەمرکێتەوە
تۆ دەرگایەکی پشتەوەی باو و بۆران ناگێڕێتەوە
تۆ تەلارێکی پاڵەوانەکان لە ناوی دا ئەشکێن
تۆ قیرێکی هەرکەس هەڵت بگرێ پیسی ئەکەی
تۆ تاوێرێ مەرمەڕی دیوارەکەی ئەروخێنی
تۆ بەرێتکی دوژمن کێش ئەکەیت و تاوی ئەکەی
تۆ پاپوجێکی هەرکەس لە پێی بکا قاچی ئەگەزی
کام دڵدارت هەتاسەر خۆش ویست؟
کام هاودەمت توانی هەتاسەر رازیت بکا؟
وەرە با کوێرەوەریەکانی دڵدارەکانت بۆ بگێڕمەوە:

لە پێناوی تەموز دا، خۆشەویستی منداڵیت،
ساڵ لە دوای ساڵت بە گریان و دوکەدوک بە سەر برد

حەزت لە مەلی قومری کرد
کەچی لێت دا و باڵت شکاند
وا ئێستا خراوەتە باخەوە بە کڕوزانەوە ئەچریکێنێ:
ئای باڵم! وای باڵم!
حەزت لە شێری تەوانا کرد
کەچی بۆ ئەوەی بیگلێنی حەوت حەوت چاڵت بۆ هەڵکەند

حەزت لە ئەسپی رمبازێن و تەراتێن کرد
کەچی قامچی و ئاوزەنگی و هەوسارت لە گەڵ بە کار هێنا
ناچارت کرد ماوەی حەوت سەعاتی دوبارە غار بکا
نەتهێشت ئاو بخواتەوە تا لێڵی نەکرد
سلیلی دایکیت ناچار کرد سەروەر بگری و بلاڵێتەوە

حەزت لە شوانی مێگەلەکە کرد، کە بەردەوام دەستەوارە نانی بۆ ئەهێنای
هەمو رۆژێ گیسکێکی بۆ ئەکوشتیتەوە و بۆی لێ ئەنای
کەچی تێت سرەواند و کردت بە گورگ
ئێستا ئاسیاوە کۆنەکانی، شوانەکانی مێگەلەکان، راوی ئەنێن
سەگەکانیان تێ بەرداوە لاقی ئەگەزن

حەزت لە، ئیشولانو، باخەوانەکەی باوکت کرد
بێ پسان بەرچنەی خورمای بۆ ئەهێنای
هەمو رۆژێ خوانەکەی بە خواردنی خۆش ئەرزانیتەوە
کەچی چاوت خستە سەری و پێت وت:
وەرە گیانەکەم ئیشولانو، با خۆشی لە پیاوەتیت ببینم
دەستت بێنە و بیدە لە شوێنە جوانەکانی لەشم
ئیشولانو پێی وتی:
چیت لە من ئەوێ؟
بۆچی دایکم نانی نەکردوە من لێی نەخۆم
تا نانی ئەنگی و سوکی بخۆم؟
زنجی ئەیجە زمهەریر ئەگێڕێتەوە؟
تۆ کە گوێت لەم قسانەی ئەو بو گۆپاڵێکت تێ سرەواند کردت بە بۆق
هاویشتتە ناوەڕاست...
نەئەتوانێ هەڵبەزێتەوە سەرێ و نەئەتوانێ دابەزێتەوە خوارێ
ئەگەر منیشت خۆش بوێ چارەنوسی منیش وەکو ئەوان لێ ئەکەی"

نیشتار کە ئەمەی بیست
رقی هەستا و هەڵکشا بۆ ئاسمان
ئیشتار سەرکەوت و لە بەردەم ئانوی باوکی دا دایە پرمەی گریان
لە بەردەم ئانتومی دایکی دا فرمێسکی هەڵ رشت، وتی:
"باوکە! گلگامێش قسەی پێ وتم و سوکایەتی پێ کردم
گلگامێش خەوشەکان و ئەنگیەکان و ریسواییەکانی ژماردم"



**گلگامێش شەر لەگەڵ شێرێک و گامێشێک ئەکا**

ئانو دەمی کردەوە بە ئیشتاری شکۆداری وت:
"تۆ گێچەڵت پێ کردوە ئەوەتە بەرەکەیت چنیەوە
گلگامێش ریسوایی و ئەنگی و خەوشەکانی ژماردوی"
ئیشتار دەمی کردەوە و بە باوکی، ئانوی، وت:
"باوکە! گایەکی ئاسمانیم بۆ بخوڵقێنە بە سەر گلگامێش دا زاڵ بێ و بیکوژێ
ئەگەر گای ئاسمانیم نەدەیتێ
دەرگای جیهانی ژێرو ئەشکێنم
ئەیخەمە سەر گازی پشت
مردوەکان هەڵئەستێنمەوە وەکو زیندوەکان بخۆن
ئەوسا ژمارەی مردوان لە زیندوان زۆرتر ئەبێ"
ئانو دەمی کردەوە وەڵامی ئیشتاری شکۆداری دایەوە وتی:
"ئەگەر ئەوە بکەم کە تۆ لە منی ئەخوازی گای ئاسمانیت بدەمێ

حەوت ساڵ لە ئەرزی ئوروک دا وشکەساڵی ئەبێ
ئایا دانەوێڵەت بەشی ئەو سیاساڵانە کۆکردۆتەوە؟
ئایا کۆگای ئالیکت بۆ چوارپێکان کەڵەکە کردوە؟"
ئیشتار دەمی کردەوە وەڵامی ئانوی باوکی دایەوە وتی:
"خەرمانی دانەوێڵەم بۆ خەڵک کۆکردۆتەوە
ئالیکم بۆ چوارپێکان عەمار کردوە
ئەگەر حەوت ساڵیش لە سەر یەک وشکەساڵی بێ
ئەوەندەم کۆگای دانەوێڵە و ئالیک کەڵەکە کردوە
بەشی خەڵک و چوارپێ بکا"
کە قسەکانی بیست، مێخزنجیری پێی گای ئاسمانیی دایە دەستی، رێنوێنی کرد بچێ بۆ سەر زەوی
لە سەر ئەرزی ئوروک دایبەزاند
.......
گای ئاسمانی دابەزی ترس و تۆقاندنی بڵاو کردەوە
لە یەکەم گابۆڕدا سەد پیاو و ئینجا دوسەد و سێسەدی کوشت
لە دوەم گابۆڕدا سەد و دوسەد و سێسەدی کوشت
لە گابۆڕی سێیەم دا پەلاماری ئەنکیدوی دا
بەڵام ئەنکیدو بەرهەڵستیی کرد
ئەنکیدو هەڵبەزیەوە شاخی گا ئاسمانیەکەی گرت
گای ئاسمانی کەرە و کەفاوی گرتە دەموچاوی
بە کلکی شیاکەی تێ گرت
ئەنکیدو دەمی کردەوە، بە گلگامێشی وت:
"هاورێ! خۆمان زۆر هەڵکێشا
چۆن بەرپەرچی ئەمە بدەینەوە؟
.....
ئەبێ لە بەینی خۆمان دا کارەکە دابەش بکەین
من گاکە لە کلکەوە ئەگرم
تۆش زەبری شمشێرەکە لە نێوان شانی و قۆچەکانی بسرەوێنە"
ئەنکیدو کەوتە هەوڵی گرتنی گای ئاسمانی
بە هەردو دەست توند کلکی گرت
گلگامێشیش وەکو قەسابێکی کارامە
جەزرەبەیەکی کوشندەی سرەواندە گای ئاسمانی
شمشێرەکەی لە بەینی شان و شاخەکانی دا چەقاند
ئینجا هەڵیان کوتایە سەر کەلاکەکەی دڵیان دەرهێنا
لە خوا شاماش نزیکیان خستەوە، کڕنوشیان بۆ برد
دو برا دانیشتن و حەسانەوە

بەڵام ئیشتار سەرکەوتبوە سەر شورە بەرزەکانی ئوروک
بازی دایە هەیوانەکەی و بە دەنگی بەرز نەفرینی لێ کردن:
"واوەیلا بە حاڵی گلگامێش کە گلاوی کردم و سوکایەتی پێ کردم چونکە گای ئاسمانیی کوشت"

ئەنکیدو کە ئەو قسەیەی لە ئیشتار بیست
رانێکی گای ئاسمانیی بڕی و گرتیە دەموچاوی و وتی:
"ئەگەر بمگرتیتایە وام لێ ئەکردی وەکو لەمەم کردوە
چوارپەلیشتم بە ریخۆڵەکانی ئەبەستەوە"
ئیشتار، کەنیزە سۆزانیەکانی پەرستگاکەی کۆکردەوە
شیوەن و چەمەری لە سەر رانی راستی گای ئاسمانی گێڕا

گلگامێش پیشەکارەکان، وەستاکانی چەکسازی، بانگ کرد
وەستاکان لە گەورەیی و ئەستوری شاخەکانی سەریان سوڕما
قورسایی هەر شاخێکی لە بەردی لاجیوەرد سی مەن و
ئەستوریی توێژاڵی هەریەکەیان دوپەنجە و
فراوانیی هەردوکیان جێگەی شەش کر چەوری بو
هێزەیەکیان هێنا، بەو ئەندازەیە رۆنیان تێ کرد، بردیان بۆ هەنونی خوای پشتیوان لوگالباندا لە ژورە رازاوەکەی نوستنی دا هەڵیان واسی
ئینجا دەستیان لە روباری فورات شۆرد
دەستیان کردە ملی یەکتری، کەوتنە گەڕان
بە سواریی بە کۆڵانەکانی ئوروک دا سوڕانەوە
خەڵکی ئوروک بۆ سەیرکردنیان کۆبونەوە
گلگامێش لە گەڵ ژنە گۆرانیبێژەکانی ئوروک ئەدوا و ئەیوتەوە:
"لە ناو پاڵەوانەکان دا کێ سەروەرە؟
کێ قۆزترین پیاوە؟"
ئەوانیش بۆیان ئەسەندەوە:
"گلگامێش سەروەری پاڵەوانانە
گلگامێش قۆزترینی پیاوانە"
.......
ئیشتار، ئەوەی ئێمە بە توڕەییەوە رانی گای ئاسمانیمان تێ گرت
لە کۆڵانەکان دا کەسی ئەدی دڵی بداتەوە و دڵی خۆش بکا

......
گلگامێش ئاهەنگی خۆشیی لە کۆشکەکەی دا گێڕا
هەردو پاڵەوان نوستن، لە تەختەکانیان دا حەسانەوە
ئەنکیدو نوست خەونێکی دی

ئەنکیدو راچەنی و خەونەکەی بۆ هاورێکەی گێرایەوە، وتی:
"هاورێ! بۆچی خوا گەورەکان بۆ راوێژ کۆبونەوە؟"

## خشتی حەوتەم

......

هەتاو کەوت ئەنکیدو خەونەکەی بۆ گلگامێش گێرایەوە، وتی:
"هاورێ! شەوی رابردو خەونێکی سەیرم بینی
بینیم ئانو و ئینلیل و ئەیا و شاماشی ئاسمانی کۆبونەوە
راوێژیان ئەکرد، ئانو بە ئینلیلی وت:
لە بەر ئەوەی گای ئاسمانییان کوشتوە و خومبابایان سەربڕیوە
ئەبێ ئەوەی دارکاژەکانی لە شاخەکان بڕییەوە بمرێ!"
بەڵام ئینلیل وەڵامی دایەوە وتی: "ئەنکیدو ئەمرێ، گلگامێش نابێ بمرێ"
ئینجا شاماشی ئاسمانی وەڵامی ئینلیلی پاڵەوانی دایەوە وتی:
"ئەی گای ئاسمانی و خومبابایان بە فەرمانی من نەکوشت!
بۆچی ئەنکیدو ئەبێ بمرێ لە کاتێک دا بێتاوانە؟"
ئینلیل ئاورِی لە شاماشی ئاسمانی دایەوە و بە توڕەییەوە وەڵامی دایەوە:
"هەر لە بەر ئەوەی هەمو رۆژێ تۆ لێیان هەڵدێیت تا وات لێهاتوە بوی بە یەکێ لەوان"

ئەنکیدو بە نەخۆشی لە بەردەم گلگامێش دا راکشا
فرمێسک لە چاوەکانی دائەبارین
گلگامێش پێی وت:
"برام لەسەرچی من جیا لە تۆ بێتاوان ئەکەن؟
دریژەی دایە وتی: "ئاخۆ گەرەکە من چاودێری گیانی مردوەکان بکەم
لە بەردەرگای تاپۆکانیان دا دانیشم؟
لە سەرم پێویست ئەکرێ هاورێ خۆشەویستەکەم
بە چاوی خۆم نەبینم؟"

.......

ئەنکیدو چاوی هەڵبڕی روی قسەی کردە دەروازەکە، وەکو لە گەڵ مرۆڤ بدوێ.
ئەگەرچی دەروازەکە، لە تەختەی دارستان تاشراوە، نە هیچ تێ ئەگا و نە هیچ ئەزانێ:
"تەختەکەتم لە ماوەی بیست سەعاتی دوبارەدا هەڵبژارد
بەر لەوەی درەختی کاژی رەوان ببینم
نمونەی تەختەکەتم، ئەی دەرگا، لە وڵات دا نەدی بو
بەرزیت حەفتاودو باڵ و پانیت بیستوچوار باڵە
دارتاشێکی دەسرەنگین لە نفر دروستی کردی و هێناتی بۆ ئێرە
ئەی دەرگا ئەگەر بمزانیایە وام لێ بە سەر دێ
قەشەنگیەکەت مەینەتیم بە سەر ئەهێنێ

تەورم هەڵئەگرت و ئەم شکاندی
ئەمکردی بە کەڵەکی سەرئاو
بەڵام چار چیە. ئەی دەرگا، دروستم کردی و هێنامی
رەنگە شایەکی تر لەوانەی دوای من دێن
بە کارت بهێنێ و، ناوی منی لە سەر بسرێتەوە، ناوی خۆی لە سەر دابنێ"

گلگامێش ئاخاوتنی هاورێکەی بیست کەوتە رشتنی ئەسرین
گلگامێش دەمی کردەوە بە ئەنکیدوی وت:
"ئینلیل بە دڵێکی فراوانەوە خۆشی ویستی
دانایی پێ بەخشیت، کەچی تۆ قسەی هەڵەت پەڵەت ئەکەی
هاورێم لە بەرچی ئەم قسە سەیرانەت کرد؟
خەونەکەت سەیر بو بەڵام ترسناک بو
خەونی سەیر زۆرن
ماخوا پەژارە بە سەر زیندوان دا ئەبەشێتەوە
خەونیش پەژارە بە سەر زیندوەکانی تردا زاڵ ئەکا
من ئەنوم و لە خوا ئەپارێمەوە"
...........
نێچیروان و کەنیزی دایە بەر نەفرین، وتی:
"دارایی راوکەرەکە تاڵان بکە و خۆی بچروسێنە
خۆزگە کردەوەکانیت قبوڵ نەکردایە
خۆزگە هەر نێچیرێکی ئەو بیویستایە راوی بکا لە دەستی دەرباز بوایە
هیچ کام لە ئاواتەکانیت نەهێنایەتە دی"
ئینجا دڵی پاڵی پێوە نا نەفرین لە کەنیز بکا وتی:
"هەی سۆزانی! وەرە چارەنوست لە بەر چاو بگرم
چارەنوسێکە تا هەتایە تەواو نابێ
نەفرینێکت ئەکەم گەورە
ئێستا بەری ئەکەوی
خانویەکت پێ نەکرێ شایانی جوانیەکەت بێ
......
خۆراکت پاشەڕۆی شارەکە بێ
سوچی کۆڵانە تاریکەکانی جێگەت بێ
لە بەر سێبەری دیوار دا هەڵتروشکێی
سەرخۆش و ساغ هەردو بەر شەپازللەت بدەن
خۆزگە حەزلێکردوەکانت دوای ئەوەی لە ئەفسونی جوانیت
تێر ئەبون ئافەروزیان بکردیتایە"

کە خوا شاماش قسەکانی بیست لە ئاسمانەوە گازی کرد، پێی وت:
"ئەنکیدو تۆ بۆچی توک لە کەنیز ئەکەی؟
ئەی ئەو ئەبو فێری کردی چۆن خوایانە نان بخۆی
بادەیەکی پێ نۆشیت شایستەی شاهان بێ
جلوبەرگی نایابی لە بەر کردی
گلگامێشی قۆزی کردە هاورێ و هاودەمت
ئەی گلگامێش نەیکردی بە هاورێ و هاودەمی خۆی
لە پێخەفی خۆش دا نەینواندی
لە سەر کورسی حەسانەوەی لای راستی خۆی دای نەنای؟
وای کرد گەورەپیاوەکانی سەرئەرز قاچت ماچ بکەن
خەڵکی ئوروک وا لێ ئەکا بۆت بگرین و بۆت بلاوێننەوە
خەڵکی دڵشاد وا لێ ئەکا لێت نزیک بینەوە و نوێژت بۆ بکەن
ئەویش لە دوای تۆ قژی بەر ئەداتەوە
کەوڵی شێر ئەپۆشێ و وێڵی بیابان ئەبێ"

کاتێ ئەنکیدو گوێی لە شاماشی پاڵەوان بو تورەبونەکەی نیشتەوە
...........
"هەی کەنیز! وەرە تا چارەنوست دیار بکەم
دەمم کە توکی لێ کردی ئێستا دزات بۆ ئەکا
شاە و سەردار و گەورەکان حەزت لێ بکەن
کەس لە شەرمی تۆ شانی هەڵنەتەکێنێ
پیر لە پێناوی تۆدا ریشی بلەقێنێ
گەنجەکان پشتێنەکانیان بۆ تۆ بکەنەوە
لاجیوەرد و ئاڵتون و عەقیقت پێشکەش بکەن
خۆزگە هەمو ئەوانەی سوکایەتیت پێ ئەکەن، بەر سزا بکەوتنایە
ماڵەکانیان چۆڵ بوایە
کاهین رێگەی بە تۆ بدایە بچیتە لای خوا
لە بەر تۆ مێرد ژنەکەی بە جێ بهێشتایە، ئەگەر دایکی حەوت منداڵیشی بوایە"

نەخۆشیەکەی ئەنکیدو سەختتر بو لە سەر جێگەی نەخۆشی مایەوە
ئەو شەوە خەمەکانی ئەنارد بۆ دۆستەکەی و ئەنوزایەوە، وتی:
"هاورێ! شەوی رابردو خەونێکم دی
ئاسمان ئەیگرماند و ئەرز بۆی ئەسەندەوە
لە کاتێک دا لە نێوان هەردوکیان دا راوەستا بوم
کتوپڕ کابرایەک، بە پەشۆکاوی، لە بەردەمم دا دەرکەوت
روی لە روی زو، مەلی بروسکە، ئەچو

نینۆکەکانی وەکو نینۆکی چنگی باز بون
جلەکانی لە بەر داکەندم
چنگی پێدا کردم
دەستی دایە بینم تا هەناسەی لێ بریم
.......
بیچمم گۆڕا هەردو باسکم وەکو باڵی مەلی لێ هات
پەڕی دەرکرد
سەیری کردم، گرتمی و بردمی بۆ تاریکستان
بۆ خانەی ئیرکاللا
بۆ ئەو جێیەی هەرکەسی تێ چو نایەتەوە
بۆ ئەو رێیەی هەرچی گرتی ناگەڕێتەوە
بۆ ئەو ماڵەی دانیشتوەکانی لە روناکی بێ بەشن
خواردنیان گڵە و قوتیان قوڕە
ئەوانیش وەکو مەل پەڕ و باڵیان لێ رواوە
لە تاریکیەک دا ئەژین روناکیی تێدا نیە
لە ناو ئەو خانوە گڵەی تێی چوم
شا و فەرمانڕەوایانم بینی
تاجەکانیان لە سەریان کرا بوەوە و لە سەر ئەرز کەڵەکە کرا بو
بەڵێ!
ئەو گەورانەم بینی رۆژانێ بو تاجیان لە سەردا بو
لە رۆژگاری رابردودا حوکمی وڵاتیان ئەکرد
تەنیا جێگرەکانی ئانو و ئینلیل
گۆشتی برژاویان بۆ دا ئەنان
نانیان پێشکەش ئەکردن و ئاوی ساردیان ئەدانێ
لە ناو ئەو خانوە گڵیەدا کە تێی چوم
کاهینی گەورە و
نزاگۆ و سروبێژ و زێوانی پەرستگاکانی لێ بو
ئیتانا و سموگانی تێدا نیشتەجێ بون
ئیرش کیگا شای ئەرزی جیهانی خوارو، فەرمانڕەوای بو
کەڵە سەیری، نوسەری ئەرزی خوارو، لە بەردەمی دا لە سەر چۆک
خشتێکی بە دەستەوە بو بۆی ئەخوێندەوە
کە سەری هەڵبڕی منی بینی، وتی:
کێ ئەم کابرایەی هێناوە بۆ ئێرە؟
لە منی دور خەرەوە
.....
هاوڕێکەم خەونێکی دیوە دوقلانەی شەڕە

کە ئەو رۆژە تێ پەڕی ئەنکیدو خەونەکەی تێدا دی بو
ئەخۆشیەکەی سەختتر بو. لە سەر جێگە مایەوە. رۆژێک و دوان و سێیان
چوار و پێنج و شەش و حەوت و هەشت و دە
ئەخۆشیەکە تەنگی بە ئەنکیدو هەڵچنی. رۆژانی یانزەهەم و دوانزەهەمیش رابورد ئەو هەر لە سەر جێگە کەوت
بو. گلگامێشی بانگ کردە لای خۆی، پێی وت:
"هاوڕێ من بەر ئەفرین کەوتوم
بە مردنی پیاوێ نامرم کە لە مەیدانی شەڕدا گلا بێ
لە شەڕ ئەترسام (بەڵام بە کەساسی ئەمرم)
ئەوەی لە شەڕدا بگلێ هاوڕێ ئەوە پیرۆزە

## خشتی هەشتەم

### ستونی یەکەم

کاتێ بەیانی گزنگی دا گلگامێش بە هاورێکەی وت:
"ئەنکیدو! تۆ دایکت ئاسکە و باوکت کەرەکێویە
بە شیری کەرەکێوی پەروەردە بوی
با ئەو رێچکانە بۆت بگرین کە لە ناو جەنگەڵی دارکاژدا پیا رۆیشتی
کاشکی شەو و رۆژ بە سەرتا بگریانایە
با پیرەمێردەکانی ئوروکی شورەدار، بۆت بلاوێننەوە
با ئەو پەنجانە بۆت بگرین کە لەدوامانەوە ئاماژەیان بۆ ئەکردین و پیرۆزباییان لێ ئەکردین
با پرمەی گریان لە گوندەکان دا دەنگ بداتەوە
با ورچ و کەمتیار و پڵنگ و بەور و کەڵ و شێر و مەڕ و ئاسک، هەمو گیاندارانی کێوی بۆت بگرین
با روباری ئولای کە بە کەنارەکەی دا رۆیشتین بۆت بگری
با فوراتی خاوێن کە ئاومان لێ خواردەوە بۆت بگری
با جەنگاوەرانی ئوروکی شورەدار بۆت بگرین
گاکەی سەرمان بڕی... بابۆت بگری
با ئەوە بۆت بگری کە لە ئەریدۆ ناوەکەی گەورە کردی
ئەوی بە بۆنی خۆش پشتی چەور کردی و بادەی پێ نۆشیت
با ئەوەی نانی پێ دایت بۆت بگری
با براکان و خوشکان بۆت بگرین

### ستونی دوەم

ئەی پیرەکان گوێم لێ بگرن!
لە بەر ئەنکیدو، هاوڕێ و هاودەمم، ئەگریم

وەکو جەرگسوتاو ئەلاوێنمەوە
تەوری تەنیشتم و هێزی بازوم
خەنجەری بەر پشتێنەکەم و قەڵغانی پاراستنم
خۆشی و شادی و پۆشاکی جەژن
شەیتانێکی نەفرەتلێکراو پەیدا بو لێی دزیم
ئەی هاوڕی و برای بچوکم!
ئەوەی کە کەرەکێوی لە زورگەکان و پڵنگی لە بیابان دا راو ئەکرد
ئەنکیدو، ئەی هاوڕێ و برای بچوکم!
راوکەری کەرەکێوی هەردەکان و پڵنگی بیانان
پێکەوە بە سەر کۆسپەکان دا سەرکەوتین و بە لوتکەی چیاکان دا هەڵگەڕاین
گای ئاسمانیمان گرت و سەرمان بڕی
خومبابای نیشتەجێی جەنگەڵی دارکاژمان شکاند
ئەم خەوە قورسە چیە گرتوتی
لە تاریکایی شەودا نوقم بوی گوێبیستی من نابی؟"



**گلگامێش بە سەر شێردا سەرئەکەوێ**

بەڵام ئەنکیدو چاوی هەڵنەبڕی
دەستی لە دڵی دا لە ترپە کەوت بو
ئەوسا هاورێکەی وەکو بوک داپۆشی
شێرئاسا ئەڕاندی

وەکو پڵنگێ کە بەچکەکانی لێ فڕێنرابێ
لە بەر پێخەفەکەدا ئەهات و ئەچو و لێی ئەڕوانی
قژی ئەڕنیەوە و، هەڵی ئەدایە سەرئەرز
جلە جوانەکانی دڕی، وەکو شتێکی گڵاو بڕکی دا

لە گەڵ شەبەقی دا گلگامێش ڕاپەڕی
.......
وەستاکانی شاری بانگ کرد ئەڕاندی بە سەریان دا:
"ئەی مسگەر، زەڕەنگەر، جەوهەری
مۆر هەڵکەنی بەردی گرانبەها، پەیکەرێکم بۆ هاوڕێکەم بۆ بکەن"
پەیکەرێکی بۆ هاوڕێکەی کرد سنگی لە لاجیوەرد و لەشی لە زێڕ
تەختێکی لە تەختەی پتەو دانا
پەرداخێکی لاجیوەردی پڕ کرد لە کەرە
لە شاماشی نزیک کردەوە
کەوتە لاواندنەوەی هاوڕێکەی

## ستونی سێیەم

.......
"لە سەر تەختی سەروەریم دانای
لە سەر کورسی حەسانەوەم لای چەپم دانیشاندی
بۆ ئەوەی گەورەکانی سەرئەرز قاچت ماچ بکەن
خەڵکی ئوروک ئەهێنمە گریان بۆت بلاوێننەوە
خەڵکی دڵشاد وا لێ ئەکەم بۆت دڵتەنگ بن
منیش خۆم (دوای ئەوەی تۆ لە خاک دا ئەنێژرێی)
قژم بەر ئەدەمەوە، کەوڵی شێر ئەپۆشم،
وێڵ و سەرگەردان بە بیابان دا ئەسوڕێمەوە"

## خشتی نۆیەم

## ستونی یەکەم

بۆ ئەنکیدو، هاوڕێ و هاودەمی
گلگامێش بە کوڵ گریا و وێڵی بیابان بو، لە بەر خۆیەوە ئەی لاوانەوە:
"ئەگەر منیش مردم، ئایە چارەنوسی منیش وەکو ئەنکیدو نابێ؟
خەم و پەژارە چۆتە ناخی گیانمەوە

لە مردن تۆقیوم. ئەوەتا وێڵی دەشت و دەرم
ئەچوم بۆ لای ئوتناپیشتیم کوڕی ئوبار توتو
بە هەنگاوی خێرا
لە دەمەوئێوارەدا کە گەیشتمە بناری چیاکان
شێرم بینی ترسم لێ نیشت
سەرم هەڵبڕی بۆ سین و نوێژم بۆ کرد
لە گەورەی خواکان پاڕامەوە پشتیوانم بێ و دڵنیام کا"
دەمەوئێوارە هەڵئاژیا خەونێکی ناخۆش هەڵی سان
شێرەکانی لە دەوری خۆی دی لە بەر تریفەی (سین) مانگ دا تەپاوتلیان ئەکرد
دەستی دایە تەورەکەی و شمشێرەکەی لە کێلان هەڵکێشا
تیرئاسا هەڵی کوتایە سەریان
تێی سرەواندن و راوی نان
ئینجا گلگامێش گەیشتە کێوێکی گەورە
......
کێوەکە ناوی ماشو بو
پیا هەڵ زنا تا گەیشتە لوتکە
ئەو کێوەیە کە هەمو رۆژێ پاسەوانیی هەڵهاتن و ئاوابونی هەتاو ئەکا
لە سەرەوە ئەگاتە گومەزی ئاسمان و
لە ژێرەوە سنگی ئەدا لە جیهانی خوارو
پاسەوانەکانی دەرگاکەشی دوپشکەپیاون
کە ترس و دڵەراوکێ ئەنێرن و نیگاکانیان مردن
دەسەڵاتە ترسناکەکەیان بە سەر کێوەکان دا زاڵە
کە پاسەوانیی هەتاو ئەکەن لە هەڵهاتن و ئاوابونی دا
کە گلگامێش بینینی لە ترسا رەنگی روی زەرد هەڵگەڕا
بەڵام خۆی راگرت و لێیان نزیک بوەوە
یەکێ لە دوپشکەپیاوەکان ژنەکەی بانگ کرد، پێی وت:
"ئەوەی هاتۆتە لامان جەستەی لە کەرەستەی خوایە؟"
ژنی دوپشکەپیاوەکە وەڵامی مێردەکەی دایەوە وتی:
"بەڵێ دوبەشی خوایی و بەشێکی مرۆییە"

ئینجا دوپشکەپیاوەکە گلگامێشی بانگ کرد و روی دەمی بەم وتانە کردە وەچەی خوا:
"چی وای لێ کردی ئەم سەفەرە درێژە بکەی
بۆچی ئەم رێگا درێژەت بریوە و. دەریا دژوارەکانت تێ پەڕاندوە
مەبەستی خۆتم لەم هاتنەت پێ بڵێ!"

گلگامێش وەڵامی دایەوە:
"هاتوم بۆ لای باوکم، ئوتناپیشتیم، بە دوای ژیان دا ئەگەڕێم
باوکم کە چۆتە کۆمەڵگای خواکانەوە
هاتوم نهێنی ژیان و مردنی لێ بپرسم"

دوپشکەپیاو دەمی کردەوە بە گلگامێشی وت:
"کەس نیە ئەو کارەی پێ بکرێ، گلگامێش
کەس نەیتوانیوە کوێرەڕێی شاخەکانی ببڕێ
ناوەکەی دوانزە سەعاتی دوبارە درێژ ئەبێتەوە
تاریک و دوتەکە روناکیی تێ دا نیە
هەتا هەڵهاتنی خۆر
تا ئاوابونی خۆر
.......
(گلگامێش وەڵامی دایەوە:
"هەرئەچم، بڕیارم داوە
گوێ نادەم بە خەم و پەژارە، بە سەرما و گەرما، بە ئاهین و گریان،
ئێستاش دەرگای کێوەکەم بۆ بکەرەوە!"
دوپشکەپیاو دەمی کردەوە وەڵامی گلگامێشی دایەوە:
"گلگامێش! بچۆ ژورەوە، مەترسە،
رێگەم پێ دای چیای ماشو ببڕی
بەشکو چیاکە و زنجیرەکانی ببڕی
بەشکو قاچەکانت بە سەلامەتی بتهێننەوە
ئەوەتا دەرگای کێو لە روت دا کراوەتەوە"
گلگامێش کە ئەمەی بیست شوێن وتەکانی دوپشکەپیاو کەوت
رێگەی رێرەوی هەتاوی گرت
سەعاتێکی دوبارەی بڕی تاریکودوتەک، رۆشنایی نەبو
نەیتوانی ئەوانە ببینێ کە لە پێشەوەی و پاشەوەی دا بون
دو سەعاتی دوبارە رۆیشت، ئینجا چوار سەعات
هێشتا تاریکیەکی ئەموستەچاو بو رۆشنایی نەبو
پێشەوەی و پاشەوەی نەئەدی
......
پێنج سەعاتی دوبارە رۆیشت، شەش سەعات
حەوت سەعات و هەشت سەعاتی دوبارە
هێشتا هەر تاریکیە و رۆشنایی نیە تابتوانێ پێشەوە و پاشەوەی خۆی ببینێ
دوای ئەوەی نۆ سەعاتی دوبارەی بڕی هەستی کرد بای شەماڵ لە روی ئەدا
بەڵام هێشتا تاریکودوتەکە

نەیتوانی پێشەوەی خۆی و پاشەوەی خۆی ببینێ
ئینجا سەعاتی دوبارە ڕۆیشت، پاش یانزە سەعات، بەیانی گزنگی دا
پاش ئەوەی دوانزە سەعاتی دوبارەی بڕی ڕۆشنایی بڵاو بوەوە
لە پێشەوەی دا درەختانێکی بەدی کرد موروی گرانبەهایان پێوە بو
کە دی لێیان نزیک بوەوە
درەختی عەنابی دی بەرەکەی ئاقیق بو پیا شۆڕ بوبوەوە، سەیرکەریان ئەحەپەسان
ئەو درەختانەی دی لاجیوەردیان گرت بو دیتنیان تەماشاکەریان ئەحەپەسان
دڕکەزی بینی موروی بەنرخی مرواری دەریایان گرت بو

## خشتی دەهەم

سیدوری ژنە مەیخانەوانی نیشتەجێی لێواری دەریا
گلگامێشی دی ئەهات و کەوڵی لە بەردا بو
چرچوچاوی مرومۆچ وەکو ئەوەی سەفەرێکی درێژی کرد بێ، ماندویەتی و شەکەتی پێوە دیار بو
بەڵام جەستەی لە کەرەستەی خوایی بو
ژنە مەیخانەوانەکە سەیری گلگامێشی کرد لە بەر خۆیەوە وتی:
"ئەم کابرایەی لە پیاوکوژ ئەچێ ئەیەوێ بۆ کوێ بچێ"
کە دی نزیک ئەبێتەوە دەرگاکەی داخست و بە کڵۆم قایمی کرد

گلگامێش گوێی لە جیرەی دەرگاکە بو بانگی لە مەیخانەوان کرد وتی:
"هێی مەیخانەوان! چی منت بە دڵ نەبو، وا دەرگاکەت بە ڕوم دا داخست و بە کڵۆم قایمت کرد؟
دەرگاکەت ئەشکێنم و دێمە ژورەوە"
گلگامێش درێژەی دایە بە مەیخانەوانی وت:
"من گلگامێشم، منم ئەوەی ئەو گایەی لە ئاسمانەوە دابەزی گرت و کوشت
بە سەر پاسەوانی جەنگەڵ دا زاڵ بوم و خومبابام شکاند"
مەیخانەوان بەرسڤی گلگامێشی دایەوە وتی:
"ئەگەر بە ڕاستی تۆ گلگامێشی کە پاسەوانی جەنگەڵی کوشت و بە سەر خومبابای نیشتەجێی جەنگەڵی دارکاژدا زاڵ بوی
شێرەکانی بناری شاخەکانی کوشتوە و گای ئاسمانی گرتوە و کوشتوە
بۆچی گۆناکانت سیس بون و خەم دایگرتوی؟
لە سەرچی دڵت گیراوە و شێوەت گۆڕاوە
بۆچی چرچاوت مرومۆچە وەکو یەکێ سەفەرێکی درێژی کرد بێ
چۆن سەرما و گەرما لە ڕوخساری داوی
بۆچی وێڵی بیابان بوی؟"

گلگامێش وەڵامی مەیخانەوانی دایەوە، پێی وت:
"چۆن گۆناکانم سیس نابێ و روم گرژ نابێ
ئاخ و خەم دڵم داناگرن و شێوەم ناگۆڕێ
چرۆچاوم مرومۆچ نابێ وەکو یەکێ سەفەر شەکەتی کرد بێ



شێوازی گلگامێش بۆ شەرکردن لەگەڵ شێردا

سەرما و گەرما روخسارم هەڵناقرچێنن و وێڵی بیابان نابم
چارەنوسی مرۆڤ: هاوڕێکەم و برا بچوکەکەم، کە کەری کێوی و پڵنگی بیابانی راو ئەکرد و بە سەر هەمو دژواریەکان دا زاڵ بو
بە سەر خومباباى نیشتەجێی جەنگەڵی کاژدا سەرکەوت
ئەنکیدوی هاوڕێ و هاودەمم کە زۆرم خۆش ئەویست
ئەویش وەکو هەمو مرۆڤەکانی تر کۆتایی هات
بە شەو و بە رۆژ بۆی گریام
شەش رۆژ و حەوت شەو شینم بۆ کرد
وامزانی لە سۆنگەی گریان و شیوەنی بە کوڵی منەوە هەڵئەستێتەوە
نەمهێشت بە گۆڕی بسپێرن
شەش رۆژ و حەوت شەو گلم دایەوە، کرمەڕێز بو
مردن تۆقاندومی وێڵی بیابانی کردوم
ئەو کارەساتەی بە سەر هاوڕێکەم هات ژیانی لێ تاڵ کردوم
ئاخ! ئەو هاوڕێیەی خۆشم ئەویست بو بە خاک

منیش وەکو ئەو ڕائەکشێم و هەرگیزاوهەرگیز هەڵناستمەوە
ئەی مەیخانەوان، من کە سەیری ڕوت ئەکەم،
ئاخۆ لە توانام دا ئەبێ مردن کە لێی ئەترسم و ئەتۆقێم، نەبینم؟"

مەیخانەوان بەرسڤی گلگامێشی دایەوە:
"گلگامێش بۆ کوێ هەوڵ ئەدەی
ئەو ژیانەی تۆ دوای کەوتوی نایدۆزیتەوە
کاتێ خوا گەورەکان مرۆڤیان ئافراند
مردنیان کردە چارەنوسی
ژیانیان بۆ خۆیان دانا
تۆش ئەی گلگامێش با هەمیشە سکت تێر بێ
بە شەو شاد و کامەران بە
همو ڕۆژێ ئاهەنگ بگێڕە
شەو و ڕۆژ هەڵپەڕە، گەمە بکە
جلەکانت پاک و ڕازاوە بێ
سەرت بشۆ و لە ئاوا مەلە بکە
نازی ئەو زارۆکە بکێشە کە دەستت ئەگرێ
دڵی ئەو ژنە خۆش بکە کە دێتە باوەشتەوە
بەشی مرۆڤ ئەمەیە!"

گلگامێش وتەکانی بۆ مەیخانەوان دوبارە کردەوە و وتی:
"ئەی مەیخانەوان! ئەو ڕێگایە کوێیە ئەچێ بۆ لای ئوتناپشتیم؟
ڕێنوێنیم بکە چۆن بچم بۆ لای
ئەگەر بتوانم بگەمە لای ئامادەم تەنانەت لە دەریاکانیش بدەم
ئەگەر گەیشتن بەو دژوار بێ بە وێڵی لە بیابانەکان دا ئەسوڕێمەوە"

مەیخانەوان وەڵامی گلگامێشی دایەوە پێی وت:
"ئەی گلگامێش پێش تۆ کەس لە دەریای نەداوە
بەڵێ! شاماشی توانا بە ڕاست لە دەریا ئەپەڕێتەوە
بەڵام جگە لە شاماش کێی تر ئەتوانێ لێی بپەڕێتەوە؟
پەڕینەوە لێی سەخت و دژوارە
ئاخۆ چیت پێ ئەکرێ کە ئەگەیتە ئاوی قوڵی مردن؟
بەڵام ئەی گلگامێش ئورشانابی هەیە کەشتیەوانی ئوتناپیشتیمە
سەنگی ئەخشێنراوی لە لایە و ئێستا لە لێڕەوارەکەدا خەریکی ڕنینی گژوگیایە
خۆزگە چاوەکانت ئەیبینی
ئەگەر توانیت هاوڕێ لە گەڵ ئەو بپەڕێرەوە

ئەگینا بگەڕێرەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتوی"
گلگامێش کە ئەمەی بیست تەورەکەی هەڵگرت و خەنجەرەکەی لە بەرپشتێنەکەی دەرهێنا و روی کردە لێرەوارەکە و بەرەو ئەو چو
وەکو تیر پەلاماری دا و بەوپەڕی توڕەییەوە بەردە ئەخشاوەکانی شکاند
ئورشانابی چاوی هەڵبڕی گلگامێشی دی ئەڕاندی بە سەریدا:
"پێم بڵێ تۆ ناوت چیە؟ من ناوم ئورشانابیە، سەر بە ئوتناپیشتیم"

گلگامێش وەڵامی دایەوە، پێی وت:
"ناوم گلگامێشە، منم لە ئوروکەوە هاتوم. لە نای ناناوە دەریاکانی بڕیوە و سەفەری درێژی لە شوێنی هەڵهاتنی خۆرەوە کردوە
هاتوم بتبینم، ئەی ئورشانابی، کە روخسارتم بینی رێنوێنیم بکە بۆ لای ئوتناپیشتیمی دورەدەست"

ئورشانابی وەڵامی گلگامێشی دایەوە، پێی وت:
"بەڵام بۆچی گۆناکانت سیس بون و روت هەڵقرچاوە، بۆچی دڵت پڕ بوە لە خەم و شێوەت گۆڕاوە؟
چروچاوت مرومۆچە وەکو یەکێ شەکەتی سەفەرێکی درێژ بوبێ
سەرما و گەرما روخساریان هەڵقرچاندوی و
وێڵی بیابان بوی؟"

گلگامێش وەڵامی ئورشانابی دایەوە پێی وت:
"ئەی ئورشانابی، گۆناکانم چۆن چرچ نابن و روم مۆن نابێ
داخ و خەم دڵم پڕ ناکەن و شێوەم ناگۆڕێ
چروچاوم چۆن مرومۆچ نابێ وەکو یەکێ ماندویەتی سەفەر شەکەتی کرد بێ
سەرما و گەرما روخسارم هەڵناقرچێنێ
وێڵی دەشتودەر نابم
هاودەمەکەم، برا بچوکەکەم،
کە کەرەکێوی لە دەشتەکان دا و پڵنگی لە بیابانەکان دا راو ئەکرد
ئەوە ئەنکیدو هاودەم و برابچوکم بو
کە بە سەر هەمو دژواریەکان دا زاڵ بو، بە بەرزایی شاخەکان دا هەڵگەڕا
گای ئاسمانی گرت و کوشتی
خومبابای نیشتەجێی جەنگەڵی بەزاند
یار و یاوەرە خۆشەویستەکەم
کە لە هەمو سەختیەکان دا هاوڕێم بو
چارەنوسی مرۆڤی پێ بڕا
شەش رۆژ و حەوت شەو بۆی گریام تا کرم لە لوتی هاتە دەرێ
مردن تۆقاندومی وێڵی بیابان بوم
ئەو کارەساتەی بە سەر هاوڕێکەم دا هات هێزی لێ بڕیم و پەکی خستم

چۆن هێمن ببمەوە و ئارام بگرم
هاوڕێ خۆشەویستەکەم بوە بە خاک
منیش وەکو ئەوم لێ نایە ئەگەر رابکشێم تا هەتایە ئیتر هەڵنەستمەوە؟"
گلگامێش درێژەی دایە بە ئورشانابی وت:
"ئێستاش ئەی ئورشانابی چ ڕێگەیەک ئەچێ بۆ لای ئوتناپیشتیم
لە کوێوە بۆی ئەچێ؟ ڕێگاکەیم پیشان بدە
ئەگەر بتوانم بیگەمێ تەنانەت دەریاکانیشی بۆ ئەپێوم
ئەگەر نەمتوانی بە ئاوات بگەم بە وێڵی بە بیابان دا ئەسوڕێمەوە"
ئورشانابی بە گلگامێشی وت:
"ئەی گلگامێش دەستەکانی خۆت بون نەیان هێشت لە دەریاکان تێ بپەڕی
چونکە بەردە نەخشاوەکانت شکان و فەوتاند
ئەگەر بەردە نەخشاوەکەت شکان توانای پەڕینەوەمان نابێ
ئێستاش ئەی گلگامێش تەورەکەت هەڵگرە و شۆڕ بەرەوە بۆ ناو لێرەوارەکە
سەدوبیست سەوڵ ببڕە
درێژی هەر یەکێکیان شەست باڵ بێ
قیریان تێ هەڵسو و پەیکانێ بکە بە نوکەکانیانەوە"

گلگامێش کە ئەمەی بیست
تەورەکەی هەڵگرت و خەنجەرەکەی هەڵکێشا
شۆڕ بوەوە بۆ ناو لێرەوارەکە و سەدوبیست سەوڵی بڕی هەریەکەی شەست باڵ درێژ بو
قیری تێ هەڵسون و پەیکانی کرد بە نوکەکانیانەوە
.......
گلگامێش و ئورشانابی سواری کەشتی بون
دایان بەزاندە ناو شەپۆلی ئاوەکە، هەردوکیانی تێ دا بون
لە سێیەمین ڕۆژدا ئەوەندەی مانگێک و پانزە ڕۆژی سەفەری ئاساییان بڕی
ئورشانابی گەیشتە ئاوی مەرگ
ئەودەم ئورشانابی گلگامێشی بانگ کرد و پێی وت:
"گلگامێش! پەلە بکە، سەوڵێ بگرە و بیجوڵێنە
ئەکەی دەس بەری بۆ ئاوی مەرگ
گلگامێش! خێرا بکە سەوڵی دوەم و سێیەم و چوارەم داچەقێنە
گلگامێش! سەوڵی پێنجەم و شەشەم و حەوتەم داچەقێنە
گلگامێش! سەوڵی هەشتەم و نۆیەم و دەیەم داچەقێنە
سەوڵی یانزە و دوانزە"
بە سەدوبیست جار گلگامێش هەمو سەوڵەکانی داچەقاند
ئینجا گلگامێش جلەکانی داکەند
بە هەردو دەس وەکو چارۆکە هەڵی دان

نوتناپیشتیم لە دورەوە کەشتیەکەی بینی
لە گەڵ دڵی خۆی دا ئەدوا و خۆی ئەلاوانەوە و ئەیوت:
"لە بەرچی بەردە ئەخشێنراوە تایبەتیەکەی کەشتیەکەت شکان؟
جگە لە کەشتیەوانەکەی کەسی تری سوار نەبوبو؟
ئەوەی تر کە دێ ژێردەستەی من نیە

گلگامێش بەرسڤی نوتناپیشتیمی دایەوە پێی وت:
"ئەی نوتناپیشتیم چۆن رومەتەکانم هەڵناقرچێن و روم مۆن نابێ. خەم دڵم داناگرێ و شێوەم ناگۆڕێ، چروچاوم مرومۆچ نابێ وەکو یەکێ سەفەرێکی درێژ شەکەتی کردبێ و روخساری بە سەرما و گەرما هەڵقرچابێ. سەرگەردانی دەر و دەشت نابم. هاورێ و برابچوکم کە کەرەکێوی لە دەشتەکان دا راو دا و پڵنگی لە بیابان راو کرد. ئەوە ئەنکیدو بو کە بە سەر هەمو دژواریەکان دا زاڵ بو. بە سەر هەمو بەرزایی شاخەکان دا هەڵگەڕا. گای ئاسمانی گرت و کوشتی. خومبابای نیشتەجێی جەنگەڵی کاژی بەزاند
یار و یاوەرم کە زۆرم خۆشویست
لە هەمو دژواریەکان دا هاورێم بو چارەنوسی مرۆڤی پێ بڕا
شەش رۆژ و حەوت شەو بۆی گریام و بە گۆڕم نەسپارد
تا کرم لە لوتی هاتە دەرەوە
مردن ترساندمی وێڵی بیابان بوم
ئەو کارەساتەی بە سەر هاورێکەم دا هات قورساییەکەی کەوتۆتە سەر سنگم
برستی لێ بڕیوم سەرگەردانی بیابانەکانی کردوم
جا چۆن هێمن بم و ئارام بگرم. هاورێ خۆشەویستەکەم بو بە خاک
ئاخۆ منیش وەکو ئەو نابم راکشێم و تا هەتایە هەڵنەستمەوە"
گلگامێش درێژەی دایە روی قسەی کردە نوتناپیشتیم وتی:
"بۆیە ئەبینی هاتوم نوتناپیشتیم ببینم کە پێی ئەڵێن دورەدەست. هەمو وڵاتم تەی کردوە. چیای سەختم بڕیوە، دەریاکانم پێواوە
چاوم لێک نەناوە و تامی نوستنم نەکردوە
کۆچ و رەو شەکەتی کردوم و ماندویەتی و لاوازی چۆتە لەشمەوە
هەر کە گەیشتمە خانوی مەیخانەوانەکە جلەکانم داکەند و درانم.
ورچ و کەمتیار و شێر و پلنگ و بەور و ئاسک و کەڵ و شور هەمو گیاندارانی کێوی و چوارپێکانیم کوشت گۆشتەکانیانم خوارد و کەوڵەکانیانم پۆشی
.......
نوتناپیشتیم بە گلگامێشی وت:
"مەرگ دڵرەقە بەزەیی نازانێ
ئایە خانویەکمان دروست کردوە تا هەتایە بمێنێ؟
ئایە گرێبەستێکمان مۆر کردوە تا سەر بەردەوام بێ؟
ئایا براگەل کە کەلەپور دابەش ئەکەن تا سەر ئەمێنێ؟

ئایە رق و کینە سەرومڕ لە سەر ئەرز ئەمێنێ؟
ئایە کە روبار هەڵئەستێ هەمیشە لافاو ئەهێنێ؟
پەپولە لە قۆزاخەکەی دەرئەچێ. هەر کە هەتاوی بینی ئەمرێ
لە کۆنەوە مانەوە و نەمریی هەمیشەیی نەبوە
مردو و نوستو، چەند زۆر، لە یەک ئەچن
ئاخۆ شێوەی مردنیان تیا نابینرێ
کێ ئەتوانێ جیاوازی بکا لە نێوان کۆیلە و کۆیلەدار دا ئەگەر هەردوکیان مردن
ئانوناکی خواگەورەکان پێشوەخت کۆئەبنەوە
مامیتومی چارەنوسساز لە گەڵ ئەوان
چارەنوس بڕیار ئەدەن
ژیان و مردنیان بەش کرد
بەڵام رۆژی مردنیان ئاشکرا نەکرد"

## خشتی یازدەهەم

گلگامێش بە ئوتناپیشتیمی دورەدەستی وت:
"هەرچەند سەیرت ئەکەم ئەی ئوتناپیشتیم
سەروسەکوتت جیاواز نابینم، تۆش وەکو من وایت و لە من جیاواز نیت
بەڵێ! تۆ نەگۆڕاویت بگرە تۆ لە من ئەچی
دڵی من وێنای کرد بوی وەکو پاڵەوانێکی تەواو
ئامادەی شەڕ
کەچی ئەتبینم بە لاوازی لە سەر پشت ڕاکشاوی
جا پێم بڵێ چۆن چویتە ناو کۆڕی خواکانەوە و
ژیانی جاویدانت بە دەس هێنا؟"

ئوتناپیشتیم بەرسڤی گلگامێشی دایەوە، وتی:
ئەی گلگامێش رازێکی نهێنی شاردراوەت بۆ ئەدرکێنم
لە نهێنیەکی خواژنت ئاگادار ئەکەم:
شوروپاک، ئەو شارەی تۆ شارەزای هەیت،
سەردەمی ئەو شارە بەسەرچو و ماخوای لێ بو
ماخوا مەزنەکان ویستیان تۆفان هەڵسێ
لە ناو خۆیان دا راوێژیان کرد
باوکیان ئانویان لە گەڵ بو
ئینلیلی پاڵەوان راوێژکاریان بو
نینورتا یاریدەدەر و وەزیریان بو
نیننوگی دەرگاوان و پەیامبەریان بو
نینئیگیکو واتە ئەیایان لە گەڵ بو

ئەم قسەکانی گەیاندن بە کۆڵیتی قامیش و پێی وت:
ئەی کۆڵیت! ئەی کۆڵیتی قامیش!
ئەی دیوار، ئەی دیوار!
ئەی کۆڵیتی قامیش گوێ بگرە و ئەی دیوار تێ بگە
ئەی پیاوی شوروپاکی، ئەی رۆڵەی ئوباراتوتو کۆڵیتەکەت هەڵوەشێنە و کەشتیەک بۆ خۆت دروست بکە
واز لە داراییەکەت بهێنە و هەوڵی رزگاری بدە
دەس لە موڵک هەڵبگرە و ژیانت قوتار بکە
لە کەشتیەکەدا تۆوی هەمو گیانداریَ سوار بکە
ئەو کەشتیەی دروستی ئەکەی ئەبێ ئەندازەکانی رابگری
پانییەکەی ئەوەندەی درێژییەکەی بێ...
کاتێ ئەمەم زانی بە خواکەمم ئایا وت:
گەورەم! قسەکانم بیستی، فەرمانەکەت جێبەجێ ئەکەم
بەڵام چی بە شارەکە بڵێم؟
بە چی وەڵامی خەڵک و پیرەکان بدەمەوە؟
ئایا دەمی کردەوە روی لە من، پێی وتم، من بەندەی ئەوم، پێیان بڵێ: "من زانیم کە ئینلیل ئەمبوغزێنێ
لێرە بەدواوە ناتوانم لە شارەکەتان دا بژیم
رو ناکەمە مەڵبەندێ ئینلیلی تێ دا نیشتەجێ بێ
بەڵکو دائەبەزم بۆ ئاپسو
لە گەڵ ئایا ئەژیم
ئێوەش فەڕ و خێرتان بە سەردا ئەبارێ
پۆلی مەل و ماسی ناوازە
وڵات پڕ ئەبێ لە دانەوێڵە و خێر
ئێوارە لەنگێزەی بارانی گەنمتان بە سەردا ئەبارێنێ"
کاتێ گزنگی بەیانی دا وڵات لە من کۆبونەوە
مەڕی بەنرخیان بۆ قوربانی بۆ هێنابوم
گاڕانی لەوەڕگای دەشتەکانیان بۆ قوربانی بۆ هێنا بوم
.....

بچوکەکان قیریان بۆ هێنام
گەورەکان پێویستیەکانی تر
لە رۆژی پێنجەم دا پەیکەرەکەیم دروست کرد
زەمینەکەی یەک ئیکو بو، بەرزایی دیوارەکانیشی سەدوبیست باڵ بو
درێژی هەریەکێ لە چوارلای زەمینەکەی سەدوبیست باڵ بو
شێوەی دەرەوەی و پەیکەرەکەیم وەها دیاری کرد:
شەش نهۆمم تیا دروست کرد
بەمەش کردم بە حەوت نهۆم



**شەری گلگامێش و ئەنکیدۆ لەگەڵ گامێشی وەحشی**

زەمینەکەیشم کردە نۆ بەش
پڕم کردن و پوازی ئاوم تیا داکوتان
سەوڵم تیا دانا و ئازوقەم بۆ دابین کرد
شەش شار قیرم لە کورەکەدا دارشت
سێ شار قەترانم داڕشت
سەبەتەهەڵگرەکان سێ شار رۆنیان هێنا
هەروەها یەک شار چەوری بۆ پڕکردنی پوازی ئاو
دو شار چەوری کەشتیەوان هەڵی گرت
ئینجا چێڵەکەم سەربڕی و لێم نا بۆ خەڵک
هەمو رۆژێ مەڕم کوشتەوە
دۆشاوی ترێ و بادەی سور و سپی و رۆناوم ئەدا بە وەستاکان بۆ ئەوەی وەکو ئاو بیخۆنەوە
بۆ ئەوەی وەکو رۆژانی سەری ساڵ جەژن بگێڕن
دەستم بە چەوریی رۆن شۆرد
کەشتیەکە لە رۆژی حەوتەم دا تەواو بو
دابەزاندنی بۆ ناو ئاو کارێکی زەحمەت بو
ئەبوایە تەختەکانی ناخەکەی لە سەرەوە و خوارەوە بگۆڕن
تا دوسێیەکی لە ئاوەکەدا نقوم بو
هەرچیم هەبو تیایدا بارم کرد
هەرچیم هەبو لە زیو خستمە ناوی
هەرچیم هەبو لە زێڕ خستمە ناوی
هەرچی گیاندارێکی زیندوم لە لا بو سوارم کرد
هەمو خزم و کەسوکارم سوار کرد
هەمو گیاندارانی کەوی و کێویم سوار کرد
هەمو وەستاکانم سوار کرد

خوا شاماش کاتێکی دیاریکراوی بۆ دانام، بە وتەی ئەو:
"لە دەمی ئێوارەدا کە رەهێڵەی بارانی مردن دایکرد
سواری کەشتیەکە ببم و دەرگاکە دابخەم"
کاتی دیاریکراو هات
لە شەودا خوای گەردەلول رەهێڵەی مردنی داکرد
سەیری کەشتیەکەم کرد ترسناک بو
چومە ناوی دەرگاکەمم داخست
ئاژۆتنی کەشتیەکەم سپارد بە کەشتیەوان بوزور ئاموری
پەیکەرە زەبەلاحەکە هەرچیەکی تێ دا بو بەوم سپارد

ستونی سێیەم
کاتی بەیانی گزنگی دا
لە ئاسۆی دورەوە تەمێکی تاریک دەرکەوت
خودا ئەدەد لە ناوی دا بروسکەی دا
شلات و خانیش لە پێشیانەوە ئەرۆیشتن
لە شاخەکان و لە دەشتەکان دا هۆشداریبیان ئەدا
خوا ئیراگال ئەستونەکانی خست
خوا نینورتا کە بە دوای دا هات بەنداوەکانی بەردایەوە
ئانوناکی مەشخەڵەکانی داگیرسان
بڵێسەی لە ئەرز هەڵسان
گرمەی خوا ئەدەد گەیشتە بنی ئاسمان
هەمو روناکیەکانی کردە تاریکی
زەوی وردوخاش بو وەکو چۆن گۆزە ئەشکێ
زەلانی خوارو بە درێژایی رۆژێکی تەواو بەردەوام بو
تەوژمەکەی توندتر بو تا چیاکانی داپۆشی
وەکو جەنگێکی سەخت خەڵکی تەفروتونا کرد
برا برای نەئەناسیەوە
خەڵکی ئاسمان ئەرزیان نەئەدی
تەنانەت خواکانیش لە لرفەی تۆفانەکە ترسان
هەڵاتن و هەڵکشان بۆ ئاسمانی ئانو
خواکان داسوکنان و لە پەنای دیوارەکەدا وەکو سەگ هەڵتروشکان
ئیشتار وەکو ژنی ژانگرتوی کاتی منداڵبون قیژاندی
ماخوا کروزایەوە، بە دەنگە بەسوزەکەی لاواندیەوە:
"ئاخوداخ! ئەوانەی رۆژانی کۆن بونەوە بە خاک
چونکە من لە کۆڕی خواکان دا بەدیەکانی ئەوانم درکاند
بۆچی بەدگۆییم کرد و

چۆن ویرانیم بە سەر گەلەکەم دا باراند
ئەوانەی لە من بوبون
وەکو گەرای ماسی سەرئاو کەوت بون
خواکانی ئانوناکی لە گەڵی گریان
بەڵێ! خواکان بە سەرشۆری دانیشتبون نەیان لاوانەوە
لێویان وشک هەڵگەرابو
شەش رۆژ و حەوت شەو رابورد
هێمان گەردەلولی تۆفانەکە بەردەوام و وڵاتی نقوم کرد
لە رۆژی حەوتەم دا لێشاوی تۆفانەکە کەم بوەوە
وەکو لەشکرێ لە جەنگ دا بێ تەفروتونای نەکرد
ئینجا دەریاکە هێور بوەوە و گەردەلولەکە نیشتەوە و تەوژمی تۆفان خاو بوەوە
سەیری ئاسمانم کرد. هێمنی هەمو لایەکی داگرت بو
خەڵکم بینی هەمویان بوبونەوە بە خاک
ئاوی جۆگاکان وەکو سەربان رێک لە ئاستێک دا وەستا بون
دەرزێکم کردە کلاوەکەمەوە روناکی کەوتە سەر روم
بە چۆک دا هاتم و دانیشتم گریام
فرمێسک لە چاوم رژا
سەیری کەناری دەریام کرد
دورگەیەکم بینی سەدوچلوچوار باڵ بەرز بو
کەشتیەکە لە سەر چیای نیسیر جێگیر بو
چیای نیسیر کەشتیەکەی راگرت نەیهێشت بروا
رۆژێک و دوان رابورد. چیای نیسیر کەشتیەکەی راگرت بو نەیەهێشت بروا
رۆژی سێیەم و چوارەم رابورد. چیای نیسیر کەشتیەکەی راگرت بو نەیەهێشت بروا
رۆژی پێنجەم و شەشەم رۆیی. چیای نیسیر کەشتیەکەی راگرت بو

## ستونی چوارەم

کە رۆژی حەوتەم هات کۆترێکم دەرهێنا، بەرەڵام کرد
کۆترەکە فڕی بەڵام گەڕایەوە
گەڕایەوە چونکە شوێنێکی نەدۆزی بوەوە لێی بنیشێتەوە
پلیسرگم دەرهێنا. بەرەڵام کرد ئەویش گەڕایەوە چونکە شوێنێکی نەدۆزی بوەوە لێی بنیشێتەوە
ئینجا قەلەرەشێکم دەرهێنا. بەرەڵام کرد
قەلەرەش فڕی. کە دی ئاوەکە نەماوە کشاوەتەوە دواوە
خواردی و خولایەوە و نیشتەوە و نەهاتەوە

ئەوسا هەرچی لە کەشتیەکەدا بو دەرم هێنا لە چوار لاوە با لێی ئەدا
قوربانیم ئامادە کرد

ئاوی پیرۆزم بە سەر لوتکەی چیاکەدا رژاند
حەفتاوحەوت مەنجەڵم بۆ قوربانیەکان دانا
قامیش و داری کاژ و ئاسم لە ژێردا کەڵەکە کرد
خواکان بۆنەکەیان هەڵمژی
بەڵێ خواکان بۆنە خۆشەکەیان کرد
خواکان وەکو مێش لە خاوەن قوربانی وروکان
کاتێ ماخوای مەزن ئیشتار هات
ملوانکە گەوهەرەکەی کە ئانو. بە ئارەزوی ئەو هۆنی بویەوە، هەڵبڕی و وتی:
"ئێوە ئەی خودایانی ئامادەبو. هەروەکو من گەردانەی لاجیوەردم لە بیر ناچێتەوە کە بە گەردنمەوەیە
هەروەها هەمو دەمێ هەست بەم رۆژانە ئەکەم و هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە
با خواکان بێن بۆ سەر قوربانیەکان
بەڵام ئینلیل نابێ لە قوربانی نزیک بکەوێتەوە
چونکە بێ ئەوەی رابمێنێ لێشاوی تۆفانی خوڵقان
خەڵکەکەی منی بە فەوتان دا"



گلگامێشی پاڵەوانی ئەفسانەیی شێری خستۆتە سەر شانی

کاتێ ئینلیل هات کەشتیەکەی دی تورە بو
خرۆشا بەرامبەر خوا ئیگیگی، وتی:
"سەیرە چۆن کەسێک بە ساغی رزگاری بوە
ئەبو هیچ کەسێ لە فەوتان دەرباز نەبێ؟"

خوا نینورتا دەمی کردەوە و روی قسەی لە پاڵەوان ئینلیل وتی:
"جگە لە ئەیا کێی تر ئەتوانێ ئەم کارە بکا؟
بەڵێ ئەیا رازە شاردراوەکان ئەزانێ"
ئەوسا ئەیا دەمی کردەوە رو بە ئینلیلی پاڵەوان وتی:
"ئەی پاڵەوان! تۆ ژیرترینی خواکانی

چۆن بە بێ ئەوەی رابمێنی لێشاوی تۆفانت خوڵقان
هەڵەکار ئۆباڵی هەڵەکەی هەڵگرت
دەستبرێژیکەر تاوانی دەسدرێژیەکەی هەڵگرت
بەڵام دڵنەرم بە لە سزادا بۆ ئەوەی نەفەوتێ
توند مەبە لە بەدی دا
ئەگەر تۆ لە باتی ئەوەی تۆفان بخوڵقێنی
شێرت بەردایەتە خەڵک ژمارەت کەم ئەکردنەوە
گورگت تێ بەردانایە ژمارەی خەڵکت کەم ئەکردەوە
لە باتی تۆفان قاتوقڕیت بخستایەتە وڵاتەوە
لە باتی تۆفان ئەگەر ئیرا خەڵکی بفەوتانایە
بەڵام من نهێنی خوا مەزنەکانم ئاشکرا نەکرد
بەڵکو ئەترا حاسیسم وا لێ کرد خەو ببینێ
پەی بە نهێنی خواکان ببا
ئێستا ئەرکەکەی گرتە ئەستۆ و چارەنوسی بڕیار دا
ئینجا ئینلیل سەرکەوتە سەر کەشتیەکە
دەستی گرتم و لە گەڵ خۆی سواری کەشتیەکەی کردم
ژنەکەشمی لە گەڵ من سوار کرد بە تەنیشت خۆمەوە کڕنوشی پێ برد
لە نێوانی هەردوکمان دا راوەستا، دەستی هێنا بە تەوێڵمان دا و پیرۆزبایی لێ کردین وتی:
پێش ئێستا ئوتناپیشتیم مرۆڤێ بو
بەڵام لە ئێستاوە ئوتناپیشتیم و هاوسەرەکەی هاوشێوەی ئێمەی خوا ئەبن
ئوتناپیشتیم لە دور، لە دەمی روبارەدا ئەژی
ئینجا دوریان خستمەوە و لە دەمی روباردا نیشتەجێیان کردم
ئێستا ئەی گلگامێش کێ خواکان لە پێناوی تۆدا کۆ ئەکاتەوە
بۆ ئەوەی ئەو ژیانە بە دەس بهێنی کە ئەتەوێ
وەرە تاقیت بکەمەوە شەش رۆژ و حەوت شەو مەنو"

بەڵام ئەو هێشتا کفت و خەواڵوە ئەڵێی تەم دایگرتوە
ئوتناپیشتیم ئاوڕی لە ژنەکەی دایەوە و پێی وت:
"بڕوانە! ئەم پیاوە پاڵەوانە داوای ژیان ئەکا
کەچی خەو بردویەتیەوە ئەڵێی تەم دایگرتوە"
هاوسەرەکەی ئوتناپیشتیم وەڵامی مێردەکەی دایەوە وتی:
"ئەم پیاوە راوەشێنم بۆ ئەوەی بە ئاگا بێ
تا لەو ڕێگەیەوە کە لێوەی هاتوە بە سەلامەتی بگەڕێتەوە
لەو دەرگایەوە لێوەی دەرچوە بچێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی"
ئوتناپیشتیم وەڵامی ژنەکەی دایەوە پێی وت:
"تەفرەدان لە سروشتی مرۆڤ دایە. هەڵت ئەفریوێنێ

ئەی کولێرەی نانی بۆ ببرژێنە و لە ژور سەری دابنێ
ئەو رۆژانەش تیا نوستوە لە سەر دیوارەکە نیشان بکە"

خەپلەی بۆ برژاند و لە ژور سەری دانا
لە سەر دیوارەکەش رۆژانی نوستنەکەی نیشان کرد
خەپلەی یەکەم وشک بو و خەپلەی دوەم هەڵکرووزا
سێیەم هێشتا تەڕ بو
خەپلەی چوارەم کەڕوی هەڵهێنا
پێنجەم هێشتا تازە بو کە شەشەم ئامادە کرا
لە کاتێک دا حەوتەم لە سەر پشکۆ بو تێوەی ژەند بە ئاگا هات
کە گلگامێش لە خەو هەستا بە ئوتناپیشتیمی دوری وت:
"هێشتا خەو نەیبردبومەوە تێتەوە ژەندم و خەبەرت کردمەوە"
ئوتناپیشتیم وەڵامی گلگامێشی دایەوە پێی وت:
"ئەی گلگامێش کولێرەکان بژمێرە
نیشانەکانی سەر دیوارەکە ژمارەی ئەو رۆژانەت پێ ئەڵێن کە خەوت بوی
کولێرەی یەکەم وشک بوە، دوەم بە کەڵک نەماوە
سێیەم هێشتا تەڕە، چوارەم کەڕوی هەڵهێناوە، پێنجەم هێمان تازەیە و شەشەم ئێستا برژێنراوە، حەوتەم ئیتر خەبەرت بۆتەوە"
گلگامێش بە ئوتناپیشتیمی دوری وت:
"ئەی ئوتناپیشتیم! من ئەبێ چی بکەم و رو لە کوێ بکەم؟
هەستێکی تۆقێنەر دڵ و دەرونی داگرتوم
بەڵێ! لە هەر جێیەک رائەکشێم مەرگی لێیە
لە هەر جێیەک پێ دائەنێم مەرگ چاوەڕێمە"

ئینجا ئوتناپیشتیم بە ئورشانابی کەشتیەوانی وت:
"ئەی ئورشانابی! هیوادارم لەنگەرگا پێشوازیت لێ نەکا
رێگەی پەڕینەوەت نەبێ
لە کەنارەکە بە دەرکراوی برۆی
ئەو پیاوەی بۆ ئێرەت هێناوە
چڵکنە، کرێشی پێوەیە
پێستی گیاندار جوانیەکانی لەشی شاردۆتەوە
ئورشانابی بیبە بۆ سەرشۆرک
بۆ ئەوەی لە ئاوەکەدا چڵکەکەی بشۆرێ وەکو بەفر پاک بێتەوە
بۆ ئەوەی جوانی لەشی دەربکەوێ کەوڵی گیاندارانی لە بەر داکەنی و توری بدەیتە دەریاوە
تەپلەکەی سەری نوێ بکاتەوە
جلێ لە بەر بکا روتیەکانی بشارێتەوە

تا ئەگاتەوە شارەکەی خۆی و
ڕێگای سەفەرەکەی کۆتایی دێ
مەهێڵە نیشانەی کۆنیی بە جلەکانیەوە دیار بێ
بەڵکو تازەییەکەی بپارێزە"

ئورشانابی بردی بۆ سەرشۆرک
چڵکەکانی شت تا وەکو بەفر پاک بوەوە
جلە چەرمینەکانی لە بەر داکەند و دای بە دەم دەریاوە
تا جوانی لەشی دەرکەوت
تەپلەکەی سەری نوێ کردەوە
جلێکی کردە بەری روتیەکانی شاردەوە
تا ئەگاتەوە شارەکەی خۆی و کۆتایی بە ڕێگاکەی ئەهێنێ
جلەکانی هەمیشە تازە بێ
گلگامێش و ئورشانابی سواری کەشتی بون
کەشتیەکەیان دابەزاندە ناو شەپۆلەکان و ئامادە بون بۆ جمین
ئەودەم ژنەکەی ئوتناپیشتیم بە مێردەکەی وت:
"گلگامێش روی لە ئێرە کردوە ماندو بوە و ڕەنجی زۆری داوە
لە کاتێک دا کە ئەگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی ئەبێ چی بدەیتێ؟"
لەو کاتەدا گلگامێش سەوڵێکی بەرز کرد بوەوە بۆ ئەوەی کەشتیەکە لە کەنار نزیک بکاتەوە
ئوتناپیشتیم گەیشتێ پێی وت:
"گلگامێش روت لە ئێرە کردوە و ڕەنجی زۆرت داوە
ئەشێ چیت بدەمێ وا کە ئەگەڕێیتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆت؟
ئەی گلگامێش، نهێنیەکی شاردراوەت بۆ ئەدرکێنم
بەڵێ! یەکێ لە نهێنیەکانی خواکانت بۆ ئاشکرا ئەکەم
گیایەک هەیە دڕکاویە لە ناو ئاودا ئەڕوێ
چقڵەکەی بە دەست دا ئەچەقێ
ئەگەر ئەم گیایە بە دەس بهێنی ژیانت نوێ ئەبێتەوە"

هەر کە گلگامێش گوێی لەم قسانە بو
ئاوەڕێی گرتە بەر کە بەرەو ئاوە قوڵەکان ئەچو
بەردی قورسی بە قاچیەوە بەست
ڕۆچو بۆ ناخی ئاوەکە لەوێ گیاکەی بینی
گیاکەی کە دڕکەکانی بە دەستی دا ئەچو هەڵکەند
بەردە قورسەکانی لە قاچی کردەوە
لە ناخی دەریاوە سەری دەرهێنا بۆ کەنارەکەی

گلگامێش بە ئورشانابی کەشتیەوانی وت:
"ئورشانابی ئەم گیایە سەیرە
مرۆڤ ئەتوانێ تینوتاوی ژیانی پێ بهێنێتەوە
لە گەڵ خۆم ئەیبەمەوە بۆ ئوروکی شورەدار
بە خواردنی دا خەڵک بەشدار ئەکەم
ناوەکەی ئەبێتە: پیر ئەگەڕێتەوە بۆ هەرەتی گەنجی
منیش لە دوارۆژەکانی ژیانم دا ئەیخۆم تا گەنجێتیم بۆ بگەڕێتەوە"
ئینجا کەوتنە رێ پاش ئەوەی بیست سەعاتی دوبارەیان بڕی لە توێشوەکەیان خوارد
پاش سی سەعاتی دوبارە راوەستان بۆ ئەوەی شەو لەوێ بە سەر بەرن
گلگامێش گۆماوێکی ساردی دی
لەبەری خۆی لە ئاوەکەی دا بشوا
مار بۆنی گیاکەی کرد
بە دزییەوە بۆی خشی و گیاکەی رفاند و خواردی
ئەوەش لەشی کاژێکی فڕێ دا
ئەوسا گلگامێش دانیشت دایە پرمەی گریان، ئاو بە روومەتەکانی دا هاتە خوارەوە
بە ئورشانابی کەشتیەوانی وت:
"لە پێناوی کێ دا دەستەکانم شل بون؟
لە پێناوی کێ دا خوێنی دڵم رژا؟
هیچ دەسکەوتێکم بۆ خۆم نەبو
بەڵێ! دەسکەوتم بۆ شێری خاک بە دەس هێنا
پاش بیست سەعاتی دوبارە
ئەم ئافەریدەیە دێت گیاکەم لێ ئەرفێنێ؟
پێشتر کە چومە ئاورێی ئاوەکە
هۆشداریەکم دی، بۆ ئەوەی لەم خواستە دەس هەڵ بگرم و
کەشتیەکە لە کەناردا جێ بهێڵم"

پاش بیست سەعاتی دوبارە رێیوان لە توێشوەکەیان خوارد
پاش سی سەعاتی دوبارە راوەستان بۆ ئەوەی شەو لەوێ بە سەر بەرن
ئینجا گەیشتنە ئوروکی شورەدار
گلگامێش بە ئورشانابی کەشتیەوانی وت:
"ئورشانابی! سەربکە، بە بان شورەی ئوروک دا برۆ
بروانە بناغەکەی، سەیری کەرپوچەکانی بکە
ئاخۆ لە خشتی سورەوەکراو دروست نەکراون؟
ئایا حەوت داناکە بنچینەکەیان دانەناوە؟
یەک شار دانراوە بۆ نیشتەجێ بون
یەک شار بۆ باخی دارخورما

یەک شار بۆ نەشتی ناوێری، جگە لە گەڕەکی پەرستگای ئیشتار
ئوروک سێ شار و یەک گەڕەکە"

## تێوەردان

لە گێڕانەوەی ئەم لاوژەیە دا ئەشێ لە ئاستی هەندێ ناودا ئیستێ بکرێ:
گل – گامێش، خۆی "گا" بوە، لە دایکەوە کوڕی "خاتو مانگایە"، یەکێ لە ئەبەرئە گەورەکانی لەگەڵ "گا" ی ئاسمانی بوە، لە چەندین شوێن باسی "گاکێوی" کراوە.
لە زمانی کوردی دا تا ئێستاش وشەگەلی گا، جوانەگا، گاجوت، گامێش، مانگا، بۆ جۆرێ لە گیاندار و، وشەی گا بۆ نیشانەیەک لە گەورەیی، وەکو: گاکۆتر – کۆتری گەورە، گابەرد – بەردی گەورە، گاتو – توی گەورە، بەکار دێ.
لە گێڕانەوەی چیرۆکی تۆفان دا، کە بەشێکی سەرەکی داستانەکەیە، کەشتی دەرباز بونی مرۆڤ لە سەر کێوی "نیسیر" گیرساوەتەوە. بە وتەی هەندێ زانا لەوانە تەها باقیر کێوی "نیسیر" شاخی "پیرەمەگرون" ە. پیرەمەگرون یەکێ لە چیاکانی قەزای دوکانی پارێزگای سلێمانیە.(طه باقر: مقدمة في ادب العراق القديم، دار الوراق، 2010، ص (150هامش))
لە زمانی کوردی دا تا ئێستاش وشەگەلی "نسێ" و "نسار" و "نزار" بۆ شوێنی فێنکی شاخ کە خۆر نایگرێتەوە بەکار دێ.

## وشەی نائاشنا

برک دان: فڕێدان بە قێزوبێزەوە.
بڕست: هێز و توانا.
بیچم: شێوەی لەش.
پلیسرگ: مەلی پەرەسێلکە.
پەیکان: پارچەیەک ئاسن یا پەڕی ئەستور، یا دارێکی تیژە، ئەکرێ بە نوکی تیرەوە.
تاپۆ: تارمایی گیانی مردو.
تەپکە: چاڵێکە ڕاوکەر هەڵی ئەکەنێ لە سەر ڕێی نێچیردا بۆ ئەوەی تەفرەی بدا، سەری بە پوش، یا بە دار، یا بە بەرد، ئەگرێ بۆ ئەوەی لە کاتی ڕۆیشتن دا نێچیرەکەی تێ بکەوێ.
تەپلە: جۆرێکە لە کڵاو.
تۆڕ: چەند ڕایەڵێکی تان و پۆیە لە بەن یا دەزو تێهەڵکێش ئەکرێ ڕاوکەر بڵاوی ئەکاتەوە بۆ ئەوەی مەل یا گیانداری چوارپێی تێ بکەوێ.
تورِ دان: فڕێدان بە قێزوبێزەوە.
توک: دوعای شەڕ.
توێشو: خواردنێ کە ڕێبوار لە گەڵ خۆی هەڵی ئەگرێ بۆ ئەوەی لە کاتی برسێتی دا لە ڕێگا بیخوا.
خورت: بە هێز.
داهێزران: خاڵیبونەوەی لەش لە هێزی کار و توانای ئیشکردن.

دورج: سندوق. سالم ئەڵێ:

**"لە دورجی سینەما تا گەوهەری یادی روخی تۆ بێ**

**لە بەر شوعلەی ئەوا شەو تا سەحەر مەیلی چرا ناکەم."**

زنج: ژوورێکی هەژارانەیە لە زەل و پوش و گەڵا. جوتیار لە ناو باخەکەی دا بۆ حەوانەوەی خۆی دروستی ئەکا.

زێوان: خزمەتکاری گۆڕ، مزگەوت یا پەرستگا.

سەوڵ: دارێکی درێژە، کەڵەکەوان، بەلەمەوان، کەشتیەوان، لە کاتی لێخورین دا سەرەکەی بە دەس ئەگرێ و نوکەکەی لە گڵی بنی چەم، روبار، دەریاکە گیر ئەکا بۆ ئەوەی تەکانی رۆیشتن بە کەشتیەکەی بدا.

شیپان: لایەک لە چوارچێوەی دەرگا.

کاژ: کاج. جۆرێکە لە داری سنەوبەر. هەروەها: پێستێکی سپی تەنکە مار لە خۆی دائەماڵێ.

کلۆم: قفڵی لە دار دروستکراوی دەرگای پێ داخراوە.

کەنیز: ئافرەت، کچ یا ژن، کرا بێ بە کۆیلە.

کۆز: شوێنێکی سەر نەگیراوە، بە تەیمان بە بەرزایی مەترێ زیاتر چواردەوری گیراوە، تەرخان کراوە بۆ مۆڵدانی بەرخ و کار، لە بەهار و هاوین دا، بە تایبەتی لەو ماوەیەدا کە هێشتا شیری دایکیان مژیوە. پێشینان وتویانە: "کۆزی کارگەل ببینە ئینجا قەپوچک دابگرە!"

کۆڵیت: ژوورێکی هەژارانەیە لە قوڕ و بەرد یان پوش و گەڵا جوتیار لە ناو باخەکەی دا بۆ حەوانەوەی خۆی دروستی ئەکا.

کوانو: ئاگردان.

کوشتنەوە: سەربڕینی گیاندار بە چەقۆ.

ملۆزم: نەیار.

مێمڵ: نەیار.

نزا: دوعای خێر.

نەیچە: قامیشێکی باریکە ناوەکەی پتەوە.

هەڵ تیزان: رەوینەوە و راکردنی خێرای گیانداری چوارپێ.

هەڵ توتان: جۆرێکە لە دانیشتن.

هەڵ تروشکان: جۆرێکە لە دانیشتن.

هەڵ زنین: هەڵگەڕان بە دیواری بەرز و شورە و چیادا.

هەڵ ئاژیان: راکشان لە سەر پشت یا لە سەر لا.

هەنون: چەورکردنی پێستی مرۆڤ بۆ شێلان و بۆنخۆشکردنی.

# لاوژەی
# گلگامێش و ئاگا ی کیش

## چکاوەی بابەت

"کیش" و "ئونوک" دو شار بون. دو "دەوڵەتی شار" بون هەریەکەیان شای خۆی هەبوە.
شای کیش ئاگا بوە و، شای ئونوک گلگامێش.
شای ئونوک نوێنەری ناردوە بۆ لای شای ئونوک داوای لێ کردوە بۆ کاری بێگاری، بۆ هەڵکەندنی بیر و چاڵاو، کۆمەڵێ کەسی بۆ بنێرێ، هەڕەشەی کردوە کە ئەگەر داواکەی جێبەجێ نەکرێ دەچێتە سەریان و، بە زۆر ملیان پێ کەچ دەکا.
گلگامێش، شای ئونوک، ئەنجومەنی پیرانی شارەکەی کۆ کردۆتەوە راوێژی پێ کردون ئاخۆ لە نرخی ئاشتی دا ملکەچ بکەن بۆ داواکەی شای کیش یان خۆیان بۆ روبەروبونەوەی چەکدار ئامادە بکەن.
"ئەنجومەنی پیران" ئاشتی و خۆبەدەستەوەدان هەڵدەبژێرن.
گلگامێش ئەم بڕیارەی بە دڵ نابێ.
ئینجا ئەنجومەنی پیاوانی کارامەی شارەکەی کۆ کردۆتەوە راوێژی پێ کردون ئاخۆ لە نرخی ئاشتی دا ملکەچ بکەن بۆ داواکەی شای کیش یان خۆیان بۆ روبەروبونەوەی چەکدار ئامادە بکەن.
"ئەنجومەنی پیاوانی کارامە" جەنگ و روبەڕوبونەوە هەڵدەبژێرن.
گلگامێش ئەم بڕیارەی بە دڵ دەبێ.
لەم کەینوبەینەدا بون ئاگا هێزێکی گەورەی هێناوەتە سەر ئونوک و گەمارۆی داوە.
گلگامێش یەکێ لە پاڵەوانەکانی بە نوێنەرایەتی خۆی رەوانەی لای ئاگا ی فەرماندەی هێزی گەمارۆدەر دەکا، بەڵام ئەوان لە باتی گفتوگۆ بە تێهەڵدان پێشوازی دەکەن. لەو کاتەدا یەکێ لە ئەفسەرەکانی لەشکرەکەی گلگامێش سەردەکەوێتە سەر شورەی ئونوک، لە پاڵەوانە گیراوەکە دەپرسن ئاخۆ ئەوە شاکەیانە یا کەسێکی ترە ئەو نکولی دەکا ئەوە شاکەیان بێ زۆرتری تێ هەڵ دەدەن، ئەوسا دەنکێدو لە دەرگای شورەی ئونوک دەوە بۆیان دەردەپەڕێ و، گلگامێش خۆی سەردەکەوێتە سەر شورەی شار. هێزەکەی ئاگا بە دیتنی ئەو دیمەنە

شڵەژانی تێ ئەکەوێ و، پەرەوازە ئەبن. لەشکرکێشیەکە لە باتی شەڕ بە دۆستایەتی گلگامێش و ئاگا کۆتایی دێ. گلگامێش ستایشی ئاگا ئەکا و ئاگا یش واز لە شەڕ ئەهێنێ.

# لاوژەی
# گلگامێش و ئاگا

1- 8: نێردراوەکانی ئاگای کوڕی ئین می باراجە سی
لە کیشەوە هاتن بۆ ئونوگ بۆ لای گلگامێش،
گلگامێش داواکەیانی خستە بەردەم پیرانی شارەکەی، وشەکانی بە وریایی هەڵبژارد:
"زۆر بیر هەن ئەبێ تەواو بکرێن
هێشتا زۆر لە بیرەکانی وڵات هەن ئەبێ تەواو بکرێن
چاڵاوی تەنک لە وڵات دا هەن ئەبێ تەواو بکرێن
گەلێ بیر هەن ئەبێ قوڵ بکرێن و گوریسی هەڵگۆزینیان لە سەر بیەسترێ.

ئایە ئەشێ ئێمە ملکەچ بکەین بۆ بنەماڵەی کیش! ئەشێ بە چەک لێیان نەدەین؟"

9 - 14: لە کۆبونەوەی ئەنجومەن دا، پیرانی شار، وەڵامی گلگامێشیان دایەوە:
"لە راستی دا زۆر بیر هەن ئەبێ تەواو بکرێن
هێشتا زۆر لە بیرەکانی وڵات هەن ئەبێ تەواو بکرێن
چاڵاوی تەنک لە وڵات دا هەن ئەبێ تەواو بکرێن
گەلێ بیر هەن ئەبێ قوڵ بکرێن و گوریسی هەڵگۆزینیان لە سەر بیەسترێ.
بۆیە ئەبێ ئێمە ملکەچ بکەین بۆ بنەماڵەی کیش! نابێ بە چەک لێیان بدەین؟"

15 - 23: گلگامێش، مەزنی کولابا،
متمانەی بە ئینانا هەبو
ئامۆژگاری پیرانی شارەکەی بە هەند وەرنەگرت
گلگامێش، ئەمجارەیان پرسەکەی خستەوە بەردەم پیاوە کارامەکانی شارەکەی، وشەکانی بە وریایی هەڵبژارد:
"زۆر بیر هەن ئەبێ تەواو بکرێن
هێشتا زۆر لە بیرەکانی وڵات هەن ئەبێ تەواو بکرێن
هێشتا چاڵاوی تەنک لە وڵات دا هەن ئەبێ تەواو بکرێن
گەلێ بیر هەن ئەبێ قوڵ بکرێن و گوریسی هەڵگۆزینیان لە سەر بیەسترێ.

لەمەوبەر، هەرگیز، ئێوە ملکەچ نەبون بۆ بنەماڵەی کیش! ئاخۆ نابێ بە چەک لێیان بدەین؟"

24 - 29: لە کۆبونەوەی ئەنجومەن دا پیاوانی کارامەی شارەکەی بەرسڤی گلگامێشیان دایەوە:
"لە ناو ئەوانەدا کە راوەستاون و، لە ناو ئەوانەدا کە دانیشتون

ە ناو ئەوانەدا کە هاودەمی کوڕانی شا بون
ە ناو ئەوانەدا کە سەرومڕ رەشمەی کەریان بە دەستەوەیە... کێ ئەوەندە هەناسەی درێژە؟" وەک ئەڵێن.
"ئێوە ئەی پیرەپیاوان ناشێ ملکەچ بکەن بۆ بنەماڵەی کیش! ئەشێ ئێمەی گەنجان بە چەک لێیان ئەدەین؟"

30 - 39: "خوا گەورەکان پەیکەرەی ئونوگیان خولقاندوە، دەستکردی خودایان. خانوەکەی نی ئانا لە بەهەشتەوە دابەزیوە،
بڕوانە شورە بڵندەکەی، کە ئان دروستی کردوە. نشینگەی شاهانە کە ئان دروستی کردوە،
تۆ شاهی، جەنگاوەری، کەسێکی ڕوخۆشی، میری خۆشەویستی ئانی
کاتێ ئاگا دێت، ئەبێ چۆن بتۆقێ!
سپاکەی بچوکە، هێزەکانی پشتەوەی دوڵییان تێ کەوتوە، پیاوەکانی ناتوانن ڕوبەڕوی ئێمە ببنەوە"

40 - 47: گلگامێش، مەزنی کولابا،
بە ئامۆژگاری پیاوانی کارامەی شارەکەی شادمان بو، ورەی بەرز بوەوە
بە ئەنکیدوی نۆکەری وت:
"بەم پێیە با چەک و تفاقی شەڕ ئامادە بکرێ، با کوتەک لە بەردەستی خۆت دا بێ
ڕەنگە ئەوە ترس و تۆقاندنێکی زۆر بخولقێنێ
کاتێ کە ئەو هات ترسی گەورەی منی لێ ئەنیشێ و، ئەبەزێ
بەهانەکانی پوچ ئەبێتەوە و، حسابەکانی تێک ئەچێ"

48 - 54: نە پێنج و، نە دە ڕۆژ تێ ئەپەڕی
ئاگای کوڕی ئێن می باراجە سی لە گەڵ پیاوەکانی گەمارۆی ئونوگی دا
بڕیاری ئونوگ پوچ بوەوە
گلگامێش، مەزنی کولابا، بە جەنگاوەرەکانی خۆی وت:
"ئەی جەنگاوەران! کێتان خۆبەخش و ئازایە، بە خۆی دا ڕائەپەڕموێ، بچێ بۆ لای ئاگا؟"

55 - 58: بیرهور- تورا، پاسەوانی شاهانە، بە شانازیەوە بە شاکەی وت:
"من ئەڕۆم بۆ لای ئاگا
ئەوسا بەهانەکانی پوچ ئەبێتەوە و حسابەکانی تێک ئەچێ"

59 - 69: بیرهور- تورا لە دەروازەی شار دەرچو
هەر کە بیرهور- تورا لە دەروازەی شار چوە دەرەوە
لە بەردەم دەرگاکەدا گرتیان و
تێروپڕیان تێ هەڵدا.

هاتە بەردەم ئاگا و قسەی بۆ کرد.
پێش ئەوەی قسەکانی تەواو بکا، ئەفسەرێکی ئونوگ سەرکەوتە سەر شورەکە و لە بان شورەکەوە دەرکەوت.

ئاگا ئەوی بینی و بە بیرهور- تورای وت:
"کۆیلە! ئەو کابرایە شاکەی تۆیە؟"

70 - 81: "ئەو کابرایە شاکەی من نیە!
ئەو کابرایە ئەگەر شاکەی من بوایە:
ناوچەوانی گرژ ئەبو، چاوەکانی لە هی گا ئەچون، ڕیێنی پیرۆزەیی ئەبو، پەنجەکانی جوان ئەبون،
ئاخۆ نەیئەتوانی جەماوەرەکە بخرۆشێنێ، جەماوەرەکە برمتێنێ، جەماوەرەکە لە تەپوتۆزدا بگەوزێنێ، هەمو خەڵک بحەپەسێنێ، سەرچاوەی ئاوەکانی وڵات پڕ بکا لە لیتە، قەپۆزی کەشتیەکانی بشکێنێ.
ئاگا، شای کیش، لە ناوەڕاستی لەشکرەکەی خۆی دا بە دیل بگرێ؟"

82 - 89: کەوتنەوە تێ هەڵدانی، شپرزەیان کرد
تا توانییان بیرهور- تورا یان کوتا
گلگامێش، لە دوای ئەفسەرەکەی ئونوک، خۆی سەرکەوتە سەر شورەکە
ترس لە گەنج و پیری کولابا نیشت
لە بەردەم دەروازەی شاردا کۆبونەوە
پیاوە کارامەکانی ئونوگی بە گورزی شەڕ چەکدار کرد و لە سەر ڕێی دەروازەی شاردا مۆڵی دان
تەنیا ئەنکیدو لە دەروازەی شار چوە دەرەوە
گلگامێش لە سەر شوراکەوە دەرکەوت، بۆ خوارەوەی ڕوانی،
ئاگا چاوی پێی کەوت:
"ئەی کۆیلە! ئەم پیاوە شاکەی تۆیە؟"

92 - 99: "ئەو پیاوە بە ڕاستی شاکەی منە"
هەر کە ئەوەی لە دەم دەرچو،
گلگامێش، جەماوەرەکەی خرۆشان، جەماوەرەکەی ڕمتان، جەماوەرەکەی لە تەپوتۆزدا گەوزان، خەڵک هەموی حەپەسان، سەرچاوەی ئاوەکانی وڵات پڕ بون لە لیتە، قەپۆزی کەشتیەکان شکان.
ئەو، ئاگای شای کیشی، لە ناوەڕاستی لەشکرەکەی خۆی دا گرت.

100 - 106: گلگامێش، مەزنی کولابا، بە ئاگای وت:
"ئاگای سەرکارم ، ئاگای جەنەراڵم
ئاگا ئەی فەرماندەی لەشکرەکەم!
ئاگا هەناسەی پێ بەخشیم، ئاگا ژیانی پێ دام
ئاگا داڵدەی لێقەوماوانی دا
ئاگا، مەلی باڵداری لە گەنم تێر کرد"

107 - 113: (پیاوە کارامەکانی بە گلگامێشیان وت:)
"تۆ چاودێری ئونوگ ی، دەستکردی خواکانی!

شورە بڵندەکەی، کە ئان دروستی کردوە!
نشینگە شاهانەکەی کە ئان دای مەزراندوە!
تۆ شا و پاڵەوانی ئەوێی، تۆ کەسێکی روخۆشی، میری خۆشەویستی ئانی!"

گلگامێش رو لە ئاگا وتی:
"پێش ئوتو، لێرە پاداشتی چاکەکەت ئەدرێتەوە
من چاودێر بوم لە ئونوگ، دەستکردی خواکان،
شورە بڵندەکانی کە سەریان لە هەور ئەسون
نشینگەی شاهانە کە ئان دروستی کردوە
شار پاداشتی ئەو چاکەیەت ئەداتەوە کە بەرامبەر منت نواند
بەر لە ئوتو، لێرە پاداشتی چاکەکەت ئەدرێتەوە!"

ئاگای ئازاد کرد بگەرێتەوە بۆ کیش.

114 - 115: ئەی گلگامێش، مەزنی کولابا، ستایشی تۆ چەند خۆشە!

## تێوەردان

هەندێ لەو شوێنەوارناسانەی کە لاوژەی "ئاگا" یان ساغ کردۆتەوە و خوێندۆتەوە، لەوانە شوێنەوارناسی ناسراو کرێمەر، بە گرنگیەکی تایبەتیەوە باسیان لێ کردوە، چونکە:
یەکەم، بە پێی لێکدانەوەی ئەوان "کیش" و "ئونوگ" دو "دەوڵەتی شار" بون. دەوڵەتی شار لە سەردەمی سومەریەکان و دواتریش لە سەردەمی ئاکادی و بابلی دا لە هەندێ لە ناوچەکانی میزۆپۆتامیا مۆدێلی سیستەمی بەڕێوەبردن بوە. سیستەمی "دەوڵەتی شار" دواتر لە یۆنانی کۆن دا بوە بە باو.
دوەم، گوایە ئەم گێڕانەوەیە نیشانەیە بۆ جۆرێ لە ژیانی دیمۆکراسی سەرەتایی. لە سێیەم هەزارەی پێش زاین دا بۆ یەکەم جار لە مێژوی مرۆڤایەتی دا ئونوگ پارلەمانی "دو ژوری" ی هەبوە، ژورێکی "ئەنجومەنی پیران" و ژورێکی "ئەنجومەنی پیاوانی کارامە". لە پرسێکی چارەنوسسازی وەکو جەنگ و ئاشتی دا گەورەی وڵات پرسی پێ کردون.

**سەرچاوە**

لە بەر تێکستی ئینگلیزی وەرگیراوە و لە گەڵ تێکستی عەرەبی بەراورد کراوە،
بۆ تێکستی ئینگلیزی بڕوانە:
The Electronic Text Corpus of Sumerian Literature- Oxford University
بۆ تیکستی عەرەبی بڕوانە: (صاموئيل نوح كريمر، السومريون: تاريخهم وحضارتهم وخصائصهم، ترجمة الدكتور فيصل الوائلي، الناشر وكالة المطبوعات، الكويت) ص(258-264)
بۆ کورتەی عەرەبی بڕوانە: الدكتور فاضل عبدالواحد حق: سومر: اسطورة وملحمة، 1977 بغداد. (ص 160 – 161)

# لاوژەی
# گلگامێش و ئەنکیدو و، جیهانی ژێرو

## چکاوەی بابەت

لە کەناری روباری فورات دا درەختێ هەبوە. کە ئەشێ داری "بی" بوبێ. بایەکی توند هەڵی ئەکێشێ و ئاوی فورات ئەیبا بۆ دور.

ئینانا لە کەناری فورات لە سەر داوای ئان و ئینلیل، کە دوان لە بەهێزترینی خواکان بون، پیاسەی کردوە. دارە هەڵکەنراوەکەی بینیوە، لە ناو دەری هێناوە و هەڵی گرتۆتەوە لە ناو باخەکەی خۆی دا بیروێنێ بۆ ئەوەی کە ئەستور بو لە دارەکەی کورسی و تەختی نوستن دروست بکا.

هەژدیهایەک رەگەکەی و، ماخێوێک ناوقەدەکەی و، مەلێک چڵەپۆپەکەی داگیر ئەکەن. نایەڵن دارەکە ئەشونما بکا و، گاڵتە بە ئینانا ئەکەن. ئینانا ناتوانێ چاریان بکا.

ئینانا پەنا ئەبا بۆ ئوتو ی برای یارمەتی بدا دارەکەی بۆ وەربگرێتەوە. ئوتو ئامادە نابێ یارمەتی بدا ئینانا. ئینجا، پەنا ئەبا بۆ گلگامێشی برای. گلگامێش ئامادەیی دەرئەبڕێ بۆ یارمەتی دانی.

گلگامێش خۆی بە تفاقی شەڕ چەکدار ئەکا. ئەچێتە وێزەی دارەکە. هەژدیهاکە ئەکوژێ. ماخێوەکە لە ترسا هەڵدێ و مەلەکەش بەچکەکانی بەرەو چیاکان ئەفڕێنێ. گلگامێش دارەکە ئەبڕێتەوە و، پێشکەشی ئینانا ی ئەکا، کورسی و تەختی بۆ خۆی لێ دروست بکا و، خۆیشی لە رەگەکەی و لە چڵەپۆپەکەی دو ئامڕازی موسیقی دروست ئەکا.

بە دەنگی ئەم دو ئامڕازە، لە مەیدانە گشتیەکان دا، خەڵک داوا ئەکا بۆ شەڕ.

دایک و هاوسەری گەنج و بێوەژنانی، قوربانیانی شەڕەکان، توکی لێ ئەکەن. ئامڕازەکانی وەکو سزا بەرئەبنەوە بۆ ناو جیهانی خوارو.

گلگامێش خۆی بە دەست و قاچ هەوڵ ئەدا دەریان بهێنێتەوە، بەڵام ناتوانێ. بە کەساسی لە بەر دەرگای جیهانی خوارودا دائەنیشێ و دەس ئەکا بە گریان و دوزانەوە. ئەنکیدو، هاوڕێ و نۆکەری، هەستی بەزەیی ئەبزوێ، ئامادەیی دەرئەبڕێ بچێ بۆ جیهانی ژێرو ئامڕازەکانی بۆ بهێنێتەوە.

گلگامێش بۆ ئەوەی ئەنکیدو بە سەلامەتی بچێ و بە سەلامەتی بگەڕێتەوە کۆمەڵێ ڕێنمایی ئەکا. بەڵام ئەنکیدو لە گەشتەکەی دا گوێ ناداتە ڕێنماییەکانی گلگامێش، لە بەر ئەوە جیهانی ژێرو ڕێگەی نادا بگەڕێتەوە سەر ئەرز، بە یەکجاری گلی ئەداتەوە..

گلگامێش پەنا ئەبا بۆ ئینلیل ئەنکیدوی بۆ بهێنێتەوە. ئینلیل ئامادە نابێ یارمەتی بدا.

گلگامێش ئینجا پەنا ئەبا بۆ ئینکی ئەنکیدوی بۆ بهێنێتەوە، ئینکی تەنیا ئەوەندەی لە دەس دێ دەلاقەیەک بکاتە جیهانی ژێرو تاپۆی گیانی ئەنکیدو سەری لێ دەربهێنێ لە گەڵ گلگامێش گفتوگۆیەک بکا.

تاپۆی ئەنکیدو و گلگامێش بە یەک ئەگەن. گلگامێش هەواڵی جیهانی ژێرو و، چارەنوسی کەسانی جیاوازی لێ ئەپرسێ، ئەنکیدو وەڵامی پرسیارەکانی ئەداتەوە.

## لاوژەی
## گلگامێش و ئەنکیدو و، جیهانی ژێرو

1 - 26: لەو ڕۆژانەدا، لەو ڕۆژە دورانەدا،
لەو شەوانەدا، لەو شەوە دورانەدا،
لەو ساڵانەدا، لەو ساڵە دورانەدا
لە ڕۆژانی کۆن دا، کە شتانی پێویست هێنرانە بونی ئاشکرا،
لە ڕۆژانی کۆن دا، کە بۆ یەکەمین جار شتانی پێویست مشوری خورا،
کاتێ بۆ یەکەمین جار لە بەر دەرگای وڵات دا نان تام کرا
کاتێ تەنور لە وڵات دا دروست کرا و خرایە کار
کاتێ ئاسمان لە ئەرز جیا کرایەوە
کاتێ ئەرز لە ئاسمان جیا کرایەوە
کاتێ مرۆڤ ناو نرا
کاتێ ئان ئاسمانی بۆ خۆی وەرگرت
کاتێ ئینلیل ئەرزی بۆ خۆی وەرگرت

کاتێ جیهانی ژێرو بە خەڵات درایە ئیریشکیگال و،
کاتێ ئەو بایەوانی بەلەمەکەی کردەوە، کاتێ بایەوانەکەی کردەوە
کاتێ باوک بەرەو جیهانی ژێرو بایەوانەکەی کردەوە
کاتێ ئینکی بەرەو جیهانی ژێرو بایەوانەکەی کردەوە
دژی شا، گەردەلولی گلێرە هەڵی کرد،
دژی ئینکی، گەردەلولی تەرزە هەڵی کرد
بچوکەکانیان وەکو چەکوشی سوک بون و
زلەکانیان وەکو خڕەبەردەکانی مەنجەنیق (کاتاپولتس) بون
بەلەمە بچوکەکەی ئینکی ئەلەرزی وەکو گەلە کیسەڵ خۆیانی پێدا بماڵن
شەپۆلەکان لە نێرگەی بەلەمەکەیان ئەدا بۆ ئەوەی وەکو گورگ شا هەڵ بلوشن و
شەپۆلەکان لە قەپۆزی بەلەمەکەیان ئەدا بۆ ئەوەی وەکو شێر ئینکی بشکێنن

27 – 35: لەو سەردەمەدا درەختێکی تەنیا هەبو
تەنیا درەختی هالبو، درەختێ بە تەنیا، لە کەناری فوراتی پاک دا روا، بە ئاوی فورات ئاو ئەدرا
تەوژمی زەلانی خوارو لە رەگی دەرهێنا
لقەکانی شکاند،
فورات بردی هەڵی گرت بۆ دور
ئافرەتێ، بۆ رێزنان لە قسەی ئان لەو ناوەدا ئەسوڕایەوە
ئافرەتێ، بۆ رێزنان لە قسەی ئینلیل لەو ناوەدا پیاسەی ئەکرد،
درەختەکەی گرتەوە و بردی بۆ ئونوگ،
بۆ ناو باخە رازاوەکەی ئینانا

36 – 46: ئافرەتەکە درەختەکەی بە قاچ نەک بە دەست روان،
ئافرەتەکە بە قاچ نەک بە دەست ئاوی دا
وتی: "کەی ئەمە بێ بە کورسیەکی قەشەنگ کە بتوانم لە سەری دابنیشم؟
وتی:"کەی ئەمە بێ بە تەختێکی قەشەنگ کە بتوانم لە سەری رابکشێم؟
پێنج ساڵ، دە ساڵ تێپەری، درەختەکە گەورە بو، بەڵام لقوپۆپی دەرنەکرد
لە سەر رەگەکەی مارێکی بێ ئامان کولانەی کرد بو
لە سەر چڵەپۆپەکەشی مەلی ئانزود بەچکەکانی دانا بو
لە ناوقەدەکەشی دا ماخێوێک جێگەی خۆی تێدا ساز کرد بو
کچۆڵەیەک بو بە دڵێکی خۆشەوە پێ ئەکەنی،
لە کاتێک دا ئینانای پیرۆز ئەگریا

47 – 69: کاتێ شەبەقی دا، کاتێ ئاسۆ رۆشن بوەوە
کاتێ مەلە بچوکەکان، لە دەمەوبەیانی دا، کەوتنە جریواندن
کاتێ ئوتو خەوتنگاکەی جێ هێشت
خوشکەکەی ئینانای پیرۆز

بە پاڵەوانی لاو ئوتو ی وت:
"برام! لەو رۆژانەدا کاتێ کە چارەنوس دیاری کرا
کاتێ فەڕ ئەرزی تێراو کرد
کاتێ ئان ئاسمانی بۆ خۆی وەرگرت
کاتێ ئینلیل ئەرزی بۆ خۆی وەرگرت
کاتێ ئیریشکیگال جیهانی خواروی بە خەڵات درایە و
کاتێ ئەو بایەوانی بەلەمەکەی کردەوە، کاتێ بایەوانەکەی کردەوە
کاتێ باوک بەرەو جیهانی ژێرو بایەوانەکەی کردەوە
کاتێ ئینکی بەرەو جیهانی ژێرو بایەوانەکەی کردەوە
دژی شا، گەردەلولی گلێرە هەڵی کرد،

دژی ئینکی، گەردەلولی تەرزە هەڵی کرد.
بچوکەکانیان وەکو چەکوشی سوک بون و
زلەکانیان وەکو خرەبەردەکانی مەنجەنیق (کاتاپولتس) بون
بەلەمە بچوکەکەی ئینکی ئەلەرزی وەکو گەلە کیسەڵ خۆیانی پێدا بماڵن
شەپۆلەکان لە نێرگەی بەلەمەکەیان ئەدا بۆ ئەوەی وەکو گورگ شا هەڵ بلوشن و
شەپۆلەکان لە قەپۆزی بەلەمەکەیان ئەدا وەکو شێر پەلاماری ئینکی یان ئەدا

70 – 78: لەو سەردەمەدا، درەختێکی تەنیا هەبو
تەنیا درەختی هالبو، درەختێ بە تەنیا
لە کەناری فوراتی پاک دا روا
بە ئاوی فورات ئاو ئەدرا
تەوژمی زەلانی خوارو لە رەگی دەرهێنا
لقەکانی شکاند،
فورات بردی هەڵی گرت بۆ دور
من ئافرەتێ، کە بۆ رێزنان لە قسەی ئان لەو ناوەدا ئەسورامەوە
من ئافرەتێ، کە بۆ رێزنان لە قسەی ئینلیل لەو ناوەدا پیاسەم ئەکرد،
درەختەکەم گرتەوە و هێنام بۆ ئونوک،
بۆ ناو باخە رازاوەکەی ئینانای پیرۆز

70 – 90: من، ئافرەتێ، درەختەکەم روان بە قاچم نەک بە دەستم
من، ئینانا ئاوم دا، قاچم بە کار هێنا نەک دەستم
ئەو وتی: "کەی ئەمە ببێ بە کورسیەکی قەشەنگ کە بتوانم لە سەری دابنیشم؟
ئەو وتی:"کەی ئەمە ببێ بە تەختێکی قەشەنگ کە بتوانم لە سەری رابکشێم؟
پێنج ساڵ، دە ساڵ تێپەری، درەختەکە گەورە بو، بەڵام لقوپۆپی دەرنەکرد
لە سەر رەگەکەی مارێکی بێ ئامان کولانەی کرد بو
لە سەر چڵەپۆپەکەشی مەلی ئانزود بەچکەکانی دانا بو
لە ناوقەدەکەشی دا ماخێوێک جێگەی خۆی تێدا ساز کرد بو
کچۆڵەیەک بو بە دڵێکی خۆشەوە پێ ئەکەنی،
لە کاتێک دا ئینانای پیرۆز ئەگریا!"

براکەی، پاڵەوانی لاو ئوتو، لەم کێشەیەدا لایەنی نەگرت

91 – 113: کاتێ شەبەقی دا، کاتێ ئاسۆ رۆشن بوەوە
کاتێ مەلە بچوکەکان، لە دەموبەیانی دا، کەوتنە جریواندن
کاتێ ئوتو خەوتنگاکەی جێ هێشت
خوشکەکەی، ئینانای پیرۆز،

بە پاڵەوان گلگامێش ی وت:
"برام! لەو رۆژانەدا کاتێ کە چارەنوس دیاری کرا
کاتێ فەڕ ئەرزی تێراو کرد
کاتێ ئان ئاسمانی بۆ خۆی وەرگرت
کاتێ ئینلیل ئەرزی بۆ خۆی وەرگرت
کاتێ ئیریشکیگال جیهانی خواروی بە خەڵات درایە و
کاتێ ئەو بایەوانی بەلەمەکەی کردەوە، کاتێ بایەوانەکەی کردەوە
کاتێ باوک بەرەو جیهانی ژێرو بایەوانەکەی کردەوە
کاتێ ئینکی بەرەو جیهانی ژێرو بایەوانەکەی کردەوە
دژی شا، گەردەلولی گلێرە هەڵی کرد،
دژی ئینکی، گەردەلولی تەرزە هەڵی کرد
بچوکەکانیان وەکو چەکوشی سوک بون و
زلەکانیان وەکو خڕەبەردەکانی مەنجەنیق (کاتاپولتس) بون
بەلەمە بچوکەکەی ئینکی ئەلەرزی وەکو پۆلە کیسەڵ خۆیانی پیا بکێشن
شەپۆلەکان لە نیرگەی بەلەمەکەیان ئەدا بۆ ئەوەی وەکو گورگ شا هەڵ بلوشن و
شەپۆلەکان لە قەپۆزی بەلەمەکەیان ئەدا وەکو شێر پەلاماری ئینکی یان ئەدا

114 – 122: لەو سەردەمەدا درەختێکی تەنیا هەبو
تەنیا درەختی هالبو، درەختێ بە تەنیا
لە کەناری فوراتی پاک دا روا
بە ئاوی فورات ئاو ئەدرا
تەوژمی زەلانی خوارو لە رەگی دەرهێنا
لقەکانی شکاند،
فورات بردی هەڵی گرت بۆ دور
من ئافرەتێ، کە بۆ رێزنان لە قسەی ئان لەو ناوەدا ئەسوڕامەوە
من ئافرەتێ، کە بۆ رێزنان لە قسەی ئینلیل لەو ناوەدا پیاسەم ئەکرد،
درەختەکەم گرتەوە و هێنام بۆ ئونوگ،
بۆ ناو باخە رازاوەکەی ئینانای پیرۆز

123 – 135: ئافرەتەکە درەختەکەی بە قاچ نەک بە دەست روان،
ئافرەتەکە ئاوی دا بە قاچ نەک بە دەست
وتی: "کەی ئەمە ببێ بە کورسیەکی قەشەنگ کە بتوانم لە سەری دابنیشم؟
وتی:"کەی ئەمە ببێ بە تەختێکی قەشەنگ کە بتوانم لە سەری رابکشێم؟
پێنج ساڵ، دە ساڵ تێپەڕی، درەختەکە گەورە بو، بەڵام لقوپۆپی دەرنەکرد
لە سەر رەگەکەی مارێکی بێ ئامان کولانەی کرد بو
لە سەر چڵەپۆپەکەشی مەلی ئانزود بەچکەکانی دانا بو

له ناوقەدمەکەشی دا خێویک جێگەی خۆی تێدا ساز کرد بو
کچۆڵەیەک بو بە دڵێکی خۆشەوە پێ ئەکەنی،
لە کاتێک دا ئینانای پیرۆز ئەگریا
لەو کێشەیەدا کە خوشکەکەی بۆی باس کرد، براکەی، پاڵەوان گلگامێش، لایەنی گرت

136 – 150: پشتێنێکی پۆشی پەنجا مەن قورس و پەستەکەکەی پەنجا مەن بو، ئەتوت سی شیقلی هەڵگرتوە
دەستی دایە تەورە برۆنزیەکەی کە بۆ گەڕان بە کاری ئەهێنا
کە حەوت تالینت و حەوت مەن کێشی بو

مارە بێ ئامانەکەی کوشت کە لە سەر رەگەکەی ئەژیا
مەلی ئانزود کە لە سەر چڵەپۆپەکەی ئەژیا بەچکەکانی هەڵگرت و فڕی بۆ شاخەکان
خێوە کچەکە کە لە قەدمکەی دا ئەژیا هەڵات پەنای برد بۆ چۆڵەوانی
درەختەکەی لە رەگەوە هەڵکەند. سەرچڵەکەی قرتان
کوڕانی شارەکەی کە لە گەڵی چو بون لقوپۆپەکانیان هەڵپاچی
پێشکەشی کرد بە خوشکەکەی، بە ئینانای پیرۆز. بیکا بە کورسی
دایە بیکا بە تەخت بۆ خۆی

بۆ خۆیشی، لە رەگەکانی. ئیلاگ ی دروست کرد و، لە لقەکانیشی ئیکیدما

151 – 165: ئیلاگ ی لە مەیدانی پان دا ئەژەن، ئەی ئەویست هەرگیز لە ژەنینی بوەستێ،
لە مەیدانی پان دا ستایشی خۆی ئەکرد،، ئەی ئەویست هەرگیز لە ستایشی خۆی بوەستێ
بۆ ئەو (؟) کە مناڵی بێوەژنەکانی... "ئای ملم! ئۆف کڵۆکم!"
بۆ ئەوانەی دایکیان هەبو، دایک نانی بۆ کوڕەکەی ئەهێنا
بۆ ئەوانەی کە خوشکیان هەبو. خوشک ئاوی بۆ براکەی ئەهێنا
کە ئێوارە هات، شوێنی دانانی ئیلاگ ی نیشانە کرد، لەوێوە ئیلاگ مکەی خۆی هێنایە لای خۆی لە ماڵ دایدا
بەڵام بەیانی زو کە ئەو... شوێنەکەی نیشانە کرد بو،
لە سۆنگەی سکاڵای بێوەژن و دادوبێدادی کچە گەنجەکانەوە ئیلاگ مکەی و ئیکیدما کەی بەربونەوە ناو بنی جیهانی ژێرو
هەوڵی دا بە دەست، دەریان بهێنێتەوە، ئەیتوانی بیانگاتێ
هەوڵی دا بە قاچ، دەریان بهێنێتەوە، ئەیتوانی بیانگاتێ

166 – 175: لە زاری دەروازەی گانزەر دا، لە بەردەم جیهانی ژێرودا هەڵتوتا
گلگامێش کەوتە شینوزاری، بە کوڵ گریا:
"ئای ئیلاگ ی من، وای بۆ ئیکیدما ی من! ئای ئیلاگ مکەی من، من هێشتا لە خۆشیەکانی تێر ئەبوم، یاری پێ کردنی بۆ من هێشتا تەواو ئەبوە!

ئاخ ئەگەر ئیلاگ مەکەی من هەر لە ماڵی نارتاش چاوەڕوانی من بوایە، من لە گەڵ ژنی نارتاشەکە نا وەکو دایکی خۆم رەفتارم ئەکرد... ئەگەر هەر لەوێ چاوەڕوانی من بوایە، من لە گەڵ مناڵەکانی نارتاشەکە وەکو خوشکە بچوکەکەم رەفتارم ئەکرد... ئەگەر ئەو هەر لەوێ چاوەڕوانی من بوایە!
ئیلاگە کەی من کەوتۆتە خوارێ بۆ جیهانی ژێرو.. کێ بۆم ئەهێنێتەوە؟
ئیکیدما کەی من کەوتۆتە خوارێ بۆ گانزەر... کێ بۆم ئەهێنێتەوە؟"

176 – 183: ئەنکیدوی نۆکەری وەڵامی دایەوە:
"گەورەم! بۆچی ئەگریت؟ بۆچی خەم دڵی داگرتوی؟
ئەمڕۆ من ئیلاگ مەکەی تۆ لە جیهانی ژێرو ئەهێنمەوە، من ئیکیدما کەت لە گانزەر دوە بۆ ئەهێنمەوە"
گلگامێش بەرسڤی ئەنکیدوی دایەوە:
"ئەگەر ئەمڕۆ بچی دابەزی بۆ جیهانی ژێرو، با ئامۆژگاریت بکەم! ئەبێ ڕێنماییەکانم جێبەجێ بکەی.
با قسەت بۆ بکەم! گوێ لە وتەکانم بگرە:

184 – 198: نابێ جلوبەرگی خاوێن لە بەر بکەی: ئەگینا دەسبەجێ ئەتناسنەوە کە تۆ نامۆی
نابێ لەشی خۆت بە ڕۆنی خۆشبۆی شوشەکە بهەنوی: ئەگینا بە بۆنەکەی تێت ئەوروکێن
نابێ گۆپاڵ لە جیهانی ژێرودا بهاوێژی: ئەگینا ئەوانەی گۆپاڵەکەیان بەر ئەکەوێ تێت ئەئاڵێن
نابێ گۆچان بە دەستەوە بگری: ئەگینا تاپۆکان هەست ئەکەن تۆ سوکایەتییان پێ ئەکەی
نابێ پاپوچ لە پێ بکەی
نابێ لە جیهانی ژێرودا بنەڕێنی
نابێ ژنە خۆشەویستەکەت ماچ بکەی
نابێ لە ژنەکەت بدەی تەنانەت ئەگەر هەراسانیشی کردی
نابێ مناڵە خۆشەویستەکانت ماچ بکەی
نابێ لە کوڕەکەت بدەی تەنانەت ئەگەر بێزاریشی کرد
دەنگەدەنگ بکەی لە جیهانی ژێرودا گل ئەدرێیتەوە

199 – 204: ئەو ژنەی کە لەوێ راکشاوە، ئەو ژنەی کە لەوێ راکشاوە
دایکی نینازو کە لەوێ هەڵئاژیاوە
شانی روتی بە جل دانەپۆشراوە، هیچ پۆشاکێ بە سەر سنگە روتەکەیەوە نیە
پەنجەکانی وەکو تەورداس وان و پرچی کە ئەڕنێتەوە ئەڵێی زەرون."

205 – 220: ئەنکیدو گوێی نەدایە وتەکانی گەورەکەی
جلوبەرگی خاوێنی پۆشی، ئەوان ناسییانەوە کە نامۆیە
لەشی بە ڕۆنی خۆشبۆ هەنو، بە بۆنەکەی لە دەوری وروکان
گۆچانی نیشانەی لە جیهانی ژێرودا وەشان، ئەوانەی گۆچانەکەیان بەرکەوت تێی ئاڵان
گۆچانەکەی بە دەستەوە گرت
تاپۆی مردوەکان هەستیان کرد سوکایەتییان پێ کراوە

پاپوچی کردە پێ،
بوە هۆی دەنگە دەنگ لە جیهانی ژێروودا
ژنە خۆشەویستەکەی ماچ کرد و لەو ژنەیشی دا کە هەراسانی کرد بو
فرزەندە خۆشەویستەکەی ماچ کرد و، لەو کوڕەیشی دا کە لێی بێزار بو
نەڕەیەکی گەورەی کرد،
ئیتر لە جیهانی ژێروودا گل درایەوە

221 – 229: پاڵەوان گلگامێش، کوڕی نینسومون،
بە تەنیا رێگەی ئیکوری گرت، بۆ پەرستگای ئینلیل
لە بەردەم ئینلیل دا گریا:
"بابە ئینلیل! ئیلاک مەکەم کەوتە خوارێ بۆ جیهانی ژێرو،
ئیکیدما کەم کەوتە خوارێ بۆ ناو گانزەر،
ئەنکیدو دابەزی بیانهێنێتەوە بەڵام جیهانی ژێرو ئەوی گل داوەتەوە
ناماتار نەیگرتوە، ئاساگ نەیگرتوە، بەڵکو جیهانی ژێرو گرتویەتی
نوددوگ، دێوی نیرگال، کە بەزەیی بە کەس دا نایەتەوە، نەیگرتوە، بەڵکو جیهانی ژێرو گرتویەتی
ئەو لە مەیدانی شەڕێکی پیاوانەدا نەگلاوە، بەڵکو جیهانی ژێرو گرتویەتی."

باوە ئینلیل لەم کێشەیەدا لایەنی نەگرت، لە بەر ئەوە چو بۆ ئەریدوگ

237 – 230: لە ئەریدوگ بە تەنیا رێگەی گرت، بۆ پەرستگای ئینکی
لە بەردەم ئینکی دا گریا:
"بابە ئینکی! ئیلاک مەکەم کەوتە خوارێ بۆ جیهانی ژێرو،
ئیکیدما کەم کەوتە خوارێ بۆ ناو گانزەر،
ئەنکیدو دابەزی بیانهێنێتەوە بەڵام جیهانی ژێرو گرتویەتی
ناماتار نەیگرتوە، ئاساگ نەیگرتوە، بەڵکو جیهانی ژێرو گرتویەتی
نوددوگ، دێوی نیرگال، کە بەزەیی بە کەس دا نایەتەوە، نەیگرتوە، بەڵکو جیهانی ژێرو گرتویەتی
ئەو لە مەیدانی شەڕێکی پیاوانەدا نەگلاوە، بەڵکو جیهانی ژێرو گرتویەتی."

باوە ئینکی لەم کێشەیەدا لایەنی گرت،

238 – 242: بە پاڵەوانی لاو ئوتو ی، کوڕی نینگال ی وت:
"دەسبەجێ دەلاقەیەک لە جیهانی ژێرو دا بکەرەوە، ئینجا
نۆکەرەکەی ئەو لە جیهانی ژێرو بهێنەرەوە"

ئەو دەلاقەیەکی کردە جیهانی ژێرو
نۆکەرەکەی بە ئاسانی لە جیهانی ژێرو دەرهێنا

243 – 253: داوەشیان کرد بە یەکتردا و یەکترییان ماچ کرد
بە پرسیار دای گرتەوە:
"ڕێکخستنی جیهانی ژێروت بینی؟
هاوڕێ! ئەگەر تۆ بۆم باس بکەیت، ئەگەر بۆم بگێڕیتەوە"

"ئەگەر باسی ڕێکخستنی جیهانی ژێروت بۆ بگێڕمەوە، ئەبێ دابنیشی و بگریت!"
"من دائەنیشم و ئەگریم"
..... کە دڵت حەز بکا بیگرێ..
(من کرم تێی داوم؟) .... وەکو ئەسپێ بداتە پەلاسە کۆن
دەلاقەیەک، پڕ بێ لە تۆز
وتی "ئۆف" و لە ناو تۆزەکەدا دانیشت

254 – 267: "ئەوەت بینی کە یەک کوڕی هەیە؟"
"بەڵێ بینیم!"
"ئەحواڵی چۆنە؟"
لە سەر ئەو کۆتەرەیەی کە لە بن دیوارەکەدایە بە کوڵ ئەگری"

"ئەوەت بینی کە دو کوڕی هەیە؟"
"بەڵێ بینیم"
"ئەحواڵی چۆنە؟"
"لە سەر چەند خشتێ دانیشتوە نان ئەخوا"

"ئەوەت بینی کە سێ کوڕی هەیە؟"
"بەڵێ بینیم"
"ئەحواڵی چۆنە؟"
"ئاو لە کوندەی سەر هەرزاڵە ئەخواتەوە"

"ئەوەت بینی کە چوار کوڕی هەیە؟"
"بەڵێ بینیم"
"ئەحواڵی چۆنە؟"
"دڵی خۆشە وەکو پیاوێ چوار وڵاخی نێر لە ملی هەبێ"

"ئەوەت بینی کە پێنج کوڕی هەیە؟"
"بەڵێ بینیم"
"ئەحواڵی چۆنە؟"
"وەکو میرزایەکی ماندونەبو بە ئاسانی هاتوچۆی کۆشک ئەکا"

"ئەوەت بینی کە شەش کوڕی هەیە؟"
"بەڵێ بینیم"
"ئەحواڵی چۆنە؟"
"شادمانە وەکو زەویەکەی کێڵرا بێ"

"ئەوەت بینی کە حەوت کوڕی هەیە؟"
"بەڵێ بینیم"
"ئەحواڵی چۆنە؟"
"وەکو هاوڕەمی خواکان، لە سەر تەخت دانیشتوە، گوێ لە بڕیارەکان ئەگرێ"

268 – 285: "خەساوی ناو کۆشکت بینی؟"
"بەڵێ بینیم"
"ئەحواڵی چۆنە؟"
"وەکو داری ئالالا ی بێ کەڵک لە قوژبنێک دا هەڵپەسێردراوە"

"ئەو ژنەت بینی کە هەرگیز نەزاوە ؟"
"بەڵێ بینیم"
"ئەحواڵی چۆنە؟"
"وەکو... ئینجانە، بە توندی فڕێ دراوەتە لاوە، خۆشیی بە هیچ پیاوێ نابەخشێ"

"ئەو گەنجەت بینی کە هەرگیز ژنەکەی ڕوت نەکردۆتەوە؟"
"بەڵێ بینیم"
"ئەحواڵی چۆنە؟"
"تۆ گوریسەکە تەواو ئەکەی، ئەو هێشتا لە سەر گوریسەکە ئەگری"

"ئەو ژنەت بینی کە هەرگیز مێردەکەی ڕوت نەکردۆتەوە ؟"
"بەڵێ بینیم"
"ئەحواڵی چۆنە؟"
"تۆ چنینی چیغەکە تەواو ئەکەی، ئەو هێشتا بە سەر چیغەکەدا ئەگری"

"ئەوەت بینی کە جێگری نیە؟"
"بەڵێ بینیم"
"ئەحواڵی چۆنە؟"
وەکو ئەو .... خشت ؟ نان ئەخوا.......
......

286 – 303: "بینیت...؟

"خواردنەکەی بە جیا دائەنێن، ئاوەکەی بە جیا دائەنێن. ئەو خواردنە ئەخوا کە بۆ ئەوی دائەنێن، ئەو ئاوە ئەخواتەوە کە بۆ ئەوی دائەنێن"

.....

"کابرای گولت بینی؟"

.....

"هەڵبەز و دابەز ئەکا وەکو گایەک کرم تێی دابێ"

"ئەوەت بینی لە ئەبەردا گلاوە"
"بەڵێ بینیم"
"ئەحواڵی چۆنە؟"
"باوک و دایکی لەوێ نەبون کەللەسەری هەڵبگرن. ژنەکەی ئەگری"

"گیانی ئەوەت بینی کە پرسەی بۆ نەگێراوە؟"
"بەڵێ بینیم"
"ئەحواڵی چۆنە؟"
"بەرماوەی ئێسک و نان و ... ئەو شتانە ئەخوا لە کۆڵان فڕێ ئەدرێن"

"ئەوەت بینی کەشتیەوان لێی دا..."
"ئەحواڵی چۆنە؟"
"ئاخ، دایە! پیاوەکە گریا بۆ ژنەکە، کە کەشتیەکەی راکێشایە دەرەوە"
.......

"منالە بچوکەکانی منت بینی کە هەرگیز لە دایک نەبون؟"
"بەڵێ بینیم"
"ئەحواڵیان چۆنە؟"
"لە سەر تەختێکی ئاڵتون و زیو، پڕ لە هەنگوین و کەرە، گەمە ئەکەن"

"ئەوەت بینی کە مرد..؟"
"بەڵێ بینیم"
"ئەحواڵی چۆنە؟"
"لە سەر تەختی خواکان راکشاوە"

"ئەوەت دی لە سەر ئاگر دانرا بو؟"
ئەوەم نەبینی. گیانی لەوێ نەبو. دوکەڵەکەی بە ئاسمان دا چو."

# تێوەردان

یەکەم:
ئەم لاوژەیە: "گلگامێش و ئەنکیدو و، جیهانی ژێرو"، خشتی دوانزەهەمی لاوژەی گلگامێشە، بەڵام لە بەر ئەوەی، بە پێی لێکۆڵینەوەی هەندێ لە شوێنەوارناسەکان، روداوەکانی پەیوەندییان بە روداوەکانی لاوژەی گلگامێشەوە نیە، بە جیا لەوان، وەکو لاوژەیەکی سەربەخۆ، دانراوە.

دوەم:
بەشێ لە ئەفسانە و چیرۆک و داستان و گێڕانەوەکانی سومەری، بابلی، ئاکەدی، ئاشوری بە جۆری دروستبونی گەردون دەس پێ ئەکا و، لەوێوە ئەچێتە سەر گێڕانەوەی ئەسڵی داستانەکە. لاوژەی "گلگامێش و ئەنکیدو و، جیهانی ژێرو" ش بە هەمان شێوە دەستی پێ کردوە.

سێیەم:
جیهانی ژێرو، بە پێی تێگەیشتنی سومەری، جیهانی دوای مردن بوە، جیهانێ بوە چونی هەبوە گەڕانەوەی نەبوە. هەر بۆیە پێیان وتوە: "ئەرزی نەگەڕانەوە".

چوارەم:
چەند بەشێکی پرسیارەکانی گلگامێش و وەڵامەکانی ئەنکیدو، لە کۆتایی لاوژەکەدا، بە هۆی شکان و سوانەوە فەوتاون و ئەخوێنراونەتەوە لە بەر ئەوە هەمو گفتوگۆکەیان بە تەواوی ساغ نەکراوەتە. دێڕە فەوتاوەکان بە ریزی نوقتە ئاماژەیان بۆ کراوە.

پێنجەم:
چەند رونوسی لاوژەکە لە چەند جێگای جیاواز دۆزراوەتەوە و، پارچەکانی لە چەند شوێنی جیاوازە و، زاناکانی شوێنەوارناسی بە جۆری جیاواز خوێندویانەتەوە. بۆ نمونە: لەم رێنوسەدا ناوی ئامرازە موسیقیەکان بە "ئیلاگ" و "ئیکیدما" خوێنراونەتەوە کەچی لە رونوسی تردا بە "پوکو" و "میکو" خوێنراونەتەوە و، هەندێکیان ئەم دو ئامرازەیان بە تەپڵ و داری تەپڵ لێدان داناوە و هەندێکی تر بە دەزگایەکی نەزانراو.

# وشەی نائاشنا

ئینجانە: دەفرێکە لە قوڕ دروست ئەکرێ، لە گۆزە بچوکترە، دەمەکەی پەلە. لە ئاگردا سور ئەکرێتەوە. لە ناو ماڵ دا دائەنرێ گوڵی جوانیی تێدا بروێنرێ.

بایەوان: چارۆکەیەکی ئەستوری پان و گەورە بوە لە ناو کەشتی یا بەلەم دا بە ئەستونێکی بەرزدا هەڵواسراوە. کەشتیەوان بە هێزی با بەو بایەوانە کەشتی یا بەلەمەکەی لێ خوڕیوە.

پاپوچ: جۆرێکە لە پێڵاو.تایەر بەگی جاف ئەڵێ:

"ڕو برۆ قاسید بڵێ دەردی دڵم      ئازی پاپوچت ئەکێشم من بە تۆز و گەردەوە."

پەلاس: جلی کۆن و شڕ و پیس.

تاپۆ: تارمایی گیانی مردو.

تەورداس: ئامرازێکە لە ئاسن دروست ئەکرێ، دەمەکەی کەوانەیی تیژە، سەردەمی زو بۆ شەڕ و بۆ هەڵپاچینی لقوپۆپی دار بە کار هێنراوە.

زەلان: رەشەبای بەهێز.

زەرو: کرمێکی بچوکە لە ناو قوڕ و لیتەی کانیاوادا ئەژی کە بە پێستی مرۆڤ دا ئەنوسێ چەند جار لە ئەندازەی گەورەیی خۆی زیاتر خوێن ئەمژێ.

گلێرە: تەرزە.

قەپۆز: چەناگەی دەربەرپیوی مرۆڤ و چوارپێ.

نیر: تەوقێکە کراوەتە ملی گا بۆ ئەوەی لە گەڵ گایەکی تردا پێکەوە ببەسترێنەوە و هاوشانی یەکتری جوت یا گێرەیان پێ بکرێ.

نیرگە: دارێکی ئەستوری درێژە رانەهێلرێ بۆ ئەوەی دارەڕای لە سەر بکرێ.

## سەرچاوە

لە بەر تێکستی ئینگلیزی وەرگێراوە و لە گەڵ تێکستی عەرەبی بەراورد کراوە.

بۆ تێکستی ئینگلیزی بڕوانە: (The Electronic Text Corpus of Sumerian Literature- Oxford University).

بۆ بەشێ لە تیکستی عەرەبی بڕوانە: (صاموئیل نوح کریمر، السومریون: تاریخهم وحضارتهم وخصائصهم، ترجمة الدکتور فیصل الوائلي، الناشر وکالة المطبوعات، الکویت) (ص 280 – 291)

هەروەها بۆ کورتەی ئەم لاوژەیە بڕوانە:

طه باقر: ملحمة کلکامش، الناشر دار الوراق، لندن، (ص 199 – 205)

فاضل عبدالواحد حق: سومر: اسطورة و ملحمة، 1977 بغداد، (ص 162 - 166)

# بالۆرەی
# سەرکەوتنی سەرجۆن

منم، سەرجۆن، شای بەهێزی ئاگادە،
دایکم ژنێکی سادە بوە، باوکم ناناسم.
براکانی باوکم لە شاخەکان ژیاون
شارەکەم ئازوپیرانویە، کە لە سەر کەناری فوراتە.
دایکە سادەکەم بە من ئاوس بوە، بە نهێنی منی بوە،
لە تلیان دا شاردمیەوە سەری گرت و بە قیر سواخی دا،
هاویشتمیە ناو ئاو، ئاوەکە نوقمی نەکردم.
ئاوەکە هەڵی گرتم بۆ لای ئاودێر ئاکی.
ئاکی، ئاودێر، بە دڵێکی پاکەوە لە ئاوەکە دەری هێنام.
ئاکی، ئاودێر، وەکو کوڕی خۆی بە خێوی کردم.
ئاکی، ئاودێر، لە لای خۆی کردمی بە باخەوان.
کاتێ باخەوانیم ئەکرد ماخوا ئیشتار حەزی لێ کردم،
بە درێژایی (چل و) چوار ساڵ پاشایەتیم کرد
من فەرمانڕەوایی خەڵکە سەررەشەکەم کرد
چیا سەختەکانم بە تەوری برۆنزین روخاند
سەرکەوتمە سەر شاخە نزمەکان
کێوە نەویەکانم بڕی
وڵاتی دەریام سێ جار گەمارۆ دا
دیلمون م گرت
چوم بۆ دور-یلوی گەورە... من

قوربانیم کرد
هەر شایەک لە دوای من بێ
.....
با فەرمانڕەوایی بکا، با حوکمی سەرڕەشەکان بکا،
با شاخە سەختەکان بە تەوری برۆنزین بڕوخێنێ
با سەر بکەوێتە سەر چیا نزمەکان
با کێوە نەویەکان ببڕێ
با سێ جار وڵاتی دەریا گەمارۆ بدا
با دیلمون بگرێ
با بچێ بۆ دور-ئیلوی گەورە
............
...بەشەکەی تری بالۆرەکە فەوتاوە"

بۆ تێکستی ئینگلیزی، بڕوانە:
(The Electronic Text Corpus of Sumerian Literature).
بۆ تێکستی عەرەبی، بڕوانە:
الدکتور فاضل عبدالواحد علي، سومر اسطورة وملحمة، ل 244 – 245.
بۆ بەشێکی تێکستەکە: باقر، ل 79.

# بالۆرەی
# سەرکەوتنی نارام سین

## چکاوەی بابەت

نارام سین ئەوەی سەرجۆنی ئاکەدی کەوتۆتە بەر هێرشی گەورەی خێڵ و هۆزە چیاییەکان. لە شاخەکانەوە هێزێکی بە ژمارە زۆر، بە سەرکردایەتی ئانوبانینی و حەوت کورەکەی، کە بە چرۆچاو لە قەلەڕەش و، بە لە ش لە باڵدار چون، درندە و شەڕانی بون، بەرەو خوار شۆڕ بونەتەوە. هەر هێزێ چو بێتە سەر ڕێییان، بەرهەڵستییان بکا، شکاندویانە. وڵاتەکانی ئەنەدۆڵ، سوبارتو (وڵاتی ئاشور)، وڵاتی گوتیەکان (کوردستانی خوارو)، ئیلام (خوزستان) تا ئەگەنە خەلیج، داگیر و تاڵان و کاول ئەکەن.

نارام سین، پرسی بە خواکان کردوە، قوربانی پێشکەش کردون، لە نوقڵانەبێژەکانی پرسیوە، هەواڵی دڵخۆشکەریان پێ نەداوە. سێ ساڵ لە سەر یەک هێزی گەورەی ناردۆتە سەریان بەڵام هەمو جار تەفروتونا بون. سەرەڕای ئەوەش نەخۆشی کوشندەی تاعون و زەحیری... بڵاو بۆتەوە، کەمبونەوەی بەروبوم و قاتوقڕی و برسێتی وڵاتەکەی داگرتون.

نارام سین، یەکێ لە سەرکردەکانی راسپاردوە هێزی جەنگاوەرانی دوژمن تاقی بکاتەوە بزانێ، ئەمانەی کەوا لە شکان نایەن، هۆی چیە، مرۆڤن یان بەچکەی شەیتانن؟ سەرکردەکەی چەکەکانی لە بریندارکردنی هەندێک لە دیلەکان دا تاقی کردۆتەوە، بینیوێتی ئەوانیش وەکو ئەمان خوێن لە برینەکانیان ئەچۆڕێ، ئەوسا دڵنیا بون کە ئەوانیش مرۆڤن.

نارام سین لە ساڵی چوارەم دا، هێرشی پێچەوانەی کردۆتە سەریان ئەمجارە دوژمنە چیاییەکانی شکاندوە و، هەندێکی لێ بە دیل گرتون. دیلەکان بۆ ئەوەی بین بە پەندی زەمانە ئەهێڵێتەوە و نایانکوژێ.

نارام سین و راوێژکارەکانی، لە ئەنجامی هێرش و بەرگری و شەڕەکان دا، گەیشتونەتە ئەو باوەڕەی بۆ ئەوەی بتوانرێ بە دڵنیایی و بە ئاسودەیی ژیان بە سەر ببرێ، چاکتر وایە شار بە شورەی بەرز بپارێزرێ و، بە خەندەقی ئاو دەوری بگیرێ.

## دەقی باڵۆرەکە:

(تۆ ئەوەی کە دێی) ئەمەت بۆ ئەخوێنمەوە کە لەم کێڵەدایە
(من نارامس) کە دوای کوڕی سەرجۆن هاتوە
(ئەمەم نوسی و بە جێم هێشت) بۆ سەردەمی داهاتو

ئینمیرکار، شای ئێرین، کە بە یەکجاری دیار نەما
ئینمیرکار، شای ئوروک، کە تا هەتایە دیار نەماوە
ئەوەی ئەوسا شوانی وڵات بو
ئێستاش پاش رابوردنی سەد ساڵ
پاش ئەوەی سەد ساڵ تێپەڕیوە
ئیشتار بیری خۆی سەبارەت بە وڵات گۆڕیوە
ئومان ماندا دەرئەکەون و وڵات ئەگرن

ئەو کاتە ئینمیرکار لە گەورەخواکانی پرسی،
ئوقڵانەبێژەکانی بانگ کرد و فەرمانی پێ دان،
سەرو کاوڕی بۆ هەر یەکێ لە حەوت گەورەخواکان سەربڕی،
سفرەی خوانی پیرۆزی رازاندەوە،
ئوقڵانەبێژەکان لە گەڵی دوان:
بڕیارێ بدە لێی دڵنیا بی
خواکان ویستی خۆیانت پێ ئەڵێن

شا ئینمیرکار توشی بڕیاری سەخت بو
شاماش کە ژیریی و دانایی دابویە
سزای سێبەرەکەی و سێبەری ژێردەستەکانی و
سێبەری پێشینە و پێشینەی پێشینەکانی دا

شاماش (قارەمان) گەورەی سەرو و خوارو، گەورەی ئانوناکی
ئەوانەی ئاوی پیس ئەخۆنەوە و ئاوی پاک ناخۆنەوە
بەڵام ئینمیرکاریان بە بیر و بە چەکەکەی
بەستەوە. ئەو هێزەیان روخان
ئەو کێڵێکی نەنوسی و بە جێی نەهێشت .

30: لە جێیەک دا، کە من خۆم لە مەترسی رزگارم نەبو، دەسخۆشیم لێ کرد
وەکو باڵدار ئەجەنگان، زەلام بون بە روخساری قەلەڕەشەوە
تلمون شیری داونەتێ

پاش ئەوەی بیلی نیل بیچمەکەی دارشتون
لە باوەشی چیاکان دا پێگەیشتون
گەورە بون و لەوێ نیشتەجێ بون
حەوت برا بون و شا بون
جەماوەرەکەیان سێسەدوشەست هەزار کەس بو
باوکیان شا ئانوبانینی و،

دایکیان شاژن ناوی مالیلیە
لە ناو براکان دا گەورەکەیان سەردار مەناندایە، برای دوەمیان میدودویە، برای سێیەمیان کوکوپیشە، برای چوارەمیان تاردادایە، برای پێنجەمیان بالداهدایە، برای شەشەمیان ئاهودانیە، برای حەوتەمیان هارشاکیدویە
ئەو کاتەی لە چیاکان ئەسوڕانەوە
یەکێ لە سەرکردەکانم گرتنی (؟) کێشایان بە رانی خۆیان دا (؟)

لە پەلاماری یەکەمیان دا گەیشتنە بوروش هاندرا، سەرانسەری خاکی بوروش هاندرا تاڵان کرا
شاری بوهلو چەپاو کرا. ئینجا شاری .. بە تاراج برا.
... سنور بەزێنرا، بریار بو شوبا ئینلیل

دابەزینە ناو جەرگەی سوبارتو
دوای تاڵانکردنی گوتیوم چونە ئیلامەوە
دوای چەپاوکردنی ئیلام گەیشتنە بناری دنیا
لە رێگەکەیان دا توشی هەرکەس بون شکاندیان

گەیشتنە تلمون، شوێنی ملوخا و، هەر زەویەکی لە ناو دەریادا بو
حەفدە شا لە گەڵ نەوەد هەزار پیاو لە تیپەکانیان، دایانە پاڵیان و هاوکاری زۆریان کردن
سەرکردەکەم بانگ کرد و فەرمانم پێ دا:
"بەرامبەریان تیر بە کار بهێنە

تیریان تێ بگرە و کەللەسەریان بپێکە
ئەگەر خوێنیان لێ هات ئەوانیش وەکو ئێمە زەلامن
ئەگەر خوێنیان لێ نەڕژا ئەوا لە تۆخمی شەیتان و فریشتەی مەرگن
تاپۆن، شەیتانی بەدکارین، ئینلیل ئەفراندونی."
سەرکردەکە گەڕایەوە هەواڵی هێنا:

"تیرم تێ گرتن
سەرم ئەنگاوتن و خوێنیان لێ هات."
دوقڵانەبێژەکانم بانگ کرد فەرمانم پێ دان

سەرو کاوڕم بۆ هەریەکێ لە حەوت خواکە کوشتەوە
سفرەی پیرۆزم رازاندەوە
لە گەورەخواکان: ئیشتار، ئیلبابا، زامبابا، ئونو نیت، هانیش، شاماشی قارەمان و
فیتو م، پرسی، بۆ دەرچون لە فەوتان
بەڵام لە دڵی خۆم دا وتم

80: پرس بە کام شێر بکەم
کام گورگ ؟ دوقڵانەبێژ پرسی.
ئەمەوێ وەکو جەردە بڕۆم بۆ جێبەجێکردنی ویستەکانم
پشت بە خوا ؟ بمگێڕەرەوە بۆ خۆم
کاتێ گەیشتمە ساڵی یەکەم،

85: 120 سەدوبیست هەزار سەربازم داردە سەریان، کەسیان لێ نەگەڕایەوە
کاتێ گەیشتمە ساڵی دوەم، هەمان شت لە دەوەد هەزار جەنگاوەر قەوما
کاتێ گەیشتمە ساڵی سێیەم، هەمان شت لە شەست هەزار و حەوت سەد سەرباز قەوما
ئەوسا پەشۆکام و خەم دایگرتم، لە دڵی خۆم دا وتم:
"چی بۆ جێنشینەکانم بە جێ دەهێڵم؟
من شایەکم، ناتوانێ وڵاتەکەی رزگار بکا،
شوانێکە ناتوانێ گەلەکەی بپارێزێ
چی بکەم بۆ ئەوەی خۆم دەرباز بکەم لە،
ترسی پیاوان، مەرگی تاعون، زەحیری

95: ترسان، ونبون، قاتوقڕی،
برسێتی، خەوزڕان، هەمو نەخۆشیەکانی کە داکەوتون
هەروەها لە سەروی شار دا تۆفان هەڵساوە
لە خوارەوەش لە پێدەشتەکان دا تۆفانە
ئایا گەورەی ئاو بە گەورەخواکانی (براکانی) وت:

100: "ئەی گەورەخوایان! چیتان کرد؟
چونکە وەکو پێتان وتم، تۆفان هەستاوە
وەها..."
کاتێ ساڵی نوێ هات، ساڵی چوارەم
لە ئایا ی راوێژکاری خواگەورەکانەوە
قوربانیم پێشکەش کرد بە ساڵی تازەی پیرۆز
راوێژم کرد بە سروشی پیرۆز
دوقڵانەبێژم بانگ کرد فەرمانم پێ دا

سەرو کاورێم بۆ هەر یەکێ لە حەوت خواکە کرد بە قوربانی
سفرەی خوانی پیرۆزم رازاندەوە
لە گەورەخواکانم پرسی، نوقلانەبێژەکان پێیان وتم:
"تەورەکان خوێنیان لێ نەچۆڕێ!"

120: لە ناو ئەوانەدا دوانزە جەنگاوەریان هەڵاتن، لە دەس من دەرباز بون
بە خێرایی دویان کەوتم
توانیم ئەو جەنگاوەرانە بگرمەوە
جەنگاوەرەکانم بە گیراوی هێنایەوە
ئەوسا لە دڵی خۆم دا وتم:

125: بێ راوێژی پیر ناتوانم سزایان بدەم
لەو پێناوەدا کاورێکم سەربڕی
کۆڕی گەورەخواکان فەرمانیان پێ کردم رێگەیان بدەم
لە بنی ئاسمان دا لە لایەن ڤینۆسی پرشنگدارەوە ئاگادار کرام
تۆ نارامس، کوڕی سەرجۆن، رێنماییت ئەکەم

130: وازیان لێ بێنە، ئەم رەگەزە چەموشە لە ناو مەبە
ئینلیل لە دوارۆژدا خۆی ئەیان داتە بەر ئەفرین
ئینلیل پڕ بە دڵ رقی لێیانە
هەمو لە شارەکەی ئەوان دا ئەکوژرێن
ئەیان سوتێنین، لە بنکەکانیان دا تەنگیان پێ هەڵئەچنن
خوێنیان لە شارەکەدا ئەڕژێ
ئەرز بەروبومی کەم بۆتەوە، دارخورماش بەرەکەی

136: هەموان لە شاری ئەو جەنگاوەرانەدا مردن
دەستدرێژی تەنیوەتەوە لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر و، لە ماڵێکەوە بۆ ماڵێکی تر. لە باوکەوە بۆ کوڕ، لە براوە بۆ برا، لە پیاوێکەوە بۆ پیاوێکی تر و، لە دۆستێکەوە بۆ دۆستێک
کەس قسەیەکی باش ناکا
خەڵک فێری هیچ نابێ جگە لە قسە، هیچ بڵاو ناکەنەوە جگە لە گەوجی
ئەم شارە بوە بە دوژمنی خۆی
ئەم شارە شارێکی تر دەستی بە سەردا گرتوە
بە ئەختێ پارە کە کەمێ جۆ ئەبێ هیچیتر ناهێنێ
خۆزگە: شایەکی بەهێز لە وڵات دا هەڵئەکەوت
بە جێم هێشتون بۆ خوا گەورەکان ریشەکێشیان بکا
دەستم ئەخستۆتە سەریان چونکە هەڵاتون

تۆ میری فەرمانڕەوا بی یا هەر شتێکی تر
بە ڕەزامەندی خوا دانراوی ڕێبەریی شاهێتی بکەی
لە پێناوی تۆدا تەختەی عاجم دروست کرد، لە سەر ئەم کێڵەم نوسی
بۆ کوثی لە پەرستگای ئای میشلام
لە پەرستگای نیرگال دا بۆم بە جێهێشتی
ئەم کێڵە بدوێنە
کەواتە: نە پەشێوان و نە ترسان
هەرگیز مەترسە و مەلەرزێ
ئەگەر بتەوێ بناوانەکەت پتەو بێ و،
لە سەر سنگی ژنەکەت دڵخوازی بکەی
دڵنیا بە لە شورەکانت
خەندەقەکان پڕ بکە لە ئاو
دورجەکانت، دانەوێڵەکەت، پارەکانت، کەلوپەلەکانت
ببەرە ناو شارە قایمکراوەکە
چەکەکەت بپارێزە، بە شاردراوەیی هەڵی بگرە
وریابە، سەلامەتیت دەستەبەر بکە!
...
170: بەرپەرچی هێرشەکەیان بە دیاری و گۆڕینەوە بدەرەوە
لە بەردەم ئەوان دا سەرەڕۆیی مەکە
نوسەرەوە ئاگادارەکان کێڵە تایبەتیەکەت ئەنوسنەوە
تۆ کە سودت لە کێڵەکەم وەرگرتوە هەوڵ بدە رزگار بی
تۆ لە گەڵ من ڕوخۆش بی دوارۆژ یەکێکی تریش لە گەڵ تۆ ڕوخۆش ئەبێ.

## تێوەردان

نارام سین سەرکەوتنەکەی خۆی بە سەر لولوبیەکان دا لە سەر کێڵی بەرد ئەخشاندوە و، شاعیرەکانی ئەو سەردەمەش کردویانەتە بالۆرەیەکی ئەفسانەیی.
چکاوەی ئەم بالۆرەیە لە لایەن "طه باقر" ەوە لە ژێر سەرناوی "اسطورة نرام سین" دا لە لاپەڕەکانی (174 - 175) ی کتێبەکەی دا بڵاو کراوەتەوە. بڕوانە:
طه باقر، مقدمة في ادب العراق القديم، دار الوراق، بيروت، 2010.
دەقی ئەم بالۆرەیە لە لایەن شوێنەوارناسێکی عیراقی ترەوە، لە لایەن "د خەلیل سەعید" ەوە لە ژێر سەرناوی "نص نارامس" دا لە لاپەڕەکانی (238 - 245) ی کتێبەکەی دا بڵاوکراوەتەوە، بڕوانە:
"الدكتور خليل سعيد، معالم من حضارة وادي الرافدين، منشورات كلية الاداب والعلوم الانسانية بالدار البيضاء، 1984."

سەرچاوەی وەرگرتنی هەردوکیان بریتی بوە لە:
.Gurney,"Anatolian Studies, 5, 1955

پێ ئەچێ د. خەلیل سەعید لە گێڕانەوەکەی دا توشی هەندێ هەڵەی مێژویی بوبێ:
یەکەم،
لە سەرەتای بابەتەکەدا باسی ئەوەی کردوە کە ئەم بالۆرەیە لە سەر بەردە نیگارینەکەی دەربەندی گاور نوسراوە لە کاتێک دا ئەو بەردە تەنیا نیگاری لە سەرە و، هیچ نوسینێکی بە هیچ خەتێ لە سەر نەنوسراوە و، نیگارەکەش لە بەر ئەوەی لە سەر تاشەبەردێکی شاخەکە هەڵکەندراوە، بە ئاسانی قابیلی گواستنەوە نیە.
بۆیە ئەم نوسینە هیچ پەیوەندیەکی لە گەڵ دەربەندی گاوردا نیە.
دوەم،
طە باقر، کە شوێنەوارناسێکی شارەزای عیراقە و، چەند جارێ لە سەر مۆنۆمێنتەکەی دەربەندی گاوری نوسیوە، باسی هیچ نوسینێکی نەکردوە، بەڵکو ئەو کە بابەتەکەی خۆی لە هەمان سەرچاوە وەرگرتوە کە د. خەلیل وەری گرتوە. ئەڵێ: "هەندێ بەشی ئەم بالۆرەیە لە سواڵەتەکانی کتێبخانەکەی ئاشوربانیپال لە نەینەوا و هەندێکی تری لە سوڵتان تەپە لە تورکیا دۆزراوەتەوە."
سێیەم،
ئەم دەقەی ئێرە لە دەقە عەرەبیەکەی د. خەلیلەوە کراوە بە کوردی. بەڵام لە وەرگێڕانەکەی ئەودا هەڵەی چاپ و، شێرزەیی لە هەندێ لە ناوەکان و لە هەندێ لە دێڕەکانی دا هەیە، ئەوەش تا ئەندازەیەک هەندێ لە ناوەرۆکی بابەتەکەی شێواندوە. بۆ بەراورد و راستکردنەوە دەقێکی تر لە بەر دەس دا نەبو.

## وشەی نائاشنا

ئەفراندن: خوڵقاندن، دروستکردن.
ئەنگاوتن: پێکان، لە نیشانەدان.
تاراج: تاڵان، زەوتکردنی زۆرداریکی ماڵ و دارایی تایبەتی و گشتی. مەحوی ئەڵێ:
**"بە شۆخی دین و دڵمی دا بە تاراج ئیستە وەک سۆفی**
**بە سوبحەی ئەشکەوە هاتۆتە سەر تەرکی ئەزەر چاوم"**
چەپاو: تاڵان.
چەموش: گیاندارێ کە ئامادەی راهێنران و کەویکردن نەبێ. ئەشێ بە مرۆڤی بزێو و سەرکێش و سەرەڕۆش بوترێ.
سروش: هاتف، وحی.
سواڵەت: پارچەی گۆزە و گڵێنە و خشتی شکاو.
کاوڕ: بەرخی مەڕ کە ساڵی دوەمی تەمەنی دەس پێ ئەکا.
نوقڵانەبێژ: العراف، کەسێ پێشبینی قەومانی روداوێ بکا بە چاک یان بە خراپ.

# بالۆرەی سەرکەوتنی ئوتو خیگال

## ئوتو خیگال، هەژدیهاکانی گوتیوم – دوژمنەکانی خوا ئەشکێنێ

ئینلیل، شای گشت وڵاتان، دەسەڵاتی دا بە ئوتو خیگال، پیاوی مەزن، شای ئونوک، شای چوارقوڕنەی زەمین، ئەو شایەی کە فەرمانەکانی سەرپێچی لێ ناکرێ، بۆ سڕینەوەی ناوی گوتوم، ماری شاخەکان، کە دژی خواکان بەدکارییان کردوە. پاشایەتی سومەرییان گواستۆتەوە وڵاتی بێگانە، سومەریان پڕ کردوە لە دوژمنایەتی، هاوسەریان لە مێردەکەی دابڕیوە، منداڵیان لە دایک و باوکی دور خستۆتەوە، دوژمنایەتی و توندوتیژییان بڵاوکردۆتەوە.

ئەو (ئوتو خیگال) چو بۆ لای خانمەکەی، ئینانا، لێی پاڕایەوە. "خانمەکەم! شێری مەیدان، تۆ پەلاماری وڵاتی بێگانە ئەدەی، ئینلیل رای سپاردوم کە پاشایەتی بۆ سومەر بگەڕێنمەوە، ئەشێ تۆ کۆمەکم بکەی!"

هێزەکانی دوژمن لە هەمو جێیەک خۆیان ساز داوە. تیریگان، شای گوتیوم... ..بناوانی جۆگەکانی گرتۆتەوە. کەس لە شارەکەی دەرناچێ روبەڕوی ببێتەوە. هەردو بەری دیجلەی داگیر کردوە. لە باشور، لە سومەر، ئاوی لە کێڵگەکان بڕیوە، لە باکوریش ڕێگاکانی گرتوە. شەخەڵ لە شاڕێکانی مەڵبەندەکەدا رواوە.

بەڵام شا، کە لە لایەن ئینلیلەوە هێزی پێ بەخشراوە، لە لایەن دڵی ئیناناوە خۆشەویستی دراوەتێ... ئوتو خیگال، پیاوی مەزن، بۆ ئەوەی روبەڕوی ببێتەوە لە ئونوگ دەرپەڕی، لە پەرستگای ئیکور بارەگای دانا. قسەی بۆ هاووڵاتیانی شارەکەی کرد: "ئینلیل، گوتومی داوە بە من، خانمەکەیشم، ئینانا، یارمەتیدەر ئەبێ! دومو زید - ئاما ئەجومگال ئانا - رایگەیاند گلگامێش، کوڕی نین سین، هاوکار ئەبێ". هاووڵاتیانی ئونوگ و کولابا بەوە شادمان بون، هەمو پێکەوە دوای کەوتن. هێزە هەڵبژاردەکانی ریز کرد.

پاش ئەوەی لە پەرستگای ئیکور دەرچو، رۆژی چوارەم بارەگای لە ناگ سو لە سەر جۆگەی سورونگال دانا، رۆژی پێنجەم بارەگای لە دەروازەی ئیلی تابیو دانا. دور نین ئازو و دابی ئینلیل، کە جەنەراڵی نێردراوی تیریگان بون بۆ سەر سومەر، گرت و، کۆتوپێوەندی کردن. پاش دەرچون لە دەروازەی ئیلی تابیو، لە رۆژی شەشەم دا بارەگای لە کارکارا دانا. چو بۆ ئیکور و لێی پاڕایەوە: "ئەی ئیکور! ئینلیل چەکداری کردوم، ئەشێ

تۆش یارمەتیدەرم بی!" لە نیوەشەودا... کەوتە ڕێ بە سەر ئادابا دا ڕۆیشت بۆ لای ئوتو. لێی پاڕایەوە: "ئەی ئوتو! ئینلیل گوتومی داوە بە من. ئەشێ تۆش یارمەتیدەرم بی!"
تەڵەیەکی لە دواوە بۆ گوتیەکان نایەوە. ئوتو خیگال، پیاوی مەزن، جەنەراڵەکانی شکاندن.
تیریگان، شای گوتوم، بە تەنیا بە پێ هەڵات. وایزانی لە دابروم، کە بۆ دەربازکردنی گیانی خۆی ڕووی تێ کرد بو، ئەحەویتەوە. بەڵام هەرکە خەڵکی دابروم زانییان ئوتو خیگال شایەکە لە لایەن ئینلیلەوە دەسەڵاتی پێ دراوە، ئەیان هێشت تیریگان بڕوا. نێردراوی ئوتو خیگال لە دابروم تیریگانی لە گەڵ ژنەکەی و منداڵەکانی گرت. کۆتوپێوەندی کردن. لە بەردەم ئوتودا، ئوتو خیگال وای لێکرد بە سەر قاچی دا بکەوێ و پێی نایە سەر ملی. گوتیوم، ماری شاخەکانی وا لێ کرد. بڕۆنەوە قوڕاوی کونەکانیان بخۆنەوە... دەری کردن. پاشایەتی هێنایەوە بۆ سومەر.

# تێوەردان

بۆ دەقی ئینگلیزی بڕوانە:
The Electronic Text Corpus of Sumerian Literature- Oxford University
بۆ دەقی عەرەبی بڕوانە:
صموئيل نوح كرومر، السومريون، ترجمة الدكتور فيصل الوائلي، ص 468 - 470.
الدكتور فاضل عبدالواحد علي، اقدم حرب للتحرير عرفها التاريخ، مجلة سومر، الجزء الاول والثاني – المجلد الثلاثون، بغداد 1974. ص 47 – 57.
هەندێ جیاوازی لە تەرجومەکان دا هەیە.
ئەم وتارەی د. فاضل 10 لاپەڕەیە. باسی قارەمانێتی ئوتو خیگال ئەکا. ئەمە کارێکی ئاساییە، بەڵام گێڕانەوەی وەکو "یەکەمین جەنگی ڕزگاری لە مێژوودا" و، ئوتو خیگال وەکو "قارەمانی نەتەوەیی" زیاتر لەوەی توێژینەوەی زانستی بێ، خرۆشانی سۆزی نەتەوەپەرستیی عەرەبیە. د. فازیل، لە بەغداد کاری کردوە، لە سەردەمێک دا کە سەدام حسێن بڕیاری بۆ هەموو ئاکادیمیەکانی عیراق دەرکرد بو، سەرلەنوێ تاریخی عیراق، بە پێی ئایدیۆلۆجی و بەرژەوەندی حیزبی بەعس، بنوسنەوە. لە بەر ئەوە د. فازیل یش، بەم گیانە بابەتەکانی نوسیوە. د. فازیل، شوێنەوارناسێکی عیراقیە چەندین وتار و کتێبی لە سەر لاوژە و ئەفسانەکانی میزۆپۆتامیا نوسیوە، لەوانە:
الدكتور فاضل عبدالواحد علي-
عشتار ومأساة تموز، بغداد، 1986.
من الواح سومر الى التوراة، بغداد، 1989.
سومر، اسطورة وملحمة، بغداد، 1997.

# شەریعەتی حامورابی

شارستانیتی میزۆپۆتامیا چەند کۆمەڵە قانونی بەرهەم هێناوە کە لە مێژوی مرۆڤایەتی دا جێگەی تایبەتی‌یان هەیە، لەوانە قانونەکانی ئور نمو، لیبت ئیشتار، ئەشنونا، حامورابی. هەندێ بەشی ئەو کۆمەڵە قانونانە بە ناتەواوی و پچڕ پچڕی دۆزراونەتەوە، ئەو کۆمەڵە قانونەی تا رادەیەکی باش بە رێکوپێکی و بە هەندێ ناتەواویەوە دۆزراوەتەوە "کۆمەڵە قانونەکانی حامورابی"ە.

حامورابی (1792 - 1750 پ. ز.) شەشەمین پاشای زنجیرەی بابلی بوە. لە زنجیرەیەک شەڕدا توانی "دەوڵەت – شار" ە کانی میزۆپۆتامیا بهێنێتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی و لە "دەوڵەت – وڵات" ی بابلی دا یەکیان بخات. لە سێهەمساڵی فەرمانڕەوایی خۆی دا کۆمەڵێ قانونی داڕشت و، لە سەر کێلێکی دیار نەخشاندی و بە خەڵکی ڕاگەیاند.

کێلەکە بەردە، بە شێوەیەکی لولەیی داتاشراوە، گێپەڕەکەی 60 سمە بەرزاییەکەی 225 سمە نوسینەکەی لە 44 خانەدا جێگەی کراوەتەوە و، سەرجەم مادەکانی قانونەکە بە 300 مادە خەمڵێنراوە، هەرچەندە هەندێکی ڕوشێنراوە یا کرێنراوە، بەڵام هێشتا 282 مادەی ماوە.

لە بەشی سەرەوەی کێلەکەدا پەیکەری شاماش، خوای رۆژ، بە دانیشتویی لە سەر تەخت هەڵکەنراوە و، بە دەستی ڕاستی قانونەکانی بە حامورابی ئەسپێرێ و حامورابیش لە بەردەمی دا بە گوێڕایەڵی ڕاوەستاوە قانونەکانی لێ وەرئەگرێ.

ئەم کۆمەڵە قانونە، بە زمانی بابلی، بە خەتی مێخی، بە هەڵکۆڵین لە سەر کێلی بەردی رەشی بازلت نوسراوە و، لە ناوجەرگەی شاری بابل دا چەقێنراوە، بۆ ئەوەی هەمو کەس بتوانێ ببینێ و بیخوێنێتەوە و، ماف و ئەرکەکانی خۆی بزانێ.

ئیلامیەکان لە سەردەمی شا "شتروک ناخونتی" دا هێرشیان کردۆتە سەر بابل (1171 پ. ز.) یەکێ لەو شتانەی لەم هێرشەدا بە تاڵان بردویانەتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆیان، ئەم کێلە بوە. هەندێ مادەیان لێ کوژاندۆتەوە، بەڵام دەسکاری ئەوی تریان نەکردوە، رەنگە لە ترسی ئەو نەفرین و توکە بێ کە لە کۆتایی قانونەکەدا نوسراوە.

کێلەکە ساڵانی (1901- 1902) لە لایەن تیمێکی فەرەنسییەوە لە شوش لە ئێران دۆزراوەتەوە، هەر ئەوسا براوە بۆ فەرەنسا. ئێستا کێلەکە لە مۆزەخانەی لوڤەر لە پاریس دانراوە، کۆپییەکی بە گەچ دروستکراوی لە مۆزەخانەی بەغدادە.

"شەریعەتی حامورابی" بۆ دەیان زمانی ناسراوی جیهان تەرجومە کراوە. لەوانە بۆ زمانی عەرەبی. ناسراوترینیان ئەمانەن:

عبدالمسيح وزير، ترجمة قوانين حمورابي، مجلة اليقين، 1923 – 1925.

عبدة حسن الزيات، ترجمة قوانين حمورابي، مجلة القضاء، 1935 – 1936.

الدكتور عبدالرحمن الكيالي، شريعة حمورابي اقدم الشرائع العالمية، حلب 1958.

الدكتور محمود الامين، قوانين حمورابي والقوانين البابلية الاخيرة، مجلة كلية الاداب، العدد الثالث، بغداد 1961.

مجموعة من المؤلفين، شريعة حمورابي وأصل التشريع في الشرق القديم، ترجمة: اسامة سراس، دار علاءالدين، دمشق 1993.

ئەمەی لێرەدایە لەم سەرچاوە عەرەبییەوە کراوەتە کوردی:

د. فوزي رشيد، الشرائع العراقية القديمة، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد 1978.

گرنگی ئەم تەرجومەیە ئەوەیە: د. فەوزی رەشید، کە شوێنەوارناسێکی عیراقیە، راستەوخۆ لە زمانی بابلیەوە کردویەتی بە عەرەبی و، لە گەڵ قانون و شەریعەتەکانی تری میزۆپۆتامیا بە تایبەتی کۆمەڵە قانونەکانی "ئور نمو"، "لیبیت ئیشتار"، "ئەشنونا"، بەراوردی کردوە.

بۆ کەسێ بیەوێ ئاگاداری زۆرتر وەربگرێ لە سەر هەندێ لایەنی شەریعەتەکە و بابەتەکانی، ئەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ ئەم سەرچاوانە:

رضا جواد الهاشمي، نظام العائلة في العهد البابلي القديم، بغداد 1971.

الدكتور ابراهيم عبدالكريم الغازي، تاريخ القانون في وادي الرافدين والدولة الرومانية، بغداد 1973.

الدكتور عامر سليمان، القانون في العراق القديم، جامعة الموصل 1977.

د. هورست كلنغل، حمورابي ملك بابل وعصره، ترجمة: د. غازي شريف، مراجعة: د. علي يحيى منصور، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد 1987.

شعيب احمد الحمداني، قانون حمورابي، المكتبة القانونية ببغداد، 1989.

# شەریعەتی حامورابی

## پێشەکی

کاتێ خوا ئانوی مەزن، شای ئانوناکی و،
خوا ئینلیل گەورەی ئاسمان و ئەرز،
چارەنوسی وڵاتیان دیاری کرد و،
بڕیاریان دا مەردوخ کوڕی نۆبەرەی خوا ئینکی
پیرۆزیی خوا ئینلیلی بە سەر مرۆڤ دا هەبێ
لە ناو ئیکیکی دا گەورەیان کرد
بابلیان بە ناوە گەورەکەی خۆیەوە ناو نا و،
کردیانە سەرمەشقی دنیا و،
پاشایەتیەکی هەمیشەییان لە ناو جەرگەی دا دامەزراند
بنچینەکەیان وەکو ئاسمان و ئەرز پتەو کرد
ئەوسا ئانو و ئینلیل ناویان لە من نا: حامورابی، ئەو میرەی کە خواپەرستەو ترسی لە خواکانی هەیە
بۆ ئەوەی داد لە سەر ئەرز بسەپێنم
بۆ ئەوەی بەدی و خراپە لە ناو بەرم
بۆ ئەوەی نەهێڵم زۆردار لاواز بکاتە کۆیلە
بۆ ئەوەی داد وەکو خۆر، بە ژور سەری سەرڕەشەکانەوە، وڵات رۆشن بکاتەوە
لە پێناوی چاکەی مرۆڤ دا
منم، حامورابی شوانی ناونراو لە لایەن خوا ئینلیلەوە
ئەوەی بە لێشاو چاکە ئەکا
هەمو شتێ بۆ نیپور دور ئینکی دابین کردوە
چاککەرەوەی پەرستگای ئیکورە
شای لێوەشاوە، بنیاتنەرەوەی ئەریدویە
پاککەرەوەی پەرستگای ئابسوە
ئەوەی دەستی بە سەر هەر چوار قوڕنەی جیهان دا ئەڕوا
سەروەریی بۆ بابل هێناوە
دڵی مەردوخ، خواکەی، خۆش کردوە
کاتی خۆی تەرخان کردوە بۆ خزمەتی پەرستگای ئیساکلا،
ئەوەی شاهانە، کە لە خوا سین بوە
کە شاری ئوری گەشاندۆتەوە
خواپەرستە، پاراوەیە، کە خێری هێنا بۆ پەرستگای ئیکش نوکال
ئەو شا راماوەیە گوێڕایەڵی خوای گەورە شاماشە
پتەوکەری بنچینەی شاری سیپارە
نوێژگاکانی خوا ئایای رازاندۆتەوە

نەخشەدانەری پەرستگا ئیبیارە کە لە نشینگەیەکی ئاسمانی ئەچێ
پاڵەوانە، پارێزەری شاری لارسایە
بینای پەرستگای ئیبیاری بۆ خوا شاماش نوێکردۆتەوە
ئەو گەورەیەیە کە شاری ئوروکی بوژاندۆتەوە
لێشاوی ئاوی بۆ دابین کردون
لوتکەی پەرستگای ئای ئانای بەرز کردۆتەوە
ئەوەی سامانی بە سەر خواکان ئانو و ئیشتار دا ڕژاندوە
پارێزگاری وڵاتە، خەڵکی ئاوارەی ئایسن ی سەرلەنوێ کۆ کردۆتەوە
پەرستگای ئیکال ماخی پڕ کردوە لە سامان
شای شایان، برای خۆشەویستی خوا زبابا
ئەوەی کە خانوەکانی شاری کیشی بنیاتنایەوە
ئەوەی کە دەوری پەرستگای ئیمیتی ئورساک ی بە ئاوەدانی گرتوە
ئەوەی شارەزا بو لە بیناکردنی پەرستگا گەورەکانی ئیشتاردا
پارێزگاری پەرستگای خرساک کلامایە
ڕاوکەری دوژمنانە
ئەوەی خوا ئارا ی کردە هاوڕێی ئارەزوەکانی جێبەجێ بکا
ئەوەی کە شاری کوثای بەهێز کردوە
ئەوەی هەمو شتێکی پێشکەش بە پەرستگای میس لام کردوە
گای چەموشە، شکێنەری دوژمنانە
خۆشەویستی خوا توتو، خۆشکەری شاری بارسیپایە
خواپەرستە، ئەوەی کۆسپ نەبوە لە بەردەم پەرستگای ئیزیدا
ئەوەی مەزنی شاکانە و، ژیرە
ئەوەی ئەرزی کشتوکاڵی شاری دیلباتی فراوان کردوە
دانەوێڵەی بۆ ماخوا ئوراشی بەهێز عەمار کردوە
ئەوە کە گۆچانی شاهی و تاجی هەیە
بە پێی ئارەزوی ماخوا ماما
کە نەخشەی بۆ شاری کیش دانا
کە سفرەی ئایابی بۆ ماخوا نینتو ڕازانەوە
سەنگینی تەواوە،
کە لەوەڕگا و شوێنی خواردنەوەی بۆ شارەکانی لەکش و کرسو ئامادە کردوە
ئەوەی بە سەخاوەت قوربانی پێشکەش ئەکا بە پەرستگای ئینینو
ئەوەی دوژمنان ئەگرێ، ئەوە خۆشەویستی تیلیتیم ە،
ئەوەی ڕێنماییەکانی شاری زبالام بە وردی جێبەجێ ئەکا
کە دڵی ماخوا خۆش ئەکا
میری هەڵکەوتو، کە خوا ئەدەد نزاکانی گیرا ئەکا
کە دڵی خوا ئەدەد ئارام ئەکا، ئەو جەنگاوەرەیە لە ماڵی کارکارا ئینکی دا نیشتەجێیە

ئەوەی پەرستگای ئای ئوبکال ئەنەخشێنێ
ئەوەی ژیان ئەبەخشێ بە شاری ماشکان شابر
خوارینەوە ئەدا بە پەرستگای میسلام
ژیر و، کارسازە
کانگای زانایی لە لایە
رزگارکەری خەڵکی شاری مالقومە
ئەوەی کە ئاوایی زۆری بنیات ناوە
رەزامەندی خوا ئینکی و ماخوا دم کاڵ نونا
فراوانکەری قەڵەمرەوەکەی
ئەوەی هەمیشە قوربانی پاک پێشکەش ئەکا
یەکەمینە لە ناو شاهەکان دا
دەسەڵاتداری ناوچەکانی روباری فورات
بە فەرمانی خواکەی داکان
ئەوەی چاکەی لە گەڵ دانیشتوانی شاری میرا و شاری توتول کردوە
میری خواپەرست کە روی خوا تشباک روشن ئەکاتەوە
کە میوانداری گەورە بۆ خوا نین ئازو ئەکا
رزگارکەری گەلەکەی لە کوێرەوەری
ئەوەی جێگەپێیان بە برایەتی لە ناو جەرگەی شاری بابل دا پتەو ئەکا
شوانی خەڵکی، ئەوەی کردارەکانی بۆ رەزامەندی ماخوا ئیشتارە
ئەوەی ماخوا ئیشتار لە پەرستگای ئای ئاول ماش لە ناوەڕاستی ئاکەدا دائەنێ
ئەوەی کۆمەکی کرد هەق دەربکەوێ، ئەوەی گەل رابەری ئەکا بۆ رێگەی راست
ئەوەی فریشتە پاکە دڵنەرمەکەی گێڕایەوە بۆ ئاشور
بە سەر ئاژاوەچیەکان دا سەرکەوت
ئەو شایەی نازناوەکانی ماخوا ئیشتاری لە ئەینەوا و لە پەرستگای ئای میس میس کرد بە باو
ئەو سەنگینەی کە بە ترسەوە نوێژ بۆ خوا گەورەکان ئەکا
ئەو جێگرەوەی سمولا ئایل
کوڕی خورت، میراتگری سین
ئەو وەچەی وەجاخزادەی شاهانەی، شای خورت، خۆری شاری بابل،
کە روناکی بە سەر وڵاتی سومەر و ئاکەدا بڵاو ئەکاتەوە
ئەو شایەی کە هەر چوارلای جیهانی هێناوەتە ژێردەستی
ئەوە منم، حامورابی، خۆشەویستی ماخوا ئیشتار
کاتێ خوا مەردوخ ناردمی بۆ رابەریی دانیشتوانی وڵات بە رێگای راست دا و
بۆ بەرێوەبردنی وڵات
قانون و دادم بە زمانی وڵات دانا
بۆ ئەنجامدانی چاکە بۆ خەڵک
لەو کاتەدا ئەمەم دەرکرد:

ماددەی 1: ئەگەر پیاوێ تۆمەتی کوشتن بداتە پاڵ پیاوێکی تر، بەڵام نەیتوانی بیسەلمێنێ، تۆمەت بە پاڵ دەر ئەکوژرێ.

ماددەی 2: ئەگەر پیاوێ تۆمەتی جادوگەریی دایە پاڵ پیاوێکی تر، بەڵام نەیتوانی بیسەلمێنێ، پێویستە ئەوەی تۆمەتی جادوگەریی دراوەتە پاڵ بچێتە سەر ڕوبار، خۆی بهاوێژێتە ناو ڕوبارەکەوە، ئەگەر ڕوبارەکە نوقمی کرد، ئەوەی تۆمەتی داوەتە پاڵی ئەبێ دەس بە سەر دارایییەکەی دا بگرێ. ئەگەر ڕوبارەکە سەلماندی کە ئەم پیاوە پاکە و بە ساغی لێی هاتە دەرەوە، ئەوەی تاوانی جادوگەریی بە پاڵ داوە ئەکوژرێ، ئەوەی لە ڕوبارەکە بە ساغی هاتۆتە دەرەوە، ئەبێ دەس بگرێ بە سەر دارایی ئەوەی تۆمەتی بە پاڵ داوە.

ماددەی 3: ئەگەر پیاوێ سکاڵایەکی کرد و شایەتیەکی درۆی دا، ڕاستی قسەکەی بۆ نەسەلمێنرا، ئەگەر سکاڵاکە سکاڵای ژیان بێ، ئەو پیاوە ئەکوژرێ.

ماددەی 4: ئەگەر بۆ شایەتی (لە سکاڵایەکی درۆی تایبەت بە) دانەوێڵە یان زیو، ئەبێ ئۆباڵی سزای ئەو سکاڵایە هەڵ بگرێ.

ماددەی 5: ئەگەر داوەر سەیری پرسێکی قانونی کرد و بڕیارێکی دەربارەی دەرکرد، بڕیارەکە لە سەر خشتێکی مۆرکراو چەسپێنرا، ئەگەر سەلمێنرا ئەو داوەرە بڕیارەکەی خۆی کە لەو پرسەدا دەری کردوە گۆڕی، ئەبێ ئۆباڵی سزای ئەو سکاڵایە هەڵبگرێ و دوانزە جار ئەوەندەی ئەو بدا. سەرەڕای ئەوەش ئەبێ لە ئەنجومەنی داوەران و لە سەر کورسیەکەی بە جۆرێ دەربکرێ گەڕانەوەی نەبێ و مافی ئەوەی نەبێ لە گەڵ داوەران بۆ سەیرکردنی هیچ سکاڵایەک دابنیشێ.

ماددەی 6: ئەگەر پیاوێ شتێ بدزێ هی خوا یا هی کۆشک بێ، ئەو پیاوە ئەکوژرێ هەروەها ئەوەش ئەکوژرێ کە شتە دزراوەکەی بە دەستەوە بگیرێ.

ماددەی 7: ئەگەر پیاوێ زیو یا زێڕ یا کۆیلە یا کەنیزەک یا گا یا مەڕ یا کەر یا هەر شتێکی تر بکڕێ یا بە ئەمانەت پێی بسێردرێ بە دەستی کوڕی پیاوێ یا کۆیلەی پیاوێ بە بێ شایەت و گرێبەست، ئەو پیاوە دزە ئەبێ بکوژرێ.

ماددەی 8: ئەگەر پیاوێ گا یا مەڕ یا کەر یا بەراز یا بەلەم بدزێ، ئەگەر شتە دزراوەکە هی خوا یا کۆشک بێ، ئەبێ سی قات غەرامە بدا، ئەگەر هی وڵاتیی بێ، ئەبێ دە قات بدا، ئەگەر دزەکە نەیبێ بیدا، ئەکوژرێ.

ماددەی 9: ئەگەر پیاوێ شتێکی ون کرد، شتە دزراوەکەی بە دەست پیاوێکی ترەوە گیرا، ئەگەر پیاوەکەی شتە ونکراوەکەی بە دەستەوە گیراوە وتی: "فرۆشیارێ بە منی فرۆشتوە و لە بەردەم شایەت دا کڕیومە" و خاوەنی شتە ونبوەکەش وتی: "شایەت ئەهێنم بۆ پشتگیری شتە ونبوەکەم" ئەگەر کڕیارەکە (ئەو پیاوەی شتە ونبوەکەی بە دەستەوە گیراوە) فرۆشیارەکەی شتەکانی پێ فرۆشتوە و ئەو شایەتانەی بە ئامادەبونی ئەوان شتەکەی کڕیوە، بهێنێ و، خاوەن شتە ونبوەکە شایەت بۆ پشتگیری شتە ونبوەکەی بهێنێ، لە سەر داوەر پێویستە گوێ لە قسەکانیان بگرێ، ئەبێ شایەتەکانی کە بە ئامادەیی ئەوان (شتەکە) کڕدراوە و هەروەها شایەتەکانی کە پشتگیری شتە ونبوەکە ئەکەن، لە بەردەم خوا دا سوێند (لە سەر ڕاستی قسەکانیان) بخۆن. (ئەگەر ئەوە کرا) فرۆشیارەکە دزەکەیە و ئەبێ بکوژرێ. خاوەن شتە

وندبووەکە شتەکانی وەرئەگرێتەوە و کڕیارەکەش (ئەو پیاوەی شتە دزراوەکەی بە دەستەوە گیراوە) ئەو پارەیە لە دارایی فرۆشیارەکە وەرئەگرێتەوە.

مادەی 10: ئەگەر کڕیارەکە ئەو فرۆشیارە نەهێنێ کە شتەکەی پێ فرۆشتوە (شتە وندبووەکەی بە دەستیەوە گیراوە) و شایەتەکانی نەهێنا کە بە ئامادەیی ئەوان شتەکەی کڕیوە. لە کاتێک دا خاوەن شتە وندبووەکە شایەتی هێنا پشتیوانی لە شتە وندبووەکەی بکەن. کڕیارەکە دزەکەیە و ئەبێ بکوژرێ و خاوەنی شتە وندبووەکە شتەکەی وەر ئەگرێتەوە.

مادەی 11: ئەگەر خاوەنی شتە وندبووەکە شایەتی نەهێنا پشتیوانی لە شتە وندبووەکەی بکەن ئەوە درۆزنە و بە ناڕەوا داوا ئەکا، ئەبێ بکوژرێ.

مادەی 12: ئەگەر فرۆشیارەکە مرد، کڕیارەکە (کە شتە وندبووەکەی بە دەستەوە گیراوە) لە دارایی فرۆشیارەکە پێنج قاتی نرخی شتە وندبووەکەی (کە بە هۆیەوە سکاڵا کراوە) وەربگرێ.

مادەی 13: ئەگەر شایەتەکانی ئەم پیاوە (کە شتە وندبووەکەی بە دەستەوە گیراوە) نەکەوتە بەردەست (کاتی سکاڵاکە)، ئەبێ دادوەر کاتەکەی بۆ ماوەی شەش مانگ درێژ بکاتەوە. ئەگەر لە ماوەی شەش مانگ دا شایەتی نەهێنا. ئەو پیاوە درۆزنە، ئەبێ تۆباڵی سزای ئەو سکاڵایە هەڵ بگرێ.

مادەی 14: ئەگەر پیاوێ، منداڵی بچوکی پیاوێکی (تری) دزی، ئەبێ بکوژرێ.

مادەی 15: ئەگەر پیاوێ، بۆ راکردن لە دەروازەی شارەوە، یارمەتی کۆیلەیەکی کۆشک یا کەنیزەکێکی کۆشک یا کۆیلەی ئاغایەک یا کەنیزەکی ئاغایەکی دا، ئەبێ بکوژرێ.

مادەی 16: ئەگەر پیاوێ، کۆیلەیەکی راکردو یا کەنیزەکێکی راکردوی کۆشک یا هی ئاغەیەک لە ماڵەکەی خۆی دا بشارێتەوە و گوێی نەدایە دەنگی جارچی، ئەم خاوەن ماڵە ئەکوژرێ.

مادەی 17: ئەگەر پیاوێ کۆیلەیەکی راکردو یا کەنیزەکێکی راکردوی گرت لە زەویەکی کشتوکاڵی دا و گێڕایەوە بۆ خاوەنەکەی، ئەبێ خاوەنی کۆیلەکە دو شیقل زیوی بداتێ.

مادەی 18: ئەگەر کۆیلەکە ناوی ئاغاکەی نەوت، ئەبێ (ئەوەی گرتویەتی) بیبا بۆ کۆشک، لە داسنامەکەی بپشکنێ (لە ناو کۆشک دا) و بیگێڕێتەوە بۆ ئاغاکەی.

مادەی 19: ئەگەر ئەو کۆیلەیەی لە ماڵەکەی خۆی دا گل دایەوە و، دوای ئەوە کۆیلەکە لە لای ئەو دۆزرایەوە، ئەو پیاوە ئەکوژرێ.

مادەی 20: ئەگەر کۆیلەکە رای کرد لە دەست ئەوەی دەستگیری کردوە، ئەو پیاوە ئەبێ سوێند بخوا بە خوا بۆ خاوەن کۆیلەکە، ئەوسا رێ ئەدرێ بڕوا بە لای کاری خۆیەوە.

مادەی 21: ئەگەر پیاوێ دەلاقەیەکی کردە ماڵێکەوە (بۆ دزی) ئەبێ لە شوێنی ئەو دەلاقەیەدا بکوژرێ و دیواری لە سەر بکەن (لە دیوارەکەدا بینێژن).

مادەی 22: ئەگەر پیاوێ دزی کرد، لەو کاتەدا گیرا (لە کاتی دزیەکەدا) ئەکوژرێ.

مادەی 23: ئەگەر دزەکە نەگیرا، ئەبێ پیاوە دزی لێ کراوەکە، شتە دزراوەکانی لە بەردەم خوادا باس بکا، ئەبێ شار و فەرماندار کە دزی لە ئەرزەکەی ئەو دا و لە ناوچەکەی ئەو دا روی داوە، قەرەبوی شتە دزراوەکەی بۆ بکەن.

مادە 24: ئەگەر گیانێ (لە کاتی دزیەکەدا) فەوتا، ئەبێ شارەکە و فەرماندار یەک مەن (ئەندازەیەکی کێشانی قورسایی بوە) زیو بدەن بە کەسەکانی.

ماددەی 25: ئەگەر پیاوێ ئاگر لە ماڵەکەی بەر بو، پیاوێکی تر چو بۆ کوژاندنەوەی، چاوی بە شتێکی ماڵەکە کەوت هی خاوەن ماڵەکە بو، ئەو شتەی برد کە هی خاوەن ماڵەکەیە، ئەم پیاوە ئەخرێتە ناو ئەو ئاگرەوە.

ماددەی 26: ئەگەر سەربازێ یا سەردەستەیەک (کە لە سپادا کار ئەکا) بۆ لەشکرکێشی شا داوا کرا، خۆی نەچو لە بری خۆی یەکێکی تری بە کرێ گرت و لە باتی خۆی ناردی، ئەو سەربازە یا ئەو سەردەستەیە ئەکوژرێ. بەڵام نێردراوەکەی (ئەوەی لە لایەن ئەوەوە بە کرێ گیراوە)، بۆی هەیە ماڵەکەی ببا (واتە ماڵی سەرباز یا سەردەستە)

ماددەی 27: ئەگەر سەربازێ یا سەردەستەیەک لە ماوەی خزمەتی چەکداری شا دا بە دیل بگیرێ. دوای ئەوە (کاتی بزربونی ئەو) کێڵگەکەی و باخەکەی درابو بە پیاوێکی تر، ئەویش (پیاوەکەی تر) هەمو مەرجگەلی دەرەبەگی بە جێ هێنا بو. ئەگەر (سەرباز یا سەردەستەکە) گەڕایەوە و گەیشتەوە شارەکەی. ئەبێ کێڵگەکەی و باخەکەی بۆ بگێڕنەوە، ئەبێ مافە دەرەبەگیەکانی خۆی بە کار بهێنێ.

ماددەی 28: ئەگەر سەربازێ یا سەردەستەیەک لە ماوەی خزمەتی چەکداری شادا بە دیل بگیرێ، کوڕەکەی توانای بەجێهێنانی مەرجگەلی دەرەبەگیی هەبێ، ئەبێ کێڵگە و باخەکە بەو بدرێ، ئەویش ئەبێ مافە دەرەبەگیەکانی باوکی جێبەجێ بکا.

ماددەی 29: ئەگەر کوڕەکەی پچوک بێ و توانای بەجێهێنانی مەرجگەلی دەرەبەگیی باوکی نەبێ، سێیەکی کێڵگە و باخەکە ئەدرێتە دایکی و دایکی بە خێوی ئەکا.

ماددەی 30: ئەگەر سەربازێ یا سەردەستەیەک بە هۆی ئەرکەکانیەوە (سەربازی) دەستی لە کێڵگەکەی و باخەکەی و ماڵەکەی هەڵگرت، دوای ئەوە یەکێکی تر دەستی بە سەر کێڵگە و باخ و خانوەکەی دا گرت و، ماوەی سێ ساڵ مەرجگەلی دەرەبەگیی بە جێهێنا، ئەگەر گەڕایەوە و داوای کێڵگە و باخ و ماڵەکەی کردەوە، نابێ بیدەنەوە، ئەوەی دەستی بە سەردا گرتوە و ئەرکە دەرەبەگیەکانی بە جێهێناوە، لە بەڕێوەبردنی دا بەردەوام ئەبێ.

ماددەی 31: ئەگەر تەنیا یەک ساڵ بزر بوبێ و گەڕایەوە، ئەبێ کێڵگەکە و باخەکە و ماڵەکەی بۆ بگەڕێتەوە و ئەویش مافە دەرەبەگیەکانی خۆی بە کار بهێنێ.

ماددەی 32: ئەگەر سەربازێ یا سەردەستەیەک لە کاتی لەشکرکێشی شادا بە دیل گیرا، بازرگانێ ئازادی کرد و گەیاندیەوە شارەکەی، ئەگەر لە ماڵەکەی دا (دارایی) بایی ئازاد کردنی (خۆی) هەبێ، ئەبێ خۆی ئازاد بکا، ئەگەر لە ماڵەکەی دا بایی ئازادکردنی خۆی نەبو، لە لایەن ماڵی خوای شارەکەیەوە ئازاد ئەکرێ، ئەگەر لە ماڵی خوای شارەکەی دا بایی ئازاد کردنی نەبو، ئەبێ کۆشک ئازادی بکا، نابێ کێڵگەکەی و باخەکەی لە بەرامبەر ئازادکردنی دا بدرێ.

ماددەی 33: ئەگەر سەرگەورەیەک یا عەریفێ، بۆ پۆشینی دواکەوتنی سەربازێ لە لەشکرکێشی شادا، بەکرێگیراوێکی قبوڵ کرد و، لە جێی ئەو ناردی بۆ لەشکرکێشیەکەی شا، ئەو سەرگەورەیە یا عەریفە ئەکوژرێ.

ماددەی 34: ئەگەر سەرگەورەیەک یا عەریفێ شتی لە سەرباز وەرگرت یا شتی سەربازی زەوت کرد یا سەربازێکی وەکو بەکرێگیراو نارد، یا سەربازێکی بە هۆی کەسێکی بەهێزەوە دا بە دادگا، ئەم سەرۆکە یا عەریفە ئەکوژرێ.

مادەی 35: ئەگەر پیاوێ مانگا یا مەڕی لە سەربازێ کڕی، کە شا دابونی بە سەربازەکە، پارەکانی ئەدۆڕێنێ.

مادەی 36: سەرباز و سەرنەستە و جوتیار (واتە ئەوەی باج ئەدا) نابێ بە پارە کێڵگەکە و باخەکە و خانوەکەی بفرۆشێ.

مادەی 37: ئەگەر پیاوێ کێڵگە یا باخ یا خانوی سەربازێ یا سەرنەستەیە یا جوتیارێ بکڕێ، ئەبێ سواڵەتی گرێبەستەکەی بشکێنرێ و پارەکەیشی بدۆڕێنێ. کێڵگە و باخ و خانوەکە ئەگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی.

مادەی 38: سەرباز یا سەرنەستە یا جوتیار ناتوانێ بەشێ لە کێڵگە و باخ و خانوەکەی کە بۆ خۆی دابڕاوە، دابڕێ بۆ ژنەکەی و کچەکەی. یا لە بەرامبەر ئەو مەرجگەلەی لە سەرێتی بیداتەوە.

مادەی 39: (سەرباز یا سەرنەستە یا جوتیار) ئەتوانێ بەشێ لە کێڵگە یا باخ یا خانوەکەی کە کڕیوێتی و نەستی کەوتوە دابڕێ و، ئەتوانێ لە بەرامبەر ئەو مەرجگەلەی لە سەرێتی بیداتەوە.

مادەی 40: ئەگەر کاهینەیەک لە پلەی بەرز یا بازرگانێ یا غەریبێ کێڵگەکەی و باخەکەی و خانوەکەی بەرامبەر بە زیو فرۆشت، کڕیارەکە بۆی هەیە مافە نەرەبەگیەکانی بە کار بهێنێ لەو کێڵگە و باخ و خانوەدا کە کڕیوێتی.

مادەی 41: ئەگەر پیاوێ بە گۆڕینەوە کێڵگەیەک یا باخێک یا خانویەک هی سەرباز یا سەرنەستە یا جوتیارێ (بەرامبەر ئەرزێکی تر) دەس بکەوێ و بۆ تەواوکردنی نرخەکەی (نرخی کێڵگە یا باخ یا خانوەکە) چەرنەیەک پارەی بداتێ. سەرباز یا سەرنەستە یا جوتیار ئەبێ کێڵگەکەی و باخەکەی و خانوەکەی وەربگرێتەوە و، ئەتوانێ ئەو پارە تەواوکراوەش کە دراوێتێ بۆ خۆی هەڵبگرێ.

مادەی 42: ئەگەر پیاوێ ئامادەیی دەربڕی بۆ (بەرهەمهێنانی) کێڵگەیەک، بەڵام کێڵگەکەی ئەکرد بە دانەوێڵە، ئەگەر سەلمێنرا کە کێڵگەکەی نەکێڵاوە، ئەبێ ئەوەندەی کێڵگەی دراوسێکەی (بەرهەمی هێناوە) دانەوێڵە بدا بە خاوەنی کێڵگەکە.

مادەی 43: ئەگەر کێڵگەکە بە بێ کێڵان جێ هێڵرا (نەکرا بە کشتوکاڵ) ئەبێ ئەوەندەی کێڵگەی دراوسێکەی (بەرهەمی هێناوە) دانەوێڵە بدا بە خاوەنی کێڵگە و، ئەبێ هێڵەکانی کێڵگەکە رێک بخاتەوە و بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی.

مادەی 44: ئەگەر پیاوێ بۆ ئەوەی کشتوکاڵی تێدا بکا زەویەکی بەیاری بۆ ماوەی سێ ساڵ بە کرێ گرت، بەڵام کەمتەرخەمی کرد و زەویەکەی نەکردە کشتوکاڵ، لە ساڵی چوارەم دا ئەبێ هێڵەکانی کێڵگەکە رێک بخا و بیکێڵێ و بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنی زەویەکە و، ئەبێ بۆ هەر بور ێ (ئەندازەیەکی پێوانی زەوی بوە) دە کور ی (ئەندازەیەکی کێشانی قورسایی بوە) بداتێ (بە خاوەن کێڵگە).

مادەی 45: ئەگەر پیاوێ کێڵگەکەی دا بە جوتیارێ بەرامبەر چەرنەیەک دانەوێڵە و (خاوەن کێڵگە) بەشەکەی خۆی وەرگرت، دوای ئەوە خوای گەردەلول ئادەد کێڵگەکەی وێران کرد یا لافاو تێکی دا، زیانەکە ئەکەوێتە سەر جوتیارەکە (بە تەنیا).

مادەی 46: ئەگەر (خاوەن کێڵگە) بەشەکەی خۆی لە کێڵگەکەی خۆی وەرنەگرت بو، بەڵام بە نیوەیی یا بە سێیەک بە کرێ دابویە، ئەبێ جوتیار و خاوەن کێڵگە بە پێی بەرهەمەکەی دابەشی بکەن.

ماددەی 47: ئەگەر جوتیارەکە تێچوی کشتوکاڵەکەی ساڵی رابوردوی دەس نەکەوت و داوای کرد سەرلەنوێ کشتوکاڵ بکاتەوە، ئەبێ خاوەن کێڵگە (داواکەی) رەت نەکاتەوە. جوتیارەکە کێڵگەکەی بەرهەم دەهێنێ و ئەویش (خاوەن کێڵگە) بۆی هەیە لە کاتی هەڵگرتنی بەروبوم دا بە پێی رێککەوتنی (لە گەڵ جوتیارەکەدا) دانەوێڵە وەربگرێ.

ماددەی 48: ئەگەر پیاوێ قەرزی لە سەر بێ و خوای گەردەلول ئاددد کێڵگەکەی تێک بدا یا لافاو وێرانی بکا یا بە هۆی کەمئاوییەوە دانەوێڵە لە کێڵگەکەی دا نەڕوا، لەم ساڵەدا دانەوێڵەکەی (قەرز کراوە) ناگەڕێنرێتەوە بۆ خاوەنی قەرزەکە و گرێبەستەکەیان هەڵئەوەشێنرێتەوە و، بۆ ئەو ساڵە فایزی لێ نادرێ.

ماددەی 49: ئەگەر پیاوێ پارەی لە بازرگانێ قەرز کرد و کێڵگەیەکی ئامادەی بەرهەمهێنانی جۆ و کونجی دایە و پێی وت کێڵگەکە بچێنە و دروێنەی بکە و جۆ یا کونجیە بەرهەمهێنراوەکە بیە. ئەگەر جوتیارەکە (کە بازرگانەکە بۆ چاندنی کێڵگەکە بە کرێی گرتوە) جۆ یا کونجی بەرهەم هێنا، لە کاتی هەڵگرتن دا خاوەن کێڵگەکە جۆ یا کونجی بەرهەمهێنراو وەرئەگرێ. پێویستە دانەوێڵە لە بەرامبەر ئەو پارەیەی لێی وەرگرتوە (کە قەرزی کردوە)، هەروەها پێویستە تێچوی چاندنەکەی بداتێ (تێچوی چاندنی کێڵگەکە).

ماددەی 50: ئەگەر پیاوێ کێڵگەیەکی چێنراوی (جۆ) یا کێڵگەیەکی بە کونجی چێنراوی (رەهن) کرد، خاوەنی کێڵگەکە جۆکە یا کونجیەکەی لە کێڵگەکەدا بەرهەم هاتوە وەرئەگرێ، بەڵام پێویستە پارەکە (قەرزکراوەکە) لە گەڵ فایزەکەی بداتەوە.

ماددەی 51: ئەگەر پارەی نەبو (واتە ئەو پیاوەی کێڵگەکەی خستۆتە رەهنەوە) بیداتەوە، ئەبێ (جۆ یا) کونجی بدا بە بازرگانەکە بە قەدەر نرخە باوەکەی (لە بازاڕ) بەو نرخەی شا بڕیوێتی لە باتی ئەو پارەیەی کە لە بازرگانەکە قەرزی کرد بو لە گەڵ فایزەکەی.

ماددەی 52: ئەگەر جوتیارەکە (کرێگرتەکە) جۆ یا کونجی لە کێڵگەکەدا بەرهەم نەهێنا، بۆی نیە گرێبەستەکە بگۆڕێ.

ماددەی 53: ئەگەر پیاوێ سستی کرد لە بەهێزکردنی بناوانی کێڵگەکەی و بناوانەکەی بەهێز نەکرد، شکانێ لە بناوانەکەدا روی دا، ئاو زەویە چێنراوەکەی (دراوسێکەی) خراپ کرد، پێویستە ئەو پیاوەی شکانەکە لە بناوانەکەی دا روی داوە قەرەبوی ئەو دانەوێڵەیە بکاتەوە کە بۆتە هۆی فەوتانی (لە کێڵگەی دراوسێکەی دا).

ماددەی 54: ئەگەر توانای قەرەبوی دانەوێڵەکەی نەبو، ئەبێ... داراییەکەی بفرۆشن و، ئەبێ کرێگرتەکان (جوتیارەکان) کە دانەوێڵەکەیان فەوتاوە (نرخەکەی) لە ناو خۆیان دا دابەش بکەن.

ماددەی 55: ئەگەر پیاوێ سستی کرد لە کاتی کردنەوەی جۆگا تایبەتیەکەی خۆی بۆ ئاودان، لێگەڕا ئاو کێڵگەی دراوسێکەی نقوم بکا، ئەبێ دانەوێڵە بدا (بە خاوەنی کێڵگەی زیان لێکەوتو) بە قەدەر (بەرهەمی کێڵگەی) دراوسێکەی.

ماددەی 56: ئەگەر پیاوێ ئاوەکەی کردەوە و کارەکانی کێڵگەی دراوسێکەی خراپ کرد، ئەبێ بەرامبەر بە هەر بورێ دە کور دانەوێڵە بدا بە دراوسێکەی.

ماددەی 57: ئەگەر شوانێ لە گەڵ خاوەنی کێڵگەدا رێک نەکەوێ لە سەر لەوەڕاندنی مەڕەکانی لە پوشەکەی ئەودا، بەڵام رانەکەی بەردا لە کێڵگەکەدا بلەوەڕێ بە (بێ رەزامەندی) خاوەنی کێڵگە، کاتێ خاوەنی کێڵگە بەروبومی کێڵگەکەی هەڵئەگرێتەوە، پێویستە ئەو شوانەی رانەکەی بەرداوەتە

کێڵگەکە (بە بێ ڕەزامەندی) خاوەنەکەی بلەوەڕێ، زیاد لەوەی خاوەن کێڵگە بەروبومەکەی هەڵگرتۆتەوە بۆ هەر بوریێ دە کور دانەوێڵەی بداتێ.

ماددەی 58: دوای ئەوەی ڕانەمەڕەکە لە لەوەڕگاکە کشایەوە و (شوێنی ئاوخواردنەوەی بە جێ هێشت گەڕانەوە دەروازەی شار) ئەو کاتە شوانەکە ڕانەکەی لە کێڵگەکەدا بەردا و بوە هۆی ئەوەی لە کێڵگەکەدا بلەوەڕێ، شوانەکە دادەنرێ بۆ پاسەوانی ئەو کێڵگەیەی کە تیا لەوەڕاوە، لە کاتی هەڵگرتنی بەروبوم دا ئەبێ بۆ هەر بوریێ شەست کور دانەوێڵە بدا.

ماددەی 59: ئەگەر پیاوێ داری باخی پیاوێکی تری بڕی بە بێ ڕەزامەندی خاوەنی باخەکە، ئەبێ نیو مەن زیوی بداتێ.

ماددەی 60: ئەگەر پیاوێ کێڵگەیەکی دا بە باخەوانێ بیکا بە باخ، باخەوانەکە باخەکەی ڕوان، ئەبێ ماوەی چوار ساڵ باخەکە بە خێو بکا، لە ساڵی پێنجەم دا خاوەنی باخەکە بەروبومی باخەکە بە یەکسانی دابەش ئەکا، خاوەنی باخەکە بۆی هەیە خۆی بەشەکەی خۆی هەڵبگرێ.

ماددەی 61: ئەگەر باخەوانەکە هەمو باخەکەی نەڕواند و بەشێکی بە بەیاری هێشتەوە، ئەبێ پارچە بەیارەکە لە بەشەکەی ئەو بیژێردرێ.

ماددەی 62: ئەگەر ئەو کێڵگەیەی دراوێتێ نەکردە باخ و فەرامۆشی کرد، باخەوانەکە ئەبێ ئەوەندە بدا بە خاوەن کێڵگەکە بەرامبەر بەو ساڵانەی کە فەرامۆشی کردوە بە قەدەر ئەوەی کێڵگەی دراوسێکەی بەرهەمی هێناوە، ئەبێ کارەکانی کێڵکەگە تەواو بکا و کێڵگەکە بگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی.

ماددەی 63: ئەگەر کێڵگەکە بەیار بێ، ئەبێ کاری پێویست لە کێڵگەکەدا ئەنجام بدا و بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی و بەرامبەر بە هەر بوریێ بۆ ماوەی یەک ساڵ دە کوری بداتێ.

ماددەی 64: ئەگەر پیاوێ باخەکەی دا بە باخەوانێ موتوربەی بکا، ئەبێ باخەوانەکە، مادەم کێڵگەکەی بە دەستەوەیە، دوسێیەکی بەرهەمی باخەکە بدا بە خاوەنی باخەکە و خۆی سێیەک بیا.

ماددەی 65: ئەگەر باخەوانەکە باخەکەی موتوربە نەکرد و بوە هۆی کەمی بەرهەم، ئەبێ باخەوانەکە بەرهەمی باخەکە بدا بە خاوەن باخەکە بە قەدەر ئەوەی باخی دراوسێکەی بەرهەم ئەهێنێ.

ماددەی 66: ئەگەر پیاوێ پارەی لە بازرگانێ قەرز کرد، بازرگانەکە داوای پارەکەی لێ کردەوە، ئەیبو بیداتەوە، ئەگەر باخەکەی دوای موتوربەکردنی دا بە بازرگانەکە و وتی: "لە باتی پارەکەت هەمو بەرهەمی باخەکە لە خورما بۆ خۆت بیە"، ئەبێ ئەو بازرگانە لە سەر ئەم داوایە ڕازی ئەبێ، خاوەنی باخەکە ئەبێ ئەو خورمایەی لە باخەکەدا بەرهەم هاتوە هەڵبگرێ و بیفرۆشێ بە نرخی خورماکە، پارەی بازرگانەکە بە فائیزەکەیەوە، بە پێی داوەرۆکی گرێبەستەکە بداتەوە، خاوەنی باخەکەش پاشماوەی ئەو خورمایەی لە باخەکەی دا بەرهەم هاتوە بۆ خۆی بیا.

.....

لە ماددەی 67 تا 100 فەوتاوە

.......

ماددەی 101: ئەگەر بۆ هەر کوێیەک چو قازانجی دەس نەکەوت، ئەبێ فرۆشیارە گەڕۆکەکە ئەو پارەیەی وەری گرتوە دوقات بگێڕێتەوە بۆ ئەو بازرگانەی کە لێی وەرگرتوە.

مادەی 102: ئەگەر بازرگانێ پارەی بە قەرز دا بە فرۆشیارێکی گەڕۆک بۆ ئەوەی ئیشی پێوە بکا، بەڵام بۆ هەر کوێیەک چو زەرەری کرد، ئەبێ ئەو سەرمایەی (کە قەرزی کردوە) بگێڕێتەوە بۆ بازرگانەکە.

مادەی 103: ئەگەر لە ڕێگەی گەشتە بازرگانیەکەی دا، چەردە روتی کردەوە لەوەی پێیەتی، فرۆشیارە گەڕۆکەکە ئەبێ سوێند بە خوا بخوا ئەوسا وازی لێ ئەهێنرێ.

مادەی 104: ئەگەر بازرگانێ خوری یا رۆن یا هەر کاڵایەکی تری، بۆ کڕین و فرۆشتن، بە قەرز دا بە فرۆشیارێکی گەڕۆک . پێویستە لە سەر فرۆشیارە گەڕۆکەکە لە پێشەوە نرخەکەی تۆمار بکا و بیدا بە بازرگانەکە و فرۆشیارە گەڕۆکەکە وەسڵێکی مۆرکراوی ئەو پارەیەی لێ وەربگرێ کە داوێتیەوە بە بازرگانەکە.

مادەی 105: ئەگەر فرۆشیارە گەڕۆکەکە کەمتەرخەم بێ و وەسڵی مۆرکراوی ئەو پارەیەی داوێتی بە بازرگانەکە وەرنەگرتبێ، پارەی دراو بە بێ وەسڵی مۆرکراو لە حسابەکە داناشکێنرێ.

مادەی 106: ئەگەر فرۆشیارێکی گەڕۆک پارەی لە بازرگانێ قەرز کرد، دوای ئەوە نکولی کرد کە قەرزی لە بازرگانەکە کردبێ، لە سەر بازرگانەکە پێویستە لە بەردەم خوا و بە ئامادەبونی شایەتەکان بیسەلمێنێ کە فرۆشیاری گەڕۆک پارەکەی لێ قەرز کردوە، ئەوسا لە سەر فرۆشیاری گەڕۆک پێویستە سێ قاتی ئەو چەردە پارەیە بداتەوە بە بازرگانەکە کە قەرزی لێ کردوە.

مادەی 107: ئەگەر بازرگانێ پێشینەی دا بە فرۆشیاری گەڕۆک، فرۆشیارە گەڕۆکەکە پێشینەکەی بۆ بازرگانەکە گێڕایەوە. ئەگەر بازرگانەکە نکولی کرد لەوەی کە فرۆشیاری گەڕۆک داویتیەوە. لە سەر فرۆشیاری گەڕۆک پێویستە دانەوەکەی لە بەردەم خوا و شایەتەکان دا بسەلمێنێ، بازرگانەکە پێویستە، بە هۆی نکولی کردنەکەیەوە، لەوەی کە فرۆشیارە گەڕۆکەکە داویتیەوە، شەش قاتی ئەو پێشینەیەی کە داویتی بە فرۆشیارە گەڕۆکەکە بداتەوە.

مادەی 108: ئەگەر ژنە مەیفرۆشەکە لە نرخی مەی دا دانەوێڵەی وەرگرت لە باتی پارە بە کێشی قورس، بەوەش نرخی مەی لە بەرامبەر دانەوێڵەدا دابەزاند، ئەبێ ئەم فێڵەی مەیفرۆشەکە بسەلمێنن، ئەوسا بیهاوێژنە ناو روبارەوە.

مادەی 109: ئەگەر دەسبڕەکان (تاوانباران) لە ماڵی ژنە مەیفرۆشەکە کۆ بونەوە و، ئەو دەسبڕانەی دەسگیر نەکرد و، نەیدانە دەست کۆشک، ئەم ژنە مەیفرۆشە ئەکوژرێ.

مادەی 110: ئەگەر کاهینەی نائیتوم (پلەیەکی ئاینیی ژنانی ناو پەرستگاکان بوە) و نینتوم (پلەیەکی ئاینیی ژنانی ناو پەرستگاکان بوە) لە نێرەکەدا نیشتەجێ نەبێ و مەیخانەیەکی کردەوە یا چوە ناو مەیخانەیەکەوە بۆ خواردنەوەی شەراب یا بیرە، ئەبێ ئەو ژنە بسوتێنن.

مادەی 111: ئەگەر ژنە مەیفرۆشەکە شەرابی بیخمی بە قەرز دا، ئەبێ لە کاتی بەرهەمهەڵگرتن دا پەنجا سوت (ئەندازەیەکی کێشانی بوە) دانەوێڵە وەربگرێتەوە.

مادەی 112: ئەگەر پیاوێ گەشتێکی بازرگانی کرد و زیو یا زێڕ یا بەردی گرانبەها یا هەرشتێکی تری ئەم پیاوە هەیبێ بیدا بە یەکێکی تر بۆی بگوێزێتەوە، ئەگەر ئەم پیاوە ئەوەی پێی سپێردراوە نەیگوێزایەوە بۆ ئەو شوێنەی بۆی بگوێزێتەوە و دەستی بە سەردا گرت، خاوەنی ئەو شتانەی ئەبو بگوازرێتەوە، ئیسپاتی بکا کە شتەکانی نەگواستۆتەوە بۆ شوێنی ویستراو، ئەوسا ئەو پیاوە ئەبێ پێنج قاتی ئەوەی دراوێتێ بداتەوە بە خاوەنی شتەکان.

مادەی 113: ئەگەر پیاوێ دانەوێڵە یا زیوی لە سەر پیاوێکی تر هەبێ، ئەگەر دانەوێڵەی لە عەمارەکە یا لە خەرمانەکە بە بێ رەزامەندی خاوەنەکەی برد، ئەبێ بیسەلمێنن کە ئەو پیاوە بێ رەزامەندی خاوەنەکەی دانەوێڵەکەی لە عەمار یا لە خەرمانەکە بردوە، ئەبێ ئەوەندەی لە دانەوێڵەکە بردویەتی بگێڕێتەوە و هەمو ئەو پێشینەیەی کە دابویە لە دەس ئەچێ.

مادەی 114: ئەگەر پیاوێ دانەوێڵە یا زیوی لە سەر یەکێکی تر نەبێ، ئەگەر کابرایەکی بە کەفیل گل دایەوە، ئەبێ وەکو قەرەبو سێیەکی مەنێ زیو بدا بە هەر یەکێ لە گلدراوەکان.

مادەی 115: ئەگەر پیاوێ دانەوێڵە یا زیوی لە سەر پیاوێکی تر هەبو، یەکێکی بە کەفیل لای خۆی گل دایەوە، ئەگەر کەفیلەکە بە مردنێکی ئاسایی مرد لە ماڵی گلدەرەوەکەی دا، ئەم پرسە پێویستی بەوە نیە سکاڵای لە سەر تۆمار بکرێ.

مادەی 116: ئەگەر کەفیل لە ماڵی گلدەرەوەکەی بە لێدان یا بە بەدرەفتاری مرد، خاوەنی کەفیل ئەبێ ئەوە لە سەر بازرگانەکە ئیسپات بکا، ئەگەر کەفیل کوڕی پیاوێ بێ ئەبێ کوڕەکەی بکوژن، ئەگەر کۆیلەی پیاوێ بێ ئەبێ سێیەکی مەنێ زیو بدا و هەمو ئەوەشی کە بە پێشینە داویەتی ئەفەوتێ.

مادەی 117: ئەگەر پیاوێ لە سۆنگەی هاتنی کاتی دانەوەی قەرزەوە هەڵپێچرا و لە ئەنجامی ئەوەدا ژنەکەی یا کوڕەکەی یا کچەکەی بە پارە فرۆشت یا خستنیە ژێر کۆیلەیەتی خاوەن قەرزەکەی، ئەبێ سێ ساڵ لە ماڵێ کڕیارەکە یا لە ماڵی ئەوەی کۆیلەی کردون کار بکەن، لە ساڵی چوارەم دا ئازادییان بۆ ئەگەڕێتەوە.

مادەی 118: ئەگەر کۆیلەیەک یا کەنیزەکێ درایە خاوەن قەرزی ئاغاکەی، ئەبێ بازرگانەکە چاوەڕێ بکا تا کاتی دانەوەی قەرزەکە بە سەر ئەچێ و، بۆی هەیە بیفرۆشێ بەرامبەر پارە. کۆیلەکە و کەنیزەکەکە مافیان نیە دژی کارەکەی بازرگانەکە سکاڵا بکەن.

مادەی 119: ئەگەر پیاوێ لە سۆنگەی هاتنی کاتی دانەوەی قەرزەوە هەڵپێچرا، کەنیزەک هکەی خۆی کە منداڵی لێی بوە دا بە پارە، ئەتوانێ پارەکە بداتەوە بە بازرگانەکەی پارەکەی دابویە و کەنیزەکەکەی ئازاد بکا.

مادەی 120: ئەگەر پیاوێ دانەوێڵەکەی لە گەنجینەی پیاوێکی تردا هەڵگرت، عەمارەکە زەرەری لێ کەوت، یا خاوەن ماڵەکە گەنجینەکەی کردەوە و دانەوێڵەکەی برد، یا نکولی کرد لە هەمو ئەو دانەوێڵەیەی کە لە ماڵەکەی ئەودا هەڵگیرا بو، ئەبێ خاوەنی دانەوێڵەکە لە بەردەم خوادا مافەکەی بسەلمێنێ، ئەوسا خاوەن ماڵەکە ئەبێ دوقاتی دانەوێڵەکەی بردویەتی بگێڕێتەوە بۆ خاوەنی دانەوێڵەکە.

مادەی 121: ئەگەر پیاوێ دانەوێڵەی لە ماڵی پیاوێکی تردا هەڵگرت، ئەبێ لە ساڵێک دا پێنج قا (ئەندازەیەک بوە لە دانەوێڵە) لە هەر کورێکی دانەوێڵەکە لە باتی کرێی هەڵگرتن بداتێ.

مادەی 122: ئەگەر پیاوێ زیو یا زێڕ یا هەر شتێکی تری دا بە پیاوێکی تر بۆ ئەوەی بۆی بپارێزێ، ئەبێ چەند شایەتێ شایەتی بدەن لە سەر ئەوەی ئەیداتێ، وە ئەبێ گرێبەستێ بنوسن بۆ ئەو شتەی کە داویەتێ بیپارێزێ.

مادەی 123: ئەگەر شتەکانی بە بێ شایەت و بە بێ گرێبەستی نوسراو دابو بپارێزرێ، دوای ئەوە ئەو شوێنەی لێی دانرا بو نکولییان لێ کرد، ئەم پرسە کە نکولی لێ کراوە پێویست بە تۆماری سکاڵا ناکا.

ماددەی 124: ئەگەر پیاوێ زیو یا زێڕ یا هەر شتێکی تری، لە بەردەم شایەت دا، دا بە پیاوێکی تر بیپارێزێ، دوای ئەوە ئەو پیاوە نکولی لێ کرد، ئەبێ نکولیەکەی ئەم پیاوە بسەلمێنن، ئەوسا ئەبێ دوقاتی ئەوە بدا.

ماددەی 125: ئەگەر پیاوێ شتێکی دا بۆی بپارێزن، ئەو شتەی دای ئابو لە گەڵ شتی خاوەن ماڵەکە گوم بو بە هۆی بڕینی دیوار یا هەڵگەڕان بە ماڵەکەدا و ئەوەش بە هۆی کەمتەرخەمی خاوەن ماڵەکەوە بو، ئەبێ ئەوەی دراوێتێ و لێی دزراوە قەرەبوی بکاتەوە، خاوەن ماڵەکەش ئەبێ بەردەوام بۆ شتە دزراوەکەی بگەڕێ و لە دزەکەی بسێنێتەوە.

ماددەی 126: ئەگەر پیاوێ شتی خۆی لێ نەدزرا، بەڵام وتی شتەکانم دزراوە و بەوەش ئەنجومەنی شارەکەی تەفرە دا، ئەبێ ئەنجومەنی شارەکەی لە بەردەم خوادا بیسەلمێنێ کە هیچی لێ نەدزراوە، ئەوسا ئەبێ دوقاتی ئەوەی سکاڵای بۆ کردوە بدا بە ئەنجومەنی شارەکەی.

ماددەی 127: ئەگەر پیاوێ بو بە هۆی ئەوەی پەنجە بۆ کاهینە ئینتوم یا ژنی پیاوێ رابکێشرێ، بەڵام تۆمەتەکەی نەسەلماند، ئەبێ ئەم پیاوە لە بەردەم دادوەرەکان دا دارکاری بکرێ و نیوەی قژی سەری بتاشرێ.

ماددەی 128: ئەگەر پیاوێ ژنێکی هێنا و گرێبەستی تۆمار نەکرد، ئەم ژنە هاوسەری شەرعی نیە.

ماددەی 129: ئەگەر ژنی پیاوێ بە راکشاوی لە گەڵ پیاوێکی تر دا، گیرا، ئەبێ هەردوکیان پێکەوە ببەسترێنەوە و بهاوێژرێنە ناو ئاوەوە، ئەگەر پیاوەکە ویستی ژیانی ژنەکەی بهێڵێتەوە، شاهیش ژیانی نۆکەرەکەی ئەهێڵێتەوە.

ماددەی 130: ئەگەر پیاوێ کتوپڕ ژنی پیاوێکی تری، کە هێشتا پیاوەکەی نەناسی بێ و، هێشتا لە ماڵی باوکی دا بژی، لە باوەشی دا بینی و لەو کاتەدا گیرا، ئەم پیاوە ئەکوژرێ و ژنەکە بەر ئەدرێ.

ماددەی 131: ئەگەر ژنی پیاوێ لە لایەن پیاوەکەیەوە تۆمەتبار کرا، بەڵام هیچ پیاوێکی بە سەرەوە نەگیرا بو، ئەبێ سوێند بە ژیانی خوا بخوا (سەبارەت بە پاکی خۆی) ئەوسا بڕواتەوە بۆ ماڵی خۆی.

ماددەی 132: ئەگەر پەنجە راکێشرا بۆ ژنی پیاوێ بە هۆی پیاوێکی ترەوە، بەڵام ئەو پیاوەی بە سەرەوە نەگیرا بو، ئەبێ خۆی بهاوێژێتەوە ناو روبارەوە (بۆ سەلماندنی پاکی خۆی) بەرامبەر بە مێردەکەی.

ماددەی 133. أ: ئەگەر پیاوێ بە دیل گیرا و خواردنی تەواو لە ماڵەکەی دا هەبو، ئەبێ ژنەکەی پاکی خۆی لە ماوەی بزربونی مێردەکەی دا بپارێزێ، مافی ئەوەی نیە بچێتە ماڵی پیاوێکی تر.

ماددەی 133. ب: ئەگەر ئەو ژنە پاکێتی خۆی رانەگرت و چوە ماڵی پیاوێکی تر، ئەبێ ئەمە بە سەر ژنەکەدا ئیسپات بکەن و بیهاوێژنە روبارەوە.

ماددەی 134: ئەگەر پیاوێ بە دیل گیرا و خواردنی تەواو لە ماڵەکەی دا نەبو، ژنەکەی چوە ماڵی پیاوێکی ترەوە، ئەم ژنە گوناهی نیە.

ماددەی 135: ئەگەر پیاوێ بە دیل گیرا و خواردنی کافی لە ماڵەکەی دا نەبو، ژنەکەی پێش ئەوەی ئەم بگەڕێتەوە چوە ماڵی پیاوێکی تر و، منداڵی لێی بو، دوای ئەوە مێردەکەی گەڕایەوە و گەیشتەوە شارەکەی، ئەبێ بچێتەوە بۆ لای مێردەکەی، منداڵەکان هەریەکەیان ئەچێتەوە لای باوکی خۆی.

ماددەی 136: ئەگەر پیاوێ شارەکەی ئافەرۆز کرد و هەڵات، ئینجا ژنەکەی چوە ماڵی پیاوێکی تر، ئەگەر ئەم پیاوە گەڕایەوە و ژنەکەی لە ماڵی پیاوێکی تردا گرت، ژنی هەڵاتوەکە نابرێتەوە لای مێردەکەی لە سۆنگەی بوغزاندنی شارەکەی و هەڵاتنی لێی.

ماددەی 137: ئەگەر پیاوێ بڕیاری دا شوگیتومێ کە منالّی لێی بوە تەڵاق بدا، یان نادیتوم تەڵاق بدا کە منالّی بۆ بردوە، ئەبێ جیازییەکانی بدەنەوە و نیوەی بەروبومی کێڵگەکە و باخەکە و نیوەی دارایی گوێزراوەی بدەنێ، ئەبێ ئەویش منالّەکان پەروەردە بکا، پاش پەروەردەکردنی منالّەکانی، ئەبێ میراتی یەککەسسی لە هەمو شتەکانی دراوە بە منالّەکان بدرێتێ و، بۆی هەیە ئەو مێردە هەڵبژێرێ کە حەزی لێیەتی.

ماددەی 138: ئەگەر پیاوێ ویستی ژنەکەی کە منالّی نابێ تەڵاق بدا، ئەبێ بە قەدەر مارەییەکەی پارەی بداتێ و، ئەو جیازییانەی لە ماڵی باوکیەوە هێناوێتی بدرێتەوە، ئینجا تەڵاقی بدا.

ماددەی 139: ئەگەر مارەیی نەبێ، لە بەرامبەر تەڵاقەکەی دا، ئەبێ یەک مەن زیوی بداتێ.

ماددەی 140: ئەگەر پیاوەکە ئاغا بو، ئەبێ سێیەکی مەنێ زیوی بداتێ ئەوسا تەڵاقی بدا.

ماددەی 141: ئەگەر ژنی پیاوێ بڕیاری دا لە ماڵی مێردەکەی بڕوا و، کارێکی کرد ماڵەکەی تێک بدا و، لە پایەی مێردەکەی دابەزێنێ، ئەبێ ئەوەی لە سەر بسەلمێنرێ، ئەگەر مێردەکەی ویستی تەڵاقی بدا، ئەتوانێ تەڵاقی بدا و پارەی تەڵاقەکەی نەداتێ، وە ئەگەر مێردەکەی وتی تەڵاقی نادا، مێردەکەی ئەتوانێ ژنێکی تر بهێنێ و، ژنەکەی تری وەکو کەنیزەک لە ماڵی مێردەکەی دا بژی.

ماددەی 142: ئەگەر ژنێ رقی لە مێردەکەی بو، پێی وت: "توخنم مەکەوە"، لە بەڕێوەبەرایەتی شارەکەدا رەفتاری هەڵئەسەنگێنرێ، ئەگەر سەلار بو و هیچ چەوتیەکی نەکرد بو، لە کاتێک دا مێردەکەی زۆر لە ماڵ دەربچێ و لە پایەی ئەم کەم بکاتەوە، ئەو ژنە گوناهی نیە و، ئەتوانێ جیازییەکانی کە لە ماڵی باوکیەوە لە گەڵ خۆی هێناوێتی بباتەوە و بڕواتەوە بۆ ماڵی باوکی.

ماددەی 143: ئەگەر سەلار نەبێ و زۆر دەربچێ و ببوە ماڵەکەی تێک بدا و لە پایەی مێردەکەی دابەزێنێ، ئەبێ ژنەکە بهاوێژنە ناو ئاوی روبارەکەوە.

ماددەی 144: ئەگەر پیاوێ کاهینەی نادیتومی کردە هاوسەری و ئەم نادیتومە کەنیزەکێکی دا بە مێردەکەی و، ئەوەش بو بە هۆی ئەوەی ببێتە خاوەن منالّ، ئەگەر پیاوەکە ویستی شوگیتوم بە هاوسەر بگرێ، رێی پێ نادرێ و نابێ شوگیتوم بهێنێ.

ماددەی 145: ئەگەر پیاوێ کاهینەی نادیتومی هێنا، بەڵام منالّی بۆ نەهێنا، ویستی شوگیتوم بە هاوسەر بگرێ، ئەتوانێ شوگیتوم بهێنێ و بیباتە ماڵەکەی خۆی، نابێ ئەم شوگیتومە خۆی لە گەڵ کاهینەی نادیتوم بە یەکسان دابنێ.

ماددەی 146: ئەگەر پیاوێ کاهینەی نادیتومی کردە هاوسەری و نادیتوم کەنیزەکێکی بە مێردەکەی بەخشی، منالّی لێی بو، ئەوسا کەنیزەکەکە خۆی بە یەکسان دانا لە گەڵ ئاغاژنەکەدا، بە هۆی منالّبونیەوە ئاغاژنەکەی بۆی نیە بە پارە بیفرۆشێ، بەڵام بۆی هەیە نیشانەی کۆیلەیەتی لە سەر دابنێ و بە کەنیزەکی بژمێرێ.

ماددەی 147: ئەگەر کەنیزەکەکە منالّی نەبو، ئاغاژنەکەی مافی هەیە بە پارە بیفرۆشێ.

ماددەی 148: ئەگەر پیاوێ ژنێکی هێنا و نەخۆشیەکی سەختی گرت، ئەگەر ویستی ژنی دووەم بهێنێ، ئەتوانێ بیهێنێ بەڵام نابێ ژنەکەی کە گرفتاری نەخۆشی سەخت بوە تەڵاق بدا. بۆی هەیە لەو ماڵەدا نیشتەجێ بێ کە دروستی کردوە، تا زیندو بێ ئەبێ مێردەکە ئەرکی هەڵبگرێ.

ماددەی 149: ئەگەر ئەو ژنە ئارەزوی نەکرد لە ماڵی مێردەکەی دا بژی (پاش ئەوەی ژنێکی تری هێناوە) ئەبێ ئەو جیازییانەی بدرێتەوە کە لە ماڵی باوکیەوە هێناویێتی و ئەتوانێ بڕوا.

ماددەی 150: ئەگەر پیاوێ کێڵگەیەک یا باخێک یا داراییەکی گوێزراوەی بە دیاری دا بە ژنەکەی و لە سواڵەتێکی مۆرکراودا تۆماری کرد، پاش مردنی مێردەکەی منداڵەکانی مافی داواکردنیان نیە (ئەوەی مێردەکەی بە دیاری داویێتی) ، دایکەکە دوای ئەوە ئەتوانێ (داراییەکەی) بدا بە کوڕە خۆشەویستەکەی و نابێ بیداتە کەسێکی بێگانە.

ماددەی 151: ئەگەر ژنێ لە ماڵی پیاوێک دا بژی (وەکو هاوسەر) و لە گەڵ مێردەکەی ڕێکەوت و گرێبەستێکی لە گەڵ تۆمار کرد کە خاوەن قەرزی مێردەکەی مافی ئەوەی نیە ئەم بدا (بە کەفیل یا بە بارمتە)، ئەگەر قەرزێ لە سەر ئەم پیاوە بوبێ پێش ئەوەی ئەم ژنە بە هاوسەر بگرێ، خاوەن قەرز هەرگیز بۆی نیە ژنەکەی بدا، یان ئەگەر قەرزێ لە سەر ئەو ژنە بوبێ پێش ئەوەی بچێتە ماڵی پیاوەکەی (مێردەکەی)، خاوەن قەرزەکە هەرگیز مافی نیە مێردەکە (بە بارمتە) بگرێ.

ماددەی 152: ئەگەر قەرزێ کەوتە سەر هەردوکیان (مێرد و ژنەکە) پاش چونی ژنەکە (هاوسەر) بۆ ماڵی پیاوەکە (مێرد)، پێویستە هەردوکیان پێکەوە قەرزەکە بدەنەوە.

ماددەی 153: ئەگەر هاوسەری پیاوێ، لە پێناوی پیاوێکی تردا، بو بە هۆی مردنی مێردەکەی، ئەبێ ئەم ژنە بخرێتە سەر قازوخ.

ماددەی 154: ئەگەر پیاوێ لاقەی کچەکەی خۆی کرد، ئەبێ ئەم پیاوە شاربەدەر بکرێ.

ماددەی 155: ئەگەر پیاوێ بوکی بۆ کوڕەکەی هەڵبژارد، کوڕەکەی لە گەڵی جوت بو، دوای ئەوە پیاوەکەیان (باوکی مێردەکەی) گرت لە باوەشی کچەکەدا نوست بو، ئەبێ ئەم پیاوە ببەستنەوە و بیهاوێژنە ناو ئاوەوە.

ماددەی 156: ئەگەر پیاوێ بوکی بۆ کوڕەکەی هەڵبژارد، بەڵام کوڕەکەی لە گەڵی جوت نەبوبو، ئەم لە باوەشی دا نوست، ئەبێ نیو مەن زیوی بداتێ و هەرچیەکی لە ماڵی باوکیەوە هێنابێ بۆی بگێڕێتەوە، مافی هەیە ئەو مێردە هەڵبژێرێ کە خۆی حەزی لێیەتی.

ماددەی 157: ئەگەر پیاوێ پاش مردنی باوکی لە باوەشی دایکی دا نوست، ئەبێ هەردوکیان بسوتێنن.

ماددەی 158: ئەگەر پیاوێ پاش مردنی باوکی لە باوەشی باوەژنەکەی دا گیرا، ئەبێ ئەم پیاوە لە ماڵی باوکی دەربکرێ.

ماددەی 159: ئەگەر پیاوێ دیاریی خوازبێنی هێنا بۆ ماڵی خەزوری و مارهییەکەی دا، دوای ئەوە سەیری ژنێکی تری کرد و بە خەزوری وت: : "کچەکەی تۆ ناهێنم". باوکی کچەکە بۆی هەیە هەمو ئەو شتانە بدا کە زاوا لە گەڵ خۆی هێنا بونی.

ماددەی 160: ئەگەر پیاوێ دیاریی خوازبێنی هێنا بۆ ماڵی خەزوری و مارهییەکەی دا، ئینجا باوکی کچەکە وتی: "کچەکەی خۆمت نادەمێ". ئەبێ خەزوری دو قاتی هەمو ئەو شتانەی بۆ زاوا بگێڕێتەوە کە لە گەڵ خۆی هێنابونی.

ماددەی 161: ئەگەر پیاوێ دیاریی خوازبێنی هێنا بۆ ماڵی خەزوری و مارەییەکەی دا، دوای ئەوە هاوەڵەکەی داوێنپیسی لە گەڵ کرد، ئەگەر خەزوری بە مێردی ژنەکەی (زاواکەی) وت: "کچەکەم ناکەم بە هاوسەرت"، ئەبێ خەزوری دوقاتی هەمو ئەو شتانەی بداتێ کە لە گەڵ خۆی هێنابونی، بۆ هاوەڵەکەشی نیە ژنەکەی بهێنێ.

ماددەی 162: ئەگەر پیاوێ هاوسەری گرت و منالی لێی بو، ئینجا ئەم ژنە مرد، باوکی مافی ئەوەی نیە داوای ئەو جیازییە بکا (کە لە ماڵی باوکیەوە هێنا بونی)، چونکە جیازییەکە ئەگەڕێتەوە بۆ منالەکانی.

ماددەی 163: ئەگەر پیاوێ هاوسەری گرت و منالی لێی نەبو، ئینجا ئەم ژنە مرد، ئەگەر خەزوری مارەییەکەی هێنا بوەوە بۆ ماڵی خۆی، مێردەکەی مافی ئەوەی نیە داوای جیازییەکانی ئەم ژنە بکا (کە لە ماڵی باوکی هێنا بونی) چونکە جیازییەکانی هی ماڵی باوکێتی.

ماددەی 164: ئەگەر خەزوری مارەییەکەی بۆ نەگێڕایەوە، ئەتوانێ بە قەدەر چەرخەی مارەییەکە لە جیازییەکە هەڵبگرێ و پاشماوەی جیازییەکە بگێڕێتەوە بۆ ماڵی باوکی (ژنە مردوەکە).

ماددەی 165: ئەگەر پیاوێ کێڵگەیەک یا باخێک یا خانویەکی بەخشی بە کوڕە خۆشەویستەکەی، نامەی لە سەر سواڵەتێکی مۆرکراو نوسی، کاتێ براکان، دوای مردنی باوکیان، (کەلەپورەکەی) دابەش ئەکەن، ئەبێ ئەو دیاریە هەڵبگرێ کە باوکی داوێتێ، سەرەڕای ئەوەش ئەبێ دارایی ماڵی باوک بە یەکسانی دابەش بکەن.

ماددەی 166: ئەگەر پیاوێ ژنی بۆ کوڕەکانی هێنا، بەڵام ژنی بۆ کوڕە بچوکەکەی نەهێنا بو، کاتێ براکان (کەلەپورەکە) دوای مردنی باوکیان دابەش ئەکەن، پێویستە لە سەریان پارەی مارەیی هاوسەرگیری بۆ برا بچوکەکەیان کە پێشتر ژنی نەهێناوە لێ دەربهێنن و بیدەنێ، سەرەڕای بەشەکەی خۆی، بۆ ئەوەی بتوانێ هاوسەرگیری بکا.

ماددەی 167: ئەگەر پیاوێ ژنی هێنا و منالی لێی بو، ئینجا ئەو ژنە مرد، دوای ئەو ژنێکی تری هێنا و منالی لێی بو، ئەوسا باوکەکە مرد، کوڕەکان لە سەر بنچینەی دایکەکان (کەلەپورەکە) دابەش ناکەن، ئەبێ جیازیی دایکیان (کوڕانی هەر دایکێ بە جیا) هەڵبگرن، ئەوسا دارایی ماڵی باوکیان بە یەکسانی دابەش بکەن.

ماددەی 168: ئەگەر پیاوێ بڕیاری دا کوڕەکەی لە میرات بێبەش بکا و، بە دادوەرەکانی وت: "ئەمەوێ کوڕەکەم لە میرات بێبەش بکەم"، ئەبێ دادوەرەکان ڕەفتاری هەڵبسەنگێنن، ئەگەر کوڕەکەی گوناهێکی گەورەی وای نەکردبێ شایانی بێبەشکردن بێ، باوکەکە بۆی نیە کوڕەکەی لە میراتەکەی بەشبڕاو بکا.

ماددەی 169: ئەگەر کوڕەکە گوناهێکی گەورەی کرد شایانی بێبەشکردنی بێ لە کەلەپور، ئەبێ جاری یەکەم لێی ببورن، ئەگەر بۆ جاری دوەم گوناهێکی گەورەی کرد، باوک بۆی هەیە کوڕەکەی لە میراتەکەی بەشبڕاو بکا.

ماددەی 170: ئەگەر پیاوێ لە هاوسەرە (ئەسڵیەکەی) منالی بو، هەروەها لە کەنیزەکەکەی منالی بو، ئەگەر باوکەکە لە ژیانی خۆی دا بەو منالانەی کە لە کەنیزەکەکە بویەتی وتی: "ڕۆڵەکانم" و، لە گەڵ منالەکانی هاوسەرە ئەسڵەیەکەی ژماردن، پاش مردنی باوک، منالانی هاوسەرە ئەسڵیەکە و منالانی کەنیزەکەکە دارایی ماڵی باوک بە یەکسانی دابەش ئەکەن و، جێگرەوەکەی، کوڕی هاوسەرە ئەسڵیەکە، بەشی خۆی هەڵئەبژێرێ و ئەیبا.

ماددەی 171: ئەگەر باوک لە ژیانی خۆی دا بەو منداڵانەی کە لە کەنیزەکەکەی بوە ئەوتبێ: "رۆڵەکانم"، پاش مردنی باوکەکە، منداڵانی کەنیزەکەکە لە گەڵ منداڵانی هاوسەرە ئەسڵیەکە دارایی ماڵی باوکیان دابەش ناکەن. ئەبێ ئازادی ببەخشرێ بە کەنیزەکەکە و منداڵەکانی، منداڵانی هاوسەرە ئەسڵیەکە مافی ئەوەیان نیە منداڵانی کەنیزەکەکە بە کۆیلە دابنێن. هاوسەرەکە (ئەسڵیەکە) جیازییەکەی (کە لە ماڵی باوکیەوە هێناویێتی) وەرئەگرێتەوە و، ئەو دیارییەی کە مێردەکەی پێی بەخشیوە و سواڵەتێکی مۆرکراوی بۆ نوسیوە، مافی ئەوەی هەیە لە ماڵی مێردەکەی دا بژی و، ئەتوانێ تا لە ژیان دا بمێنێ کەڵکی لێ وەربگرێ، بەڵام مافی نیە بیفرۆشێ چونکە دوای ئەو ئەگەڕێتەوە بۆ کوڕەکانی.

ماددەی 172: ئەگەر مێردەکەی (لە ژیانی خۆی دا) دیاریی هاوسەرگیری نەدابویە، ئەبێ بەو جیازییە قەرەبوی بکەنەوە (کە لە ماڵی باوکیەوە هێناویێتی)، بۆی هەیە وەکو یەکێ لە وەرەسە پشکێ لە دارایی ماڵی مێردەکەی وەربگرێ. ئەگەر کوڕەکانی بەدرەفتارییان لە گەڵ کرد بۆ ئەوەی لە ماڵەکە دەری بکەن، ئەبێ دادوەرەکان لە پرسەکەی بپێچنەوە و بڕیاری سزادانی کوڕەکان بدەن، ئەم ژنە لە ماڵی مێردەکەی دەرناکرێ، بەڵام ئەگەر ئەو ژنە بڕیاری دەرچونی دا (لە ماڵی مێردەکەی)، ئەبێ ئەو دیارییەی مێردەکەی داویێتی بۆ کوڕەکانی بەجێ بهێڵێ، بۆی هەیە جیازییەکەی ماڵی باوکی بباتەوە. ئەوسا ئەتوانێ ئەو مێردە هەڵبژێرێ کە خۆی ئارەزوی لێیەتی.

ماددەی 173: ئەگەر ئەو ژنە لەو ماڵەدا کە بۆی چوە منداڵی لە دوامێردی بو، دوای مردنی ئەو ژنە منداڵانی پێشوی و منداڵانی دوایی جیازییەکەی دابەش ئەکەن.

ماددەی 174: ئەگەر لە دوامێردی منداڵی نەبو، منداڵانی مێردی پێشو دیاریەکەی ئەبەن.

ماددەی 175: ئەگەر کۆیلەی کۆشک یا کۆیلەی ئاغا کچی پیاوێکی (ئازاد) ی هێنا و، ژنەکە منداڵی بو، خاوەنی کۆیلە بۆی نیە داوا بکا منداڵانی کچی پیاوە ئازادەکە ببنە کۆیلەی.

ماددەی 176. أ: ئەگەر کۆیلەی کۆشک یا کۆیلەی ئاغا کچی پیاوێکی ئازادی هێنا، لە سەردەمی هاوسەرگیری دا، بە جیازییەکانی ماڵی باوکیەوە چوە ماڵی کۆیلەی کۆشک یا کۆیلەی ئاغا، پاش ئەوەی پێکەوە ژیان و پێکەوە خانویان کرد و کەلوپەلیان ساز کرد، پاش ئەوە کۆیلەی کۆشک یا کۆیلەی ئاغا مرد، کچی پیاوە ئازادەکە ئەتوانێ جیازییەکەی وەربگرێتەوە. ئەوەش کە بەیەکەوە ژنەکە و مێردەکەی پێکیانەوە ناوە لەو کاتەوە پێکەوە ژیاون بکەن بە دو بەشەوە، خاوەن کۆیلە نیوەی ئەبا و کچی پیاوە ئازادەکەش نیوەکەی تری بۆ منداڵەکانی ئەبا.

ماددەی 176.ب: ئەگەر کچی پیاوە ئازادەکە جیازیی نەبوبێ، ئەبێ هەمو ئەو شتانەی ئەو و مێردەکەی لەو کاتەوە پێکەوە ژیاون پێکیانەوە ناوە بکەن بە دو بەشەوە، خاوەن کۆیلە نیوەی ئەبا و کچی پیاوە ئازادەکەش نیوەکەی تری بۆ منداڵەکانی ئەبا.

ماددەی 177: ئەگەر بێوەژنێ کە هێشتا منداڵەکانی وردن، بچێتە ماڵەمێردی دوەم، مافی ئەوەی نیە بێ ئاگاداری دادوەر. کاتێ ئەچێتە ماڵی مێردی دوەم، دادوەرەکان ئەبێ لە هەلومەرجی ماڵی مێردی پێشوی بکۆڵنەوە و، بەرپرسیارێتی ماڵی مێردی پێشوی بەو ژنە و بە مێردەکەی ئێستای بسپێرن و داوایان لێ بکەن لە سواڵەتێک دا بەڵێن بدەن کە پارێزگاری ماڵەکە و

پەروەردەی منالّەکە بکەن، بۆیان نیە کەلوپەلی مالّەکە بە پارە بفرۆشن. ئەو کڕیارەی کەلوپەلی منالّانی بێوەژنەکە بکڕێ پارەکەی ئەدۆڕێنێ و کەلوپەلەکان ئەدرێتەوە بە خاوەنەکەی.

مادەی 178: ئەگەر کاهینەی نینتوم یا نادیتوم یا یەکێ لە حەریمەکانی کۆشک، باوکی دیاریەکی دابویە و لە سەر سوالّەتێ بۆی تۆمار کرد بو، بەلّام لەو سوالّەتە نوسراوەدا مافی ئەوەی پێ نەدابو بەرپرسیارێتی دیاریەکە بدا بەوەی خۆی ئەیەوێ و ئازادی بەکارهێنانی نەدابویە، پاش مردنی باوکی، براکانی کێلّگەکەی و باخەکەی وەرئەگرن و خواردن و رۆن و جلوبەرگی بە قەدەر بەشەکەی ئەدەنێ و رازی ئەکەن. ئەگەر براکانی خواردن و رۆن و جلوبەرگی بە قەدەر بەشەکەی خۆی ئەدەنێ و رازییان نەکرد، بۆی هەیە کێلّگە و باخەکەی بسپێرێ بەو جوتکارەی خۆی بە دلّیەتی، ئەو جوتکارەش ئەبێ بیژێنێ. بە درێژایی ژیانی بۆی هەیە کەلّک وەربگرێ لە کێلّگە و باخ و هەر شتێکی تری کە باوکی دابێتێ، بەلّام بۆی نیە بە پارە بیانفرۆشێ، یا لە باتی بژاردنی قەرزی یەکێکی تر بە کاریان بهێنێ، دوای ئەو میراتەکە ئەبێ بە هی براکانی.

مادەی 179: ئەگەر کاهینەی نینتوم یا نادیتوم یا یەکێ لە حەریمەکانی کۆشک، کە باوکی دیاریەکی دابویە و لە سەر سوالّەتێ بۆی تۆمار کرد بو، بەلّام لەو سوالّەتە نوسراوەدا مافی ئەوەی پێ دابو بەرپرسیارێتی دیاریەکە بدا بەوەی خۆی ئەیەوێ و ئازادی بەکارهێنانی دابویە، پاش مردنی باوکی، مافی ئەوەی هەیە بەرپرسیارێتی میراتەکەی بەو کەسە بسپێرێ کە خۆی بە دلّیەتی و، براکانی بۆیان نیە بەرهەلّستی ئەوە بکەن.

مادەی 180: ئەگەر باوک دیاری نەبەخشی بە کچەکەی، کە نادیتومی نیشتەجێی دێر یا یەکێ لە حەریمەکانی کۆشکە، پاش مردنی باوک، مافی هەیە وەکو یەکێ لە وەرەسە لە کاتی دابەشکردنی دارایی مالّی باوکی دا بەشی خۆی وەربگرێ و بۆی هەیە بە درێژایی ژیانی کەلّکی لێ وەر بگرێ، دوای ئەوە میراتەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ براکانی.

مادەی 181: ئەگەر باوکێ کچەکەی وەکو نادیتوم یا کادیشتوم (پلەیەکی ئاینیی ژنانی ناو پەرستگاکان بوە) یا کولماشیتوم (پلەیەکی ئاینیی ژنانی ناو پەرستگاکان بوە) پێشکەشی خوا بکا، بەلّام دیاری نەدانێ، پاش مردنی باوک، مافی هەیە سێیەکی میراتەکەی لە دارایی مالّی باوکی بپا و بە درێژایی ژیانی کەلّکی لێ وەربگرێ، دوای مردنی ئەمیش میراتەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ براکانی.

مادەی 182: ئەگەر باوکێ دیاری نەدا بە کچەکەی کە نادیتومی خوا مەردوخ، خوای شاری بابل، بێ، سوالّەتێکی مۆرکراوی بۆ نەنوسی، پاش مردنی باوکی، مافی هەیە لە کاتی دابەشکردنی دارایی مالّی باوکی دا لە گەلّ براکانی دا سێیەکی میراتەکەی بپا بۆ خۆی، بەرامبەر بەوەش هیچ خزمەتێ پێشکەش ناکا. نادیتومی خوا مەردوخ مافی ئەوەی هەیە بەرپرسیارێتی میراتەکەی بەو کەسە بسپێرێ کە خۆی ئەیەوێ.

مادەی 183: ئەگەر باوکێ دیاری بەخشی بە کچەکەی کە شوگیتوم (پلەیەکی ئاینیی ژنانی ناو پەرستگاکان بوە) بێ و، دای بە شو، بەوەش سوالّەتی مۆرکراوی بۆ نوسی، پاش مردنی باوک، دارایی مالّی باوکی لە گەلّ براکانی دابەش ناکا.

ماددەی 184: ئەگەر باوکێ دیاری بە کچەکەی کە شوگیتوم بێ نەبەخشی و نەیدا بە شو، پاش مردنی باوک، پێویستە براکانی ئەوەندەی دارایی ماڵی باوکی ڕێ ئەدا دیاری بدەنێ و، بیدەن بە شو.

ماددەی 185: ئەگەر پیاوێ منالێکی هەڵگرتەوە تا بە ناوی خۆیەوە ناوی بنێ و پەروەردەی کرد، ئەو منالە هەڵگیراوەیە داوا ناکرێتەوە.

ماددەی 186: ئەگەر پیاوێ منالێکی هەڵگرتەوە و کاتێ بردیەوە ماڵەکەی خۆی، منالە هەڵگیراوەکە بە دوای دایک و باوکی دا گەڕا، ئەبێ ئەو هەڵگیراوەیە بگەڕێتەوە بۆ ماڵی باوکی.

ماددەی 187: کوڕی کەسێکی سەر بە کۆشک کە نیشتەجێی کۆشک بێ (هەڵگیراوە) هەروەها کوڕی حەریمی کۆشک (هەڵگیراوە) داوای گێڕانەوەی ناکرێ.

ماددەی 188: ئەگەر پیشەکارێ منالێکی هەڵگرتەوە تا پەروەردەی بکا و فێری ئیشی دەستیی خۆی کرد، داوای ناکرێتەوە.

ماددەی 189: ئەگەر پیشەکار ئیشە دەستیەکەی خۆی فێر نەکرد، ئەو منالە هەڵگیراوەیە، مافی هەیە بگەڕێتەوە بۆ ماڵی باوکی.

ماددەی 190: ئەگەر پیاوێ ئەو منالەی کە هەڵی گرتۆتەوە کە لە گەڵ منالەکانی خۆی پەروەردەی کردوە بەڵام بە یەکێ لەوانی دانەنا، ئەو هەڵگیراوەیە مافی هەیە بگەڕێتەوە ماڵی باوکی.

ماددەی 191: ئەگەر پیاوێ منالێکی هەڵگرتەوە و پەروەردەی کرد و خانویەکی بۆ دروست کرد و بو بە خاوەنی منال، ئەوسا پیاوەکە بڕیاری دا واز لە منالە هەڵگیراوەکە بهێنێ، ئەو منالە بە دەستی خاڵی ناڕوا، ئەبێ ئەو باوکەی پەروەردەی کردوە سێیەکی میراتەکەی لە دارایی بداتێ ئینجا بڕوا، هیچ بەشێکی لە کێڵگە و باخ و ماڵ ناداتێ.

ماددەی 192: ئەگەر منالی کەسێکی سەر بە کۆشک یا کوڕی حەریمی کۆشک (هەڵگیراوە) بە باوکی وت کە بە خێوی کردوە یا بە دایکی وت کە بە خێوی کردوە: "تۆ باوکم نیت"، یا "تۆ دایکم نیت" ئەبێ زمانی ببڕن.

ماددەی 193: ئەگەر کوڕی کەسێکی سەر بە کۆشک یا کوڕی حەریمی کۆشک ماڵی باوکی نەسڵی خۆی دۆزیەوە و، ڕقی لەو باوکەی بو کە بەخێوی کردوە و لەو دایکەی کە بەخێوی کردوە و، گەڕایەوە بۆ ماڵی باوکی نەسڵی، ئەبێ چاوی دەربهێنن.

ماددەی 194: ئەگەر پیاوێ کوڕی دا بە دایەنێ و، ئەم کوڕە بە دەستی دایەنەکە مرد. دایەنەکە بێ ئاگاداری دایک و باوکی ئەم شیری دابو بە منالێکی تر، ئەگەر ئەوە بسەلمێنن، کە بەڵێنی داوە بێ ئاگاداری دایک و باوکی (منالە مردوەکە) شیر بدا بە منالێکی تر، ئەبێ مەمکی ببڕن.

ماددەی 195: ئەگەر کوڕێ لە باوکی دا ئەبێ دەستی ببڕن.

ماددەی 196: ئەگەر پیاوێ چاوی پیاوێکی تری کوێر کرد ئەبێ چاوی کوێر بکەنەوە.

ماددەی 197: ئەگەر پیاوێ ئێسکی پیاوێکی تری شکاند ئەبێ ئێسقانی بشکێننەوە.

ماددەی 198: ئەگەر پیاوێ چاوی ئاغای کوێر کرد یان ئێسقانی ئاغای شکاند ئەبێ یەک مەن زیو بدا.

ماددەی 199: ئەگەر پیاوێ چاوی کۆیلەی پیاوێکی دەرهێنا یا ئێسقانی کۆیلەی پیاوێکی شکاند، ئەبێ نیوەی نرخەکەی بدا.

ماددەی 200: ئەگەر پیاوێ ددانی پیاوێکی لە چینەکەی خۆی دەرهێنا ئەبێ دانی دەربهێننەوە.

ماددەی 201: ئەگەر پیاوێ ددانی ئاغایەکی دەرهێنا ئەبێ سێیەکی مەنێ زیو بدا.

مادەی 202: ئەگەر پیاوێ زللە لە روومەتی پیاوێکی لە خۆی بەرزتر بدا، ئەبێ بە ئاشکرا شەست جەلدەی بە قامچی کلکی گا لێ بدرێ.

مادەی 203: ئەگەر پیاوێ زللەی لە پیاوێکی تردا هاوتای خۆی بێ، ئەبێ یەک مەن زیو بدا.

مادەی 204: ئەگەر ئاغایەک زللەی لە ئاغایەکی تر دا ئەبێ دە شیقلی بداتێ.

مادەی 205: ئەگەر کۆیلەی پیاوێک زللەی لە روومەتی یەکێ دا، گوێی ئەبڕدرێ.

مادەی 206: ئەگەر پیاوێ لە پیاوێکی تری دا لە شەڕدا بوو بە هۆی بریندار بوونی، ئەبێ پیاوەکە سوێند بخوا: "بە ئەنقەست لێم نەداوە" و، ئەبێ پارەی چارەسەرەکەی بدا بە پزیشک.

مادەی 207: ئەگەر پیاوەکە بە لێدانەکەی مرد، ئەبێ سوێند بخوا کە لێدانەکەی بە ئەنقەست نەبوە، ئەگەر کوڕی پیاوێکی ئازاد بێ ئەبێ نیو مەن بدا.

مادەی 208: ئەگەر پیاوەکە کوڕی ئاغا بێ ئەبێ سێیەکی مەنێ زیو بدا.

مادەی 209: ئەگەر پیاوێ لە کچی پیاوێکی تری دا بوو بە هۆی بەر فڕێ دانی ئەبێ دە شیقل زیو بدا بە هۆی بەراوێتە کردنەکەوە.

مادەی 210: ئەگەر ئەو ژنە مرد (کچی پیاوەکە) ئەبێ کچەکەی بکوژرێتەوە.

مادەی 211: ئەگەر کچی ئاغا بە هۆی لێدانەوە بەراوێتە بوو پێویستە ئەوەی لێی داوە پێنج شیقلی زیو بدا.

مادەی 212: ئەگەر ئەو ژنە مرد، ئەبێ نیو مەن زیو بدا.

مادەی 213: ئەگەر پیاوێ لە کەنیزەکێکی دا و، بوو بە هۆی بەراوێتەبوونی ئەبێ دوو شیقل زیو بدا.

مادەی 214: ئەگەر ئەو کەنیزەکە مرد، ئەبێ سێیەکی مەنێ زیو بدا.

مادەی 215: ئەگەر پزیشکێ بە چەقۆ نەشتەرکاری بۆ پیاوێ کرد و ژیانی پیاوەکەی رزگار کرد، یا کالانەی چاوی پیاوێکی بە نەشتەر کردەوە و چاوی پیاوەکەی رزگار کرد، ئەبێ دە شیقل زیو بە پزیشکەکە بدرێ.

مادەی 216: ئەگەر پیاوەکە ئاغا بوو، ئەبێ پێنج شیقل زیوی بداتێ.

مادەی 217: ئەگەر کۆیلەی پیاوێ بێ، ئەبێ خاوەنی کۆیلەکە، دوو شیقل زیو بدا بە پزیشکەکە.

مادەی 218: ئەگەر پزیشکێ بە چەقۆ نەشتەرکاری بۆ پیاوێ کرد، بوو بە هۆی مردنی پیاوەکە، یا کالانەی چاوی کردەوە و چاوی کوێر کرد، ئەبێ دەستی ببڕدرێ.

مادەی 219: ئەگەر پزیشکێ بە چەقۆ نەشتەرکاری بۆ کۆیلەی ئاغایەک کرد و بوو بە هۆی مردنی، ئەبێ کۆیلەیەک بە کۆیلەیەک بژێردرێ.

مادەی 220: ئەگەر پزیشکێ کالانەی چاوی بە نەشتەر کردەوە (هی کۆیلە) و چاوی کوێر کرد، ئەبێ نیوەی نرخەکەی بە زیو بدا.

مادەی 221: ئەگەر پزیشکێ ئێسکی شکاوی پیاوێکی گرتەوە، یا ماسولکەیەکی برینداری چاک کردەوە، بریندارەکە ئەبێ پێنج شیقلی زیو بدا بە پزیشکەکە.

مادەی 222: ئەگەر بەرکەوتوو ئاغا بوو ئەبێ سێ شیقلی زیو بدا.

مادەی 223: ئەگەر بریندارەکە کۆیلەی پیاوێ بێ ئەبێ خاوەنی کۆیلەکە دە شیقلی زیو بدا بە پزیشکەکە.

مادەی 224: ئەگەر پزیشکێ گا یا کەرێکی تیمار کرد برینێکی گەورەی گا یا کەرێکی چاک کردەوە، خاوەن گا یا کەر ئەبێ شەشیەکی زیو هەقدەستەکەی بداتێ.

مادەی 225: ئەگەر پزیشکێ برینی گەورەی گا یا کەرێکی تیمار کرد و بوو بە هۆی مردنی ئەبێ پێنجیەکی نرخەکەی بدا بە خاوەنی گا یا کەرەکە.

ماددەی 226: ئەگەر سەرتاشێ سەری کۆیلەیەکی، بێ ئاگاداری خاوەنەکەی، بە جۆرێ تاشی زەحمەت بێ بناسرێتەوە، ئەبێ هەردو دەستی سەرتاشەکە ببڕن.

ماددەی 227: ئەگەر پیاوێ سەرتاشێکی ناچار کرد یا هەڵخەڵەتان سەری کۆیلەکە بگۆڕێ بە جۆرێ کە نەناسرێتەوە ئەبێ ئەو پیاوە بکوژرێ و لە بەر دەرگای ماڵەکەی دا هەڵبواسرێ. ئەبێ سەرتاشەکەش سوێند بخوا کە بە ئەنقەست سەری نەتاشیوە، ئەوسا رێگە بدرێ.

ماددەی 228: ئەگەر بەنایەک خانوی بۆ پیاوێ دروست کرد و تەواوی کرد، ئەبێ خاوەن ماڵ دو شیقلی زیو پاداش بە هەر سارێ (ئەندازەیەکی پێوان بوە) لە پانتایی خانوەکە بدا بە بەناکە.

ماددەی 229: ئەگەر بەنایەک خانویەکی بۆ پیاوێ دروست کرد، کارەکەی باش نەبو، خانوەکە روخا و، بوە هۆی کوشتنی خاوەن ماڵ، ئەبێ ئەو بەنایە بکوژرێ.

ماددەی 230: ئەگەر بو بە هۆی کوشتنی کوڕی خاوەن ماڵ ئەبێ کوڕی بەناکە بکوژرێتەوە.

ماددەی 231: ئەگەر بو بە هۆی کوشتنی کۆیلەی خاوەن ماڵ ئەبێ کۆیلەیەک وەکو کۆیلە کوژراوەکە بدا بە خاوەن ماڵ.

ماددەی 232: ئەگەر کەلوپەلی خاوەن ماڵ فەوتا ئەبێ شتە فەوتاوەکان بێژێردرێ. لە سۆنگەی روخانی ئەو خانوەی دروستی کردوە و بەرگەی نەگرتوە، ئەبێ بە دارایی تایبەتی خۆی خانوە روخاوەکە دروست بکاتەوە.

ماددەی 233: ئەگەر بەنایەک خانویەکی بۆ پیاوێ دروست کرد، کارەکەی بە پێی مەرجەکان نەبو، دیوارەکە درزی برد، ئەبێ بەناکە بە دارایی تایبەتی خۆی دیوارەکە چاک بکاتەوە.

ماددەی 234: ئەگەر بەلەمەوانێ کونوکەلەبەری بەلەمی پیاوێکی گرت کە قەوارەکەی شەست کور بێ، خاوەن بەلەم ئەبێ دە شیقلی زیو پاداشتی بداتێ.

ماددەی 235: ئەگەر بەلەمەوانێ کونوکەلەبەری بەلەمی پیاوێکی گرت، بەڵام کارەکەی رێکوپێک نەبو، هەمان ساڵ بەلەمەکە درزی تێ بو، ئەوەش زیانی لێ کەوتەوە، بەلەمەوان ئەبێ بەلەمەکە بە دارایی تایبەتی خۆی چاک بکاتەوە، بەلەمە چاککراوەکە بگێڕێتەوە بۆ خاوەن بەلەم.

ماددەی 236: ئەگەر پیاوێ بەلەمێکی بە کرێ دا بە بەلەمەوانێ بەڵام بەلەمەوانەکە کەمتەرخەم بو نقوم بو یا بەلەمەکە فەوتا، ئەبێ بەلەمەوانەکە بەلەمێ بۆ خاوەن بەلەم بێژێرێ.

ماددەی 237: ئەگەر پیاوێ بەلەمەوان و بەلەمێکی بە کرێ گرت و جۆ و خوری و رۆن و خورما یا هەر کەلوپەلێکی تری لێ بار کرد، بەلەمەوانەکە کەمتەرخەم بو بەلەمەکە نقوم بو، بو بە هۆی فەوتانی بارەکە، بەلەمەوانەکە ئەبێ ئەو بەلەمە کە نوقمی کردوە و ئەو شتانەی کە لە ناوی دا بوە و بۆتە هۆی فەوتانی بێژێرێ.

ماددەی 238: ئەگەر بەلەمەوانێ بەلەمی پیاوێکی نوقم کرد، ئینجا دەری هێنایەوە (لە ئاوەکە) ئەبێ نیوەی نرخەکەی بە زیو بدا.

ماددەی 239: ئەگەر پیاوێ بەلەمەوانێکی بە کرێ گرت، ئەبێ شەش کور دانەوێڵەی لە ساڵێک دا بداتێ.

ماددەی 240: ئەگەر بەلەمێ کە بە سەوڵ ئەڕوا بەر بەلەمێ کەوت کە بە تەوژمی ئاو ئەڕوا، بەلەمەکەی کە بە تەوژمی ئاو ئەڕوا نقوم بو، لە سەر خاوەنی بەلەمەکە، کە بەلەمەکەی نقوم بوە، ئەو شتانەی کە لە ناو بەلەمەکەدا بون و فەوتاون، لە بەردەم خوادا دەربخا وە لە سەر ئەو بەلەمەوانە پێویستە کە بەلەمەکەی بە سەوڵ ئەڕوا و بەلەمی ئەو بەلەمەوانەی نقوم کردوە کە بە تەوژمی ئاو ئەڕوا، ئەبێ بەلەمەکەی و کەلوپەلەکانی ناوی بێژێرێ.

ماددەی 241: ئەگەر پیاوێ گایەکی بە بارمتە گرت، ئەبێ سێیەکی مەنێ زیو بە قەرەبو بدا.

ماددەی 242: ئەگەر پیاوێ گایەکی بۆ ماوەی ساڵێ بە کرێ گرت، کرێی گاکە لە کۆتایی ساڵەکەدا چوار کور دانەوێڵە ئەبێ.

ماددەی 243: ئەبێ پێشەکی بۆ ماوەی ساڵێ سێ کور دانەوێڵە کرێی گاکە بدا بە خاوەنەکەی.

ماددەی 244: ئەگەر پیاوێ گایەک یا کەرێکی بە کرێ گرت و شێرێ لە کێڵگەکەدا کوشتی زەرەرەکە بۆ خاوەنەکەی ئەگەرێتەوە.

ماددەی 245: ئەگەر پیاوێ گایەکی بە کرێ گرت بە هۆی کەمتەرخەمی یا لێدانەوە کوشتی ئەبێ گایەکی هاوشێوەی گاکە بداتەوە بە خاوەنەکەی کە گاکەی لێ بە کرێ گرت بو.

ماددەی 246: ئەگەر پیاوێ گایەکی بە کرێ گرت و لاقی شکاند یا دەماری ملی بڕی، ئەبێ گایەکی هاوشێوەی گا زەرەردیدەکە بداتەوە بە خاوەنی گاکە.

ماددەی 247: ئەگەر پیاوێ گایەکی بە کرێ گرت و چاوی کوێر کرد، ئەبێ نیوەی نرخەکەی بە زیو بدا بە خاوەن گاکە.

ماددەی 248: ئەگەر پیاوێ گایەکی بە کرێ گرت و شاخی شکاند یا کلکی بڕی یا پێستی پشتی کوری ئەبێ پێنجیەکی نرخەکەی بە زیو بدا.

ماددەی 249: ئەگەر پیاوێ گایەکی بە کرێ گرت و خوا لێی دا و مردار بوەوە، ئەبێ ئەو پیاوەی گاکەی بە کرێ گرتوە سوێند بە خوا بخوا، کە هیچ سوچێکی لە مرداربونەوەی گاکەدا نیە، ئەوسا بەر ئەدرێ.

ماددەی 250: ئەگەر گایەک لە کاتی رۆیشتنی دا بە بازاڕدا قۆچی لە پیاوێ دا و کوشتی، ئەم پرسە پێویستی بە سکاڵا نیە.

ماددەی 251: ئەگەر پیاوێ گایەکی قۆچوەشێنی هەبو، وە بەڕێوەبەرایەتی شارەکەی ئاگاداریان کرد کە گاکەی قۆچوەشێنە بەڵام قۆچەکەی نەبڕیەوە یا چاودێری گاکەی نەکرد، ئەگەر ئەم گایە قۆچی لە کوڕی پیاوێ دا و بو بە هۆی مردنی، خاوەنی گاکە ئەبێ وەکو قەرەبو نیو مەن زیو بدا.

ماددەی 252: ئەگەر مردوەکە کۆیلەی پیاوێ بێ، ئەبێ سێیەکی مەنێ زیو قەرەبوی بکا.

ماددەی 253: ئەگەر پیاوێ پیاوێکی بە کرێ گرت و لە سەر کێڵگەکەی دایئا و چەرنەیەک دانەوێڵەی دایە و چاودێری مانگای پێ سپارد و بۆ چاندنی کێڵگەکەی لە گەڵی ڕێککەوت، ئەگەر ئەم پیاوە تۆوەکە یا خۆراکی دزی و بە دەستیەوە گیرا، ئەبێ دەستی ببڕن.

ماددەی 254: ئەگەر دانەوێڵەکەی بۆ خۆی برد و مانگاکەی برسی کرد، ئەبێ بە دو ئەوەندە دانەوێڵە قەرەبوی بکاتەوە.

ماددەی 255: ئەگەر مانگای پیاوێ درا بە کرێگرتەیەک یا تۆوەکەی دزی و لە کێڵگەدا هیچی نەچاند، ئەوکاتەی ئەوەی لە سەر ساغ بوەوە، ئەبێ لە وەرزی هەڵگرتنی خەرمان دا شەست کور دانەوێڵە بۆ هەر بورێ بدا.

ماددەی 256: ئەگەر نەیتوانی ئەوەی لەسەرێتی بیدا، ئەبێ بە مانگاکە لە ناو کێڵگەکەدا رابکێشرێ.

ماددەی 257: ئەگەر پیاوێ جوتیارێکی بەکرێ گرت، ئەبێ ساڵی هەشت کور دانەوێڵەی بداتێ.

ماددەی 258: ئەگەر پیاوێ گاوانێکی بە کرێ گرت ئەبێ ساڵی شەش کور دانەوێڵەی بداتێ.

ماددەی 259: ئەگەر پیاوێ گاسنێکی لە کێڵگەدا دزی، ئەبێ پێنج شیقلی زیو قەرەبو بە خاوەن گاسنەکە بدا.

ماددەی 260: ئەگەر شەنێ یا خاکەنازێکی دزی ئەبێ سێ شیقلی زیو قەرەبوی بداتێ.

مادەی 261: ئەگەر پیاوێ گاوانێکی بۆ مانگا و مەڕ بەکرێ گرت ئەبێ ساڵی هەشت کور دانەوێڵەی بداتێ.

مادەی 262: ئەگەر .... پیاوێ .... مانگا یا مەڕی ...

مادەی 263: ئەگەر مانگا یا مەڕی کە درابویە فەوتان، ئەبێ خاوەنەکەی بە مانگای هاوشێوەی مانگاکەی و مەڕی هاوشێوەی مەڕەکەی قەرەبو بکاتەوە.

مادەی 264: ئەگەر مانگا یا مەڕ درا بە شوانێ بیانلەوەڕێنێ، کرێی خۆی بە تەواوی وەرگرت و رازی بو، ئەگەر ژمارەی مانگاکان کەمی کرد یا ژمارەی مەڕەکان کەمی کرد، ئەوەش بوە هۆی کەمبونەوەی زاووزێ، ئەبێ ئەو کەمبونەوەیەی زاووزێ قەرەبو بکاتەوە و باج بە پێی مەرجەکانی گرێبەستەکە بدا.

مادەی 265: ئەگەر مانگا یا مەڕ درا بە شوان بۆ لەوەڕاندنی، بەلام گزی کرد و نیشانەی ئاژەڵەکانی گۆڕی و بە زیو فرۆشتنی، کاتێ ئەوەی لە سەر ساغ بوەوە، ئەبێ دەقاتی ئەوەی لە مانگا و مەڕ دزیویێتی قەرەبوی خاوەنەکەی بکات.

مادەی 266: ئەگەر پەتای خوا کەوتە تەویلەکەوە، یا شێر ئاژەڵەکانی کوشت، ئەبێ شوانەکە لە بەردەم خوادا ئۆباڵ لە گەردنی خۆی هەڵبگرێ، ئەو زەرەرەی لە تەویلەکەدا روی داوە ئەکەوێتە سەر خاوەن تەویلەکە.

مادەی 267: ئەگەر شوانەکە کەمتەرخەم بێ و نەخۆشی لە تەویلەکەدا بڵاو بوەوە، ئەبێ شوانەکە ئەو زەرەرە بگرێتە ئەستۆ کە نەخۆشیەکە لە تەویلەکەدا خستویەتی، ئەبێ ئەو مانگاو مەڕە قەرەبو بکاتەوە و بیداتەوە بە خاوەنەکەی.

مادەی 268: ئەگەر پیاوێ گایەکی بۆ گێرە بە کرێ گرت، کرێکەی بیست قا (ئەندازەیەکی کێشان بوە) دانەوێڵەیە.

مادەی 269: ئەگەر پیاوێ کەرێکی بۆ گێرە بەکرێ گرت، کرێکەی دە قا دانەوێڵەیە.

مادەی 270: ئەگەر پیاوێ بزنێکی بۆ گێرە بەکرێ گرت، کرێکەی یەک قا دانەوێڵەیە.

مادەی 271: ئەگەر پیاوێ مانگایەک و عەرەبانەکەی و شوفێرەکەی بەکرێ گرت، ئەبێ رۆژی سەدوهەشتا قا دانەوێڵە کرێ بدا.

مادەی 272: ئەگەر پیاوێ تەنیا عەرەبانەکەی بەکرێ گرت، ئەبێ رۆژی چل قا دانەوێڵە بدا.

مادەی 273: ئەگەر پیاوێ کرێکارێکی بە کرێ گرت، ئەبێ لە سەری ساڵەوە تا کۆتایی مانگی پێنج رۆژی شەش دەنک زیوی بداتێ، وە لە سەرەتای مانگی شەشەوە تا کۆتایی ساڵ رۆژی پێنج دەنک زیوی بداتێ.

مادەی 274: ئەگەر پیاوێ ویستی وەستایەک بەکرێ بگرێ، ئەبێ رۆژی پێنج دەنک زیو کرێی بداتێ ... وە پێنج دەنک زیو کرێ بۆ .... پێنج دەنک زیو کرێ بۆ بەرگدرو، پێنج دەنک زیو کرێ بۆ سەنگتاش، پێنج دەنک زیو کرێ بۆ زەرەنگەر، پێنج دەنک زیو کرێ بۆ ئاسنگەر، پێنج دەنک زیو کرێ بۆ دارتاش، پێنج دەنک زیو کرێ بۆ دەباغ، پێنج دەنک زیو کرێ بۆ جۆلای حەسیر و پێنج دەنک زیو کرێ بۆ بەنا.

مادەی 275: ئەگەر پیاوێ بەلەمێکی بەکرێ گرت، کرێی رۆژانەی بەلەمەکە سێ دەنک زیوە.

مادەی 276: ئەگەر پیاوێ بەلەمێکی بە کرێ گرت بە هێزی سەوڵ بڕوا، ئەبێ رۆژانە دو دەنکونیو زیو کرێ بدا.

ماددەی 277: ئەگەر پیاوێ بەلەمێکی بە قەوارەی شەست کور بە کرێ گرت، ئەبێ رۆژانە شەشیەکی شیقلێکی زیو کرێی بداتێ.

ماددەی 278: ئەگەر پیاوێ کۆیلەیەک یا کەنیزەکێکی کڕی پێش ئەوەی مانگێ تەواو بکا نەخۆش کەوت، ئەبێ کڕیارەکە بیگێڕێتەوە بۆ فرۆشیارەکەی، کڕیارەکە پارەکەی وەرئەگرێتەوە.

ماددەی 279: ئەگەر پیاوێ کۆیلەیەک یا کەنیزەکێکی کڕی سکالایان لە سەر بێ ئەبێ فرۆشیارەکە ئۆبالی ئەنجامی سکالاکە هەڵبگرێ.

ماددەی 280: ئەگەر پیاوێ کۆیلەی پیاوێ یا کەنیزەکی پیاوێکی لە ولاتێکی بێگانە کڕی و، کاتێ گەڕایەوە ولاتەکەی خۆی، خاوەنی کۆیلەکە یا کەنیزەکەکە، کۆیلەکە یا کەنیزەکەکەی خۆی ناسیەوە، ئەگەر کۆیلە و کەنیزەک خەڵکی ولات بون بە بێ پارە بەر ئەدرێن.

ماددەی 281: ئەگەر خەڵکی ولاتێکی تر بون، ئەبێ فرۆشیارەکە لە بەردەم خوادا ئەو پارەیەی داویێتی روون بکاتەوە، لە سەر خاوەن کۆیلە یا کەنیزەک پێویستە ئەو زیوە بە بازرگان (فرۆشیارەکە) بداتەوە کە داوێتی و کۆیلەکە یا کەنیزەکەکە ببات.

ماددەی 282: ئەگەر کۆیلەیەک بە خاوەنەکەی وت تۆ گەورەی من نیت و سەلمێنرا کۆیلەی ئەوە، گەورەکەی ئەتوانێ گوێی ببڕێ.

## پاشەکی

ئەمە قانونەکانی دادپەروەرین کە حامورابی، شای لێوەشاوە، چەسپاندونی، کە بەهۆیانەوە ولات توانیویێتی سەرکردایەتی ژیر و فەرمانڕەوایی باشی هەبێت.

من حامورابیم، شای تەواو،
نە کەمتەرخەم بوم و نە هەراسانکەر بۆ سەرڕەشەکانی کە خوا ئینلیل پێشکەشی کردوم و
خوا مەردوخ ئەرکی فەرمانڕەواییانی پێ سپاردوم و
لە پێناوی ئەوان دا، بۆ شوێنی ئارام گەڕاوم
یارمەتیم داون کێشە دژوارەکانیان چارەسەر بکەن
وام کردوە روناکییان لێ هەڵ بێت
بەو چەکە کوشندەیەی کە خوا زبابا و ماخوا ئیشتار پێیان بەخشیوم و،
بەو بۆچونەی کە خوا ئینکی فێری کردوم و،
بەو توانایەی کە خوا مەردوخ پێی داوم،
ریشەی دوژمنم لە باشور و باکور هەڵکێشاوە و،
شەڕوشۆڕم بڕاندۆتەوە و ولاتم حەواندۆتەوە
دانیشتوانی شارەکانم خستۆتە خۆشی وئاسودەییەوە
نەم هێشتوە کەس بیان ترسێنێ
خوا گەورەکان بانگیان لێ کردم
بوم بەو شوانە چاکەکارەی کە گۆچانەکەی دادپەروەریە
سێبەری چڕی خۆمم بەسەر شاردا بڵاوکردەوە
باوەشم بۆ گەلی ولاتی سومەر و ئاکەد کردەوە

لە پەنای من دا حەسانەوە و
بە ئاشتی رام هێنان و بەژیریی خۆم پارێزگاریم کردن
بۆ ئەوەی بەهێز نەتوانێ ستەم لە لاواز بکا
بۆ ئەوەی دادپەروەری مشوری هەتیو و بێوەژن بخوا
وتە ناوازەکانی خۆمم لە سەر کێلەکەم نوسی
لە بەردەم پەیکەرەکەم دا شای دادپەروەریم جێگیر کرد
لە بابل دا، لەو شارەی کە خواکان ئانو و ئینلیل سەریان بەرزکردۆتەوە
لە ئیساکیلا، ئەو پەرستگایەی کە بنچینەکەی وەکو ئاسمان و ئەرز پتەوە.
بۆ ئەوەی بە دادپەروەری فەرمانرەوایی وڵات بکەم و هێمنی لەوڵات دا بچەسپێنم
بۆ ئەوەی داد بە ستەملێکراو ببەخشم
من پاشای هەڵکەوتوی ناو پاشاکان
وتەکانم هەڵبژێردراون و توانام وێنەی نیە
بە ویستی خوا شاماش دادوەری گەورەی ئاسمان وئەرز
بەشکو دادپەروەریم وڵات بگرێتەوە و.
بەویستی خوا مەردۆخی گەورەم
بەشکو هەمیشە ناوم بە باشی لە پەرستگای ئیساکیلا بهێنرێ
با هەمو کەسێکی ستەملێکراو، کە سکاڵای هەبێ، لە بەردەم پەیکەرەکەم دا، کە پێی ئەوترێ شای دادپەروەری رابوەستێ.
ئەوسا کێلە نوسراوەکەم بخوێنێتەوە
وتە بەنرخەکانم تاووتوێ بکا،
بەڵکو کێلەکەم سکاڵاکەی بۆ رون بکاتەوە
بەڵکو لەسکاڵاکەی تێ بگا
بەڵکو ویژدانی ئاسودە بێ و (بڵێ):
حامورابی، گەورە، کە وەکو باوکی راستەقینەی گەل وایە،
کە بۆ رێزنان لە فەرمانی خوا مەردۆخ، خوای خۆی، ئەچەمێتەوە
سەرکەوتنی خوا مەردۆخ لە باکور و باشور بەدەست ئەهێنێ
بەوەش خوای خۆی، مەردۆخ، شاد ئەکا
سەرکەوتنی هەمیشەیی بۆ خەڵک دابین ئەکا
دادپەروەری بە وڵات ئەبەخشێ
با ئەمە رابگەیەنێ وبا نوێژم بۆ بکا
بە هەمو دڵیەوە لە بەردەم خواکەم دا، خوا مەردۆخ و ماخواکەم، ماخوا زاربانیتوم،
بەڵکو فریشتەی پارێزگاری و گیانە ئیشکگرەکان
ئەو ماخوایەی ئەچێتە پەرستگای ئیساکیلا و لیبتوم، ماخوای ئیساکیلا
رۆژانە بۆچونی باشم بۆ بەردەم خواکەم، خوا مەردوخ، و بۆ بەردەم ماخواکەم زاربانیتوم بۆ بهێنێ.
بۆ هەمیشەو هەتاهەتایە.

خۆزگە ئەو پاشایەی کە دوای من لە وڵات دا دەرئەکەوێ پارێزگاری وتەکانی دادپەروەری بکا کە من لەسەر کێلەکەمم نوسیون،
خۆزگە ئەو قانونانەی کە من دام ناون و ئەو ڕێسایانەی کە من دام ڕشتون نەیئەگۆڕین
خۆزگە قانونەکانی منی نەئەفەوتان
ئەگەر ئەو کەسە دەسەڵاتی هەبێ و بتوانێ دادپەروەری بە وڵات ببەخشێ
دا ئەو وشانە جێبەجێ بکا کە من لە سەر کێلەکەی خۆمم نوسیون
بەشکو ئەم کێلە ڕەفتاری باش و دەسەلاتی چاکی پێ نیشان بدا و،
قانونەکانی ولات کە من دامناون و ڕێساکانی وڵات کە من دامڕشتون،
توانای بداتێ دادپەروەی بە خەڵکەکەی، سەرڕەشەکان، ببەخشێ و،
قانونەکانیان بۆ جێبەجێ بکا و، ئاسایشیان بۆ دابین بکا
بەشکو ڕەگی چەپەڵی و بەدیی لە وڵاتەکەی دەربهێنێ و گەلەکەی سەربخا

من حامورابی، پاشای داد
کە خوا شاماش قانونەکانی بە دیاری داومەتێ
وتەکانم هەڵبژاردەن و کردەوەکانم وێنەیان نیە
بە لای گەوجەوە پڕوپوچن و بە لای زیرەکەوە مایەی سەرسوڕمانن
ئەگەر ئەو کەسە وتەکانمی کە لە سەر کێلەکەم نوسیومن جێبەجێ کرد و سوکایەتی بەقانونەکانی من نەکرد و بڕیارەکانمی هەڵنەوەشاندەوە و ڕێساکانمی نەگۆڕی
بەشکو خوا شاماش قەڵەمڕەوەکەی ئەویش وەکو ئەوەی من فراوان بکا و،
بیکا بە پاشای داد
بەشکو بە دادپەروەری گەلەکەی بەڕێوە بیا،
خۆ ئەگەر ئەوکەسە ئەو وتانەی منی کە لە سەر کێلەکەی خۆمم نوسیون جێبەجێ نەکرد
نەفرینەکانی منی پشتگوێ خست و لە نەفرینەکانی خواکانیش نەترسا،
ئەو قانونانەی سڕیەوە کە من دامناون
بڕیارەکانمی هەڵوەشاندەوە و ڕێساکانمی گۆڕی
ناوی نوسراوی منی سڕیەوە و ناوی خۆی لە جێی نوسی
یان لە ترسی ئەم نەفرینانە، فەرمانی دا بە کەسێکی تر، ناوەکەم بسڕێتەوە
بەشکو خوا ئینلیل، باوکی خواکان، کە فەرمانڕەوایی پێ سپاردوم، ئەو کەسە ئەگەر پاشا یا میر یا کاربەدەست بێ لە کار بخا، یان هەر کەسێکی تر کە نازناوێکی شاهانەی هەبێ گۆچانی شاهانەی بشکێنێ و بەدبەختی بکا.
بەشکو خوا ئینلیل، خودان و بڕیاردەری چارەنوس، کە فەرمانەکانی نافەرمانیی لێ ناکرێ، فراوانکەری قەڵەمڕەوەکەم، شۆڕشی لە کوژانەوە نەهاتوی بۆ هەڵ بگیرسێنێ و، لە ناو ماڵەکەی خۆی دا بە نائومێدی سەربنێتەوە.
بەشکو بڕیاری وەیل ببێتە بەشی، ڕۆژەکانی کەم بێ و ساڵەکانی قات وقڕی و، هەموی تاریک ونوتەک و مەرگی کتوپڕ بێ،

بەشکو بەفەرمانی پیرۆزی ئەو شارەکەی وێران و گەلەکەی پەرتەوازە و وڵاتەکەی کاول بێ، ناو و یادەوەری لەوڵات دا کوێر بێتەوە
بەشکو ماخوا ئینلیل، دایکی مەزن، کەفەرمانەکانی لەپەرستگای ئیکور دا رەوایە، ئەو ئەو خانمەی کەبیری باشم بۆ نەهێنێ، لەبەردەم خوا ئینلیل لە رۆژی پرسینەوە و بڕیاردا قسەکانی بێزرکێنێ ویستی دەربچێ بەوێرانکردنی وڵاتەکەی و تێکشکاندنی گەلەکەی و دەرکردنی گیانی وەکو ئاوی رەوان
بەشکو خوا ئینکی، میری مەزن، کەویستی ئەو لەسەرو ویستەکانی ترەوەیە، پتەوترین خواکان کەهەموشت دەزانێ، کە رۆژانی ژیانم درێژ دەکاتەوە، لەزانایی و تێگەیشتنی قوڵ بێبەشی بکاو سەری لێ بشێوێنێ،
بەشکو روبارەکانی و سەرچاوەی ئاوەکانی پڕ بکاتەوە،
بەشکو دانەوێڵەی دانەکەی و ژیانی خەڵک لەخاکی ئەوا نەڕوێ،
بەشکو خوا شاماشی مەزن، دادوەری ئاسمان و ئەرز، کە بە راستی داد دەبەخشێ بە هەمو زیندەوەرێ، ئەو خوایەی باوەڕم پێیەتی، پایەکانی وڵاتەکەی بڕوخێنێ، بۆچونەکانی بە هەند وەرنەگرێ و، رێگەی لێ ون بکا و هێزی لەشکرەکەی ببەزێنێ، خوێندنەوەی دوقلانەبێژەکان بەدبەختی بۆ بهێنێ، بۆ ئەوەی دوقلانەی روخانی پایەکانی شانشینەکەی و وێرانی وڵاتەکەی بۆ لێ بدەن،
بەشکو قسەی کوشندەی خوا شاماش بە زویی بیگاتێ و لە ناو زیندوان دا هەڵی بکێشێ بۆ لای ژورو و، تارمایی تینوێتی ئاوی لە لای خواروا پێشان بدا،
بەشکو خوا سین، خودانی ئاسمان، دروستکەری من کەهیلالەکەی لەناو خواکان دا دیارە لە تاج و تەختی پاشایەتی بێبەشی بکا،
بەشکو گوناهێکی قورسی بدا بەسەردا وەکو سزایەکی گەورە هەرگیز لە لەشی نەبێتەوە،
بەشکو رۆژ و مانگ و ساڵەکانی فەرمانڕەواییەکەی بە کوێرەوەری و پەرێشانی کۆتایی بێ،
بەشکو تورەیی و ئازار روبەڕوی فەرمانڕەواییەکەی ببێتەوە،
بەشکو بەختەکەی وای لێ بێ ژیانی لە مردن بچێ،
بەشکو خوا ئەدەد، خوای بەرەکەت، رێکخەری ئاوی ئاسمان (باران) و ئەرز، پاڵپشتم، بێبیەشی بکا لە ئاوی ئاسمان و ئاوی کانیەکان،
بەشکو وڵاتەکەی بە قاتوقڕی و برسێتی کاول بکا، بەشکو بەتورەیی بگرمێنێ دژی شارەکەی بەلافاو وڵاتەکەی وێران بکا،
بەشکو خوا زبابا، جەنگاوەری مەزن، کوڕەگەورەکەی ئیکۆر (واتەخوا ئینلیل)، کە لە لای راستمەوە ئەڕوا، لە شەڕدا چەکەکانی بشکێنێ، رۆژی بکا بەشەو و، دوژمنەکەی پێی لێ بنێ،
بەشکو ماخوا ئیشتار، خانمی گەورەی ئەبەرد و جەنگ کە چەکەکانی منی ساز کردوە، پارێزەری بەرێزم، کە شانازە بەفەرمانڕەواییەکەی منەوە، بەتوڕەبونی گەورەی دڵە رەقەکەی نەفرەت لەوڵاتەکەی بکا،
بەشکو سەرکەوتنە گەورەکەی بکا بەسەرکەوتنێکی پروپوچ
بەشکو چەکەکانی لە مەیدانی شەڕ و جەنگ دا لە کار بخا،
بەشکو پشێوی بۆ دروست بکا و شۆرش لە دژی بوروژێنێ،
بەشکو جەنگاوەرەکانی بشکێنێ و زەوی خویناویان بخواتەوە،
بەشکو لەشکرەکەی بکاتە لاشەی کەڵەکەبوی ناو پوشوپەڵاش،
بەشکو جەنگاوەرەکانی بەزەییەکانی ئەو نەبینێ،
بەشکو بیداتە دەست دەیارەکانی و، بە زنجیر کراوی ببەن بۆ وڵاتێکی دوژمن،

بەشکو خوا نیرکاڵ، خورت لە ناو خواکان دا، ئەو پاڵەوانەی هاوتای نیە کە ئارەزوەکانی هێناوەتە دی، بەهێزە مەزنەکەی. وەکو چۆن ئاگر لە پوش بەر ئەبێ، گەلەکەی تەفروتونا بکا،
بەشکو بەچەکە بە هێزەکەی دونیمەی بکا و، چوارپەلی وەکو بتێکی قوڕ وەردوخاش بکا،
بەشکو ما خوا نینتو، خانمی گەورەی وڵاتە بەرزەکان، ئەو دایکەی منی لێ بوم، لە جێگرەوە بێبەشی بکا،
بەشکو بەبێ ناو بەجێی بهێڵێ،
بەشکو تۆوی ژیان لە ناو گەلەکەی دا نەڕوێ،
بەشکو نین کراک، کچی خوا ئانو، تکاکارەکەم لە پەرستگای ئیکور، چوار پەلی توشی دەردێکی سەخت و پەتایەکی پیس بکا، برینەکەی سارێژ نەبێ، هیچ پزیشکێ دەرمانەکەی نەزانێ، هەتوان و پەڕۆ ژیانی بۆ نەهێنێتەوە، وەکو کەڵبەیەکی کوشندە بێ لە دەرهێنان نەیە،
بەشکو گلەیی لە ژیانی بکا تا ژیانی تەواو ئەبێ، بەشکو خوا گەورەکانی ئاسمان و ئەرز هەمو خواکانی ئانوناکی گیانەکانی پارێزگاری پەرستگا ئەکەن و ماخوا لبیتوم (خوای خشت)، ماخوای پەرستگای ئیبابار نەفرینی لێ بکاو نەفرینی کوشندە بکا لە نەوە و لە جەنگاوەرەکانی و لە خەڵکەکەی و لەشکرەکەی،
بەشکو خوا ئینلیل بەو قسانەی کە لە گۆڕین نایەن لەعنەتی بێ گومانی لێ بکا تا دەستبەجێ لە ناوی ئەبا

# بەشی سێیەم: سەرەتاکانی ئەدەبی نوسراوی کوردی

# سەرەتاكانی ئەدەبی نوسراوی كوردی:
# سەرەتایەكی وەهمی

ئەدەبی نوسراو بە زمانی كوردی لە كەیەوە دەستی پێكردوە؟
مەبەست لە ئەدەبی كوردی چیە؟
بۆ ئەوەی وەڵامێكی دروستی ئەم پرسیارە بدرێتەوە ئەبێ بزانین لەو سەردەمەدا ئەدەبی كوردی تا ئێستا، جگە لە شیعر، هیچ دەقێكی پەخشانی نوسراو، دەربارەی هیچ بابەتێكی مێژویی، دینی، زانستی... هتد لە بەر دەس دا نیە.

ئەوانەی خەریكی نوسینەوەی مێژوی ئەدەبی كوردی بون لەم بارەیەوە هەندێ بۆچونی جیاوازیان هەیە:

یەكەم، هەندێكیان سەرەتایەكی وەهمیی بۆ دروست ئەكەن
سەرەتای شیعری كورد ئەگێڕنەوە بۆ هێرشی عەرەبی – ئیسلامی بۆ سەر كوردستان و بە هەڵبەستی "هورمزگان رمان، ئاتران كوژان" دەس پێ ئەكەن و، بە درێژایی سەردەمی ئەمەوی و عەباسی و ... كۆمەڵێ شیعری هەڵبەستراو ئەدەنە پاڵ كۆمەڵێ ناوی دروستكراو.

# سەرەتاکانی ئەدەبی نوسراوی کوردی: لەهجەی گۆران

هەندێ لەوانەی خەریکی نوسینەوەی مێژوی ئەدەبی کوردین پێیان وایە ئەدەبی کوردی بە لەهجەی گۆران پێش ئەدەبی کوردی بە لەهجەکانی تر دەستی پێ کردوە ئەمەش لە بەر دو هۆ:
یەکەمیان، باباتاهیر بە کورد و روباعیەکانی بە سەرەتای ئەدەبی کوردی دائەنێن.
دوەمیان، کەلامە دینیەکانی ئەهلی هەق بە لەهجەی گۆران هۆنراونەتەوە.

## دەربارەی باباتاهیر

دکتۆر مارف خەزنەدار، لە بەرگی یەکەمی "مێژووی ئەدەبی کوردی"، ل 159-160دا، ئەڵێ:
"لە چی‌یەوە ئەدەبی کوردی دەست پێ دەکا؟
تێکستی باوەڕ پێ کراوی شیعر بە زمانی کوردی سەرەتا و سەرەدەمی شیعری کوردیمان بۆ دیار دەکا. لێرەدا لە بەر گەلێ هۆی تایبەتی کە لە سەرانسەری ئەم کارەدا روون کراوەتەوە، ئەدەبی کوردی بە دیالێکتە جیاوازەکانی زمانی کوردی پەیدا بووە. راستە دەبێ سەرەتایێکمان هەبێ بۆ ئەدەبی کوردی بە گشتی، بەڵام دیارە ئەدەبی دیالێکتیکیش سەرەتای خۆی هەیە.
دوو بەیتەکانی باباتاهیر بە سەرەتای شیعری کوردی دادەنرێن بە شێوەیێکی گشتی، بلیمەتی باباتاهیر لە گەڵ بیروباوەڕی ئایینی یارسان و سۆفیزمی کۆزمۆسی و گۆرانی میللی ناوچەیی دوو بەیتەکانیان دروست کردوە."
لاپەڕەکانی 184 – 223 مێژوەکەی وەکو یەکەم شاعیری کورد بۆ باباتاهیر تەرخان کردوە.

عەلادین سجادی لە "مێژوی ئەدەبی کوردی"، ل 171 دا، ئەڵێ:
"بابە تاهر شاعرێکی کوردی سەدەی سێهەمی هیجری بوە."
جارێکی تریش ئەڵێ: "بابە تاهر شاعیرێکی کورد و لە بنەماڵەی لوررە" ل 172.
سجادی لە مێژوەکەی دا وەکو یەکەم شاعیری کورد لاپەڕەکانی 170 – 178 ی بۆ باباتاهیر تەرخان کردوە.
بۆ سەلماندنی بۆچونەکەی خۆی لە لێکدانەوەی روباعیەکی دا زیاتر ئەڕوا ئەڵێ: "تەماشا ئەکەی لێرەدا (ئەوا: فارسی. تە، تو: بۆتانی. زونو: پشتکۆیی. بورە: لە بەوە ئەیرە، لوڕی. بۆ تە: کرمانجی) ئەمانەی هەموی لەم دو شیعرەدا کۆکردۆتەوە. لەمەوە بۆ ئێمە دەرئەکەوێ کە ئەفسیەتی باباتاهیر ویستویەتی لە ناو هەمو هۆز و تیرەیەکی کورددا پەل بڵاوبکاتەوە..." یەکێ باباتاهیر ئەناسێ کە ئەمە بخوێنێتەوە وا ئەزانێ ئەک هەر شاعیرێکی کورد بوە بەڵکو سەرۆکی کۆڕی یەکخستنی زمانی کوردی بوە.

هەندێ لەوانەی لەگەڵ لێکۆڵینەوەی مێژوی ئەدەبی کوردی دا خەریک بون هەوڵێکی زۆریان داوە کوردبونی باباتاهیر و روباعیەکانی بسەلمێنن.
وشەکانی باباتاهیر لە روباعیەکانی دا بەکاریهێناون زۆری لە کوردی ناچن. ئەوانەیشی کە لە کوردی ئەچن یا نزیکن لە کوردیەوە ئەوانەن کە هاوبەشن لە گەڵ زمانی فارسی. جگە لەمانە گۆڕینی سەرچاوەکانی وشە بۆ کردار، لە گەڵ رێزمانی هیچ کام لە لەهجەکانی کوردی ناگونجێن.
تەنانەت ئەگەر باباتاهیر ساخ بوەوە کوردە و چوارینەکانیشی هەموی کوردی بن هێشتا گرنگیەکی ئەوتۆی بۆ ئەدەبی کوردی نیە چونکە:

یەکەم: دابڕانێکی درێژ و قوڵ لە نێوان ئەو و شاعیرانی کوردی دوای ئەودا هەیە و.
دوەم: هیچ کاریگەریەکی باباتاهیر لە سەردەمی خۆی و لە سەردەمی دوای ئەویش دا لە ئەدەبی ئایینی یارسان و لە ئەدەبی گۆران دا بەدی ناکرێ، بە تایبەتی، لە روی:
لاساییکردنەوەی قاڵبی شیعرەکانی کە روباعیە و لە بەحرەکانی عروزە.
لاساییکردنەوەی زمانی هۆنینەوەی شیعرەکانی کە بە لەهجەی گۆران نیە.
پێ ناچێ هیچ کام لە شاعیرانی هەورامان باباتاهیریان خوێندبێتەوە یا بیستبێ، لە کاتێک دا کاریگەری شاهنامەی فیردەوسی، خەمسەی نیزامی گەنجەوی، مەسنەوی مەعنەوی مەولانای رۆمی، دیوانەکانی حافزی شیرازی و سەعدی و ...هتد، لە ئەدەبی گۆران دا دیار و بەرچاوە.

هەروەکو زمانی روباعیەکانی باباتاهیر جیاوازە لە زمانی شیعرەکانی مەدرەسەی گۆران هەروەها قاڵبی شیعری شاعیرانی مەدرەسەی گۆرانیش جیاوازە لە قاڵبی شیعرەکانی باباتاهیر.
تەلاری هۆنراوەیی باباتاهیر "روباعی" یە هەروەها پێشی ئەوترێ "دوبەیت".
روباعی بریتیە لە چوار نیوە دێڕ، میسراعی یەکەم و دوەم و چوارەم هاوقافیەن و، میسراعی سێیەم، کە سەدری بەیتی دوەمە قافیەکەی ئازادە و، هاوئاوازی قافیەکانی تر نیە. سەرەتای غەزەل و قەسیدە لە ئەدەبی فارسی و عەرەبی دا بەم شێوەیە دەس پێ ئەکا، کە ئەچێتە چوارچێوەی قاڵبەکانی "عروز" ەوە:
نمونە 1:

بەگورستان گوزەر کەردم کەم و بیش
بدیدەم حال دەولەتمەند و دەرویش
نە دەرویشێ بە خاکی بی کەفەن ماند
نە دەولەتمەندێ بورد ئەز یەک کەفەن بیش

نمونە 2:

دلێ دەیرم خەریداری موحیبەت
کەزۆ گەرم ئەست بازاری موحیبەت
لیباسێ بافتەم بەر قامەتی دل
ز پودی میحنەت و تاری موحیبەت

نمونە 3:

خوداوەندا بەفەریادی دلم رەس
کەسی بیکەس تونی من ماندە بیکەس
همە گویەند طاهیر کەس ئەدارە
خودا یاری مەنە چە حاجەت بە کەس

باباتاهیر بەم روباعییانە ناسراوە. هەوڵی داوە چکاوەی بیروبۆچونەکانی و وێنە شیعریەکانی لە قاڵبی تەنیا روباعیەک دا دابرێژێ. ژمارەیەکی کەم غەزەل و قەسیدەی دراوەتە پاڵ، بەڵام هەروەکو گومان لە هەندێ لە روباعیەکانی ئەکرێ، کە دوای ئەو بە ناوی ئەوەوە هەڵبەسترابن، گومان لەو شیعرانەشی ئەکرێ.
کێشی روباعیەکانی بە تەرازوی سێلاب 11 برگەییە:

نمونە 1:
ئە- گەر - ئەس - تم - رە - سەد - بەر - چەر - خ - گەر - دون
ئەز - ئان - پور - سەم - کە - ئین - چو- ئە- ست و - ئان - چون
یە - کێ - را - دا - دە - ئی - سەد - نا - ز و - نیع - مەت
یە - کێ - را - قور - صی - جەو - نا - لو - دە - دەر - خون
نمونە 2:
مە - کون - کا- رێ - کە - پا - بەر - سەن - گت - نا - یۆ
جی - هان - با - ئین - فە - را - خی - تەن - گت - نا - یۆ
چو - فەر - دا - نا - مە - خوا - نان - نا - مە - خو - ئەن - د
تو - وی - نی - نا - مە - ی - خود - ئەن - گت - نا- یۆ
کێشی 11 بڕگەیی، هەندێ نمونەی لە شیعری عروزی مەدرەسەی بابان دا هەیە، بەڵام لە شیعری مەدرەسەی گۆران دا، کە لە زمانەکەی باباتاهیرەوە نزیکترە، بە هیچ جۆرێ پێڕەوی نەکراوە.
بە پێی هەڵسەنگاندنی توێژەرانی ئێرانی، کێشی ڕوباعیەکانی باباتاهیر ئەچێتە خانەی عروزەوە، لە ناو کێشەکانی عروزیش دا دائەنرێ بە:
هزج مسدس محذوف (یا مقصور):
مفاعیلن، مفاعیلن، فعولن (یا مفاعیل)

لە ئەدەبی کوردی دا تا ئێستا هیچ مەدرەسەیەک بە ناوی ئەدەبی کوردی لوڕی نیە کە درێژەی ڕێبازی بابە تایەر بێ. شیعری نوسراو لە ئەدەبی کوردی دا لە ناو سێ لەهجەدا سەری هەڵداوە:
مەدرەسەی گۆران یا هەورامی
مەدرەسەی بابان یا کرمانجی خوارو
مەدرەسەی کرمانجی سەرو
هەریەکێ لەم مەدرەسانە خاوەنی گەنجینەی ئەدەبی و سیمای تایبەتی خۆیەتی، کاریگەری باباتاهیر و شوێن پەنجەی ئەو بە هیچ کامیانەوە دیار نیە و، ناناسرێتەوە. لە بەر ئەوە ناشێ ڕوباعیەکانی بابە تایەر بە سەرەتای ئەدەبی کوردی دابنرێ.

## کەلامەکانی یارسان

بە پێی لێکۆڵینەوەی شوێنی لە دایکبون و ژیانی ئەو شاعیرانەی بە لەهجەی گۆران شیعریان داناوە، ئەشێ جوگرافیای شیعری گۆران بە 3 گۆشەی کرماشان – سنە - کەرکوک دیاری بکرێ. لەم ناوچەیەدا چەند خێڵی گەورەی کورد لەوانە گۆران، هەورامی، زەنگنە، جاف، هەمەوەند... ژیاون و، ئەهلی هەقی پێڕەوی ئاینی یارسان، کە کەلامە دینیەکانیان بە گۆرانی وتراوە، دانیشتوی هەمان ناوچەن. هەر لەم ناوچەیەدا دو میرایەتی کوردی: ئەردەڵان و بابان بە درێژایی چەندین سەدە حوکمڕانییان کردوە.
هەندێ لەوانەی لە مێژوی ئەدەبی کوردی ئەکۆڵنەوە پێیان وایە کۆنترین تێکستی ئەدەبی کوردی بە لەهجەی گۆران نوسراوە کە ئەویش (کەلام) سرودە ئاینیەکانی یارسانە و، ئەوە بە سەرەتای دەسپێکردنی ئەدەبی کوردی دائەنێن.

لە چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەم دا مینۆرسکی و هەندێ رۆژهەڵاتناسی تر هەندێ تێکستی یارسانیان بە گۆرانی بڵاو کردۆتەوە و، لەم ساڵانەی دواییش دا هەندێ بەشی "سەرەنجام" چاپ کراوە. خوێندنەوەی ئەم تێکستانە دەری ئەخەن کە ئەو دەقانە دەماودەم گەیشتونەتە ئەم سەردەمە و. تا ئێستا هیچ بەڵگەیەکی نوسراوی کۆن نەکەوتۆتە بەر دەس جێگەی باوەڕ بێ. بە تایبەتی ئەم سرودانە بۆ بڵاوکردنەوەی گشتی نەبون، بەڵکو نهێنی بون و تەنیا لە ناو ئەهلی هەقدا بیستراوە و، لە خەڵکی تر شاردراوەتەوە.

ئەگەر سرودەکانی یارسان نهێنی بوبن و زارەکی بوبن و. هیچ کتێبێکی ئەوان لە مزگەوت و دیوەخان و کتێبخانەکان دا دەس نەکەوت بێ و، هیچ بابەتێکی ئەوان لە کۆڕە گشتیەکاندا نەخوێنرابێتەوە، ئەبێ چ کاریگەریەکی لە سەر شاعیرانی گۆران لەوانە: میرزا ئەڵماس خانی کەنولە، خانای قوبادی، میرزا شەفیعی کولیایی و جامرێزی، مەلا وەڵەد خان، بێسارانی، وەلی دێوانە، رەنجوری، مەولەوی، ئەحمەد بەگی کۆماسی... هەبوبێ، لە کاتێکدا هەندێ بەشی شانامەی فیردەوسی و، خەمسەی نیزامی... لە لایەن هەندێ لەو شاعیرانە لە فارسیەوە کراون بە کوردی گۆرانی و ئاشنایەتیەکی ئاشکرایان لە گەڵ دیوانی حافز و، کتێبەکانی سەعدی و، مەسنەوی مەولەوی دا هەبوە.

## سەرەتاکانی ئەدەبی نوسراوی کوردی: سەردەمی شەرەفخان

ئەمیر شەرەفخانی بتلیسی ساڵی (1005 ک/ 1596) لە نوسینی "شەرەفنامە" بۆتەوە.

شەرەفخان لە باری سنوری کوردستانەوە ئەڵێ:

"وابتدای ولایت کردستان از هرمز است که بر ساحل دریای هند واقع شد وازانجا بر خط مستقیم کشیده می اید تا در ولایت ملاطیه و مرعش منتهی میکردد ودر جانب شمالی این خط ولایت فارس و عراق عجم و اذربایجان وارمن است ودر طرف جنوبی دیاربکر وموصل و عراق عرب اما شعبات او از اقصای ولایت مشرق تا بنهایت دیار مغرب رسیده..." (شرفنامه، تاریخ مفصل کردستان، تالیف: شرف خان بن شمس الدین بدلیسی، به اهتمام: ولادیمیر ولیامینوف زرنوف، تهران 1377. ناشر اساطیر، ل 14)

.....

کوردیەکەی: "سنور و کەوشەنی وڵاتی کوردان کە ناوی کوردستانە لە سەر لێواری دەریای هورمزەوە کە لە سەر کەناری دەریای هیند هەڵکەوتوە – دەست پێ دەکاو لەوێوە بە خەتێکی راست دەکشێ و دێت هەتا لە مەڵبەندی مەلاتیە و مەرعەش دەبڕێتەوە.

وڵاتی فارس و عیراقی عەجەم و ئازەربایجان و ئەرمەنستانی چکۆلە و ئەرمنستانی گەورە دەکەونە لای باکوری ئەو خەتەوە. عیراقی عارەب و موصل و دیاربەکر دەبنە باشوری ئەو سنورە." (شرفنامەی شرفخانی بدلیسی، هەژار کردویە بە کوردی، نەجەف 1972. ل 30)

لە باری دابەشبونی زمان و ئادابەوە ئەڵێ:

"... طایفه اکراد چهار قسم است وزبان و اداب ایشان مغایر یکدیکر است اول کرمانج دویم لر سیم کلهر چهارم کوران."(ل، 13)

.....

لە ڕوی تایەفەوە بە کرمانج و گۆران و لوڕ و کەڵوڕ باسی ئەکا و.
کوردیەکەی: "هۆزە سەرەکیەکانی کورد لەو بارەوە کە شێوەی ئاخافتن و هێندێک ئاکار و داب و دەستور و هەڵسوکەوتیان لێک جیاوازە.. دەکرێن بە چواربەشەوە. یەکەم: کرمانج. دوەم: لوڕ. سێهەم: کەڵهوڕ. چوارەم: گۆران."(ل. 29)

لە باری دابەشبونی دینیی کوردەوە ئەڵێ:
"وبالتمام طوایف اکراد شافعی منهبند ودر شرایع و سنن حضرت خیر الانام علیه الصلوه والسلام متابعت صحب و خلفای عظام کرام و ادای صلوه وزکوه وحج و صیام جد و جهد تمام و اقدام مالاکلام دارند مکر طایفه چند از الوسات که تابع موصل و شام مثل طاسنی و خالدی و بسیان وبعضی از بختی و محمودی ودنبلی که منهب یزیدی دارند واز جمله مریدان شیخ عدی ابن المسافرند که یکی از تابعان خلفای مروانی بوده وخودرا بدو منسوب ساختەاند واعتقاد باطل ایشان آنست که شیخ عدی صوم و صلوه مارا در عهده خود گرفته در روز قیامت بی انکه مارا در معرض عتاب وخطاب دراورند ببهشت خواهند برد وباعلماء طاهر بغض و عداوت بلا نهایت دارند...." (ل. 14-15)

.....

کوردیەکەی: "زوربەی کوردەکان سوننی مەزەبن و لە سەر شوێنی ئیمامی شافیعی دەڕۆن و لەسەر بەجێهێنانی ڕێوشوێنی ئاینی خۆیان زۆر سورن و سەریان بچێ نوێژیان ناچێ و لە چونە حەج و زەکات دانندا هیچ لام و جومیان نیە و بۆ پێکهێنانی هەمو ئەرکی سەرشانیان لەمەڕ ئاینەوە هەتا بڵێی چوست و چالاک و ئامادەن و لە ڕوی فەرمانی مەلایان لارەملن و چیان پێ بسپێرن بە مو لێی لا نادەن. خزم و یارانی پێغەمبەریشیان زۆر خۆش گەرەکە.
هێندێک هۆز و تیرەی کورد کەوا کەوتونەتە ئالی موصڵ و شامەوە وەک: داسنی و خاڵتی و پەسیان و برێکیش لە مەحمودی و دونبوڵیەکان یەزیدین و لە دەستەوبەستەی شێخ عەدی کوری مسافرن کە ئەویش سەر بە پادشاکانی زنجیرەی مەروانی بوە.
ئەو ئێزەدیەکان لایان وایە: ئەو شێخ عەدی – ئادی – یەی کە لە گەلی لالەش نێژراوە ئەرکی نوێژ و ڕۆژوی یەزیدیەکانی گرتوتە ئەستۆی خۆی و دەستەبەر بوە ڕۆژی هەستانەوەی ئەودنیا بە بێ چەندوچون و پرسیار و باس و خواس بیان باتە بەهەشت. ئێزەدیەکان لە مەلا رواڵەت بینەکانی موسوڵمانان زۆر دڕدۆنگن و ڕکیان لێیان دەبێتەوە."(ل. 31-32)
لە ڕوی ئاینیەوە بە موسوڵمان و یەزیدی باسیان ئەکا. لە چەند جێگای تردا باسی مەسیحیەکانی کوردستان ئەکا، کەچی شەرەفخان باسی دینی ئەهلی هەق ناکا، لە کاتێک دا ئەو باسی ئەمارەتە کوردیەکانی ناوچەکانی ژیانی ئەوانی کردوە و. خۆی ئەو ماوەیەی لە دەرباری سەفەوی دا کاری کردوە لە گەڵ ژمارەیەکی زۆر لە پیاوە ناسراوەکانی کورد تێکەڵاوی کردوە.

لە باری دابەشبونی سیاسی و کارگێڕیەوە ئەڵێ:
"در مابین حکام کردستان ان کسانی که عشایر وقبایل ایشان بکثرت وقوتست آن حاکمان را بنام عشیرت میخوانند مثل حکاری وسهران وبابان واردلان و حاکمانی که صاحب قلعه و قصبەاند موسوم بآن قلعه وقصبه شدەاند چون حاکم حصنکیفا وبدلیس و جزیره واکیل علی هنا القیاس وچون ولایت کردستان و لورستان کوهستان و جنگلستانست در انجا انمقدار چیزی حاصل نمیشود که بخرج سکنه و متوطنانش وفا کند لاجرم

نسبت بمردم ولایات دیکر طوایف اکراد اوقات بمشقت و ریاضت میکنرانند و بی شایەی تکلف و غایەی تصلف فی نفسه طایفەی قانعند چنانچه اکثر عوام الناس ایشان اوقات بنان جاورس و ارزن میکنرانند وبطلب نان کندم و بهم رسانیدن مال و جاه بدر خانەی ارباب دول و اصحاب امل نمیروند.. (ل. 18)
وسلاطین عظام و خاقین کرام طمع در الکا وولایت ایشان نکرده محضا به پیشکش واطاعت ومتابعت که بجار و سفر ایشان (حاضر باشند) راضی کشته مقید بتسخیر نشدەاند واکر بعضی از سلاطین در فتح و تسخیر کردستان جد و جهد تمام فرمودەاند ومحنت ومشقت مالاکلام کشیدەاند اخر نادم وپشیمان کشته باز بصاحبان دادەاند مثل ولایت کرجستان و شکی و شیروان و طوالش و کیلانات و رستمدار و استراباد که در شمال ایران و محاذی کردستان واقع شده..."(ل. 19)

....

کوردیەکەی: "دەستەڵاتدارەکانی کوردستان ئەوانەی هۆزەکەیان گەورە و خاوەن زۆر و زۆر ناو بەدەرەوەن بە ناوی هۆزەکەیانەوە دەناسرێن. وەک: هەکاری، سۆران، بابان، ئەردەڵان. ئەو میر و مەزنانەش کە دژی سەخت و هەڵەموت، یان شاریان دە بەردەست دایە بە ناوی ئەو قەڵایە، یان ئەو شارەوە ناو دەبرێن. وەک فەرمانڕەوایانی: حەسەن کێف و بدلیس و جزیر و حەزۆ و ئەگێل و هی تریش.

خاکی کوردستان بە لوڕستانیشیەوە بەشی زۆری ڕەقەن و چڕ و لێرەوار و ئەرمانی ئەوەندە نیە کە بەرهەم و دەرامەتی کشت و کاڵی دانیشتوانی هەمو بە تەسەلی تێر بکا. سەبارەت بە ڕژد و کراڵی زەوی و زارەکەیان کورد لە چاو دەروبراوسێکانیان هەژار و نەدارن. سەرەڕای ئەوەش هەمویان زۆر چاوتێر و کەم چاو ئەزێرن و هەرگیز گازندە لە بەختی خۆیان ناکەن. زوربەی زۆری خێزان و ماڵ و منداڵی ڕەمەکی و بۆرەپیاوی کوردستان بەشی زۆری ساڵ بە نانی هەرزن و گارس و گاڵ ڕای دەبوێرن و لە سەر ئەو بەڵەنگازییەشەوە شوکرانەبژێرن، لە ڕێی نانی گەنم و پێخۆری گەرم و ڕایەخی نەرم و ژیانی کامەرانی و پێکەوەنانی دراو و سامانێدا ڕو ناکەنە دەرگای خونکاران و زۆرداران و هەرگیز دەستیان لە بەر نامەردان پان ناکەنەوە. پادشایانی زلیش چاویان نەبڕیوەتە وڵاتەکەیانەوە و نیازی داگیرکردنیان دەڵ نەگرتوە. تەنیا بە دیاری بۆبردن و پێشکەشکردنی چاویان لێ دەپۆشن و لێ یان گەڕاون. ئەگەر شەڕیش ڕوبدا ئەوا کوردەکان دەبەن و بەگژ دوژمنی خۆیانی دادەکەن و خۆیانی پێ دەپارێزن. دەنا لەوە بەولاوە کاریان بە کاریان نەداوە و وازیان لێ هێناون.
خۆ ئەگەر جاروبارەش وا هەڵکەوتبێ پادشایەک لەو پادشازلانە لێ بڕا بێ کە کوردستان بخاتە ژێر چەنگی خۆیەوە زۆری خوێن و ماڵ لێ بەخت کردوە و زۆر بە گرانی لە سەر کەوتوە. داگیرکەری کوردستان هەرکێ بوبێ هەرگا دەستی بۆ ئەم ئاگرە بێ ئامانە درێژکردوە لە ئەنجامدا هەر پەشیمان بۆتەوە و لە دوای داگیرکردنیشی چاری ناچار بوە دیسان هەر بە خاوەنی پێشوی ئەسپاردۆتەوە.
نمونەش گورجستان و شەکی و شیروان و تاڵش و گەیلان و ڕۆستەمدار و مازەندەران و نوسترابادە کە لە باکوری ئێران و بە سەر کوردستانەوەیە."(ل. 37-38)

لە بارەی زانایانەوە ئەڵێ:
اما در ولایت کردستان علی الخصوص در دیار عمادیه علما و فضلا بسیار است در تحصیل علوم عقلیه و نقلیه بتخصیص حدیث و فقه و صرف و نحو و کلام و منطق ومعانی واکثر متداولات کمال اهتمام بجای می اورند

ویحتمل که در بعضی علوم تالیفات و تصنیفات هم داشته باشند اما شهرت ندارند و در مطالعه کد بسیار دارند..(ل، 15)

.....

کوردییەکەی: "لە کوردستاندا بە گشتی و لە ئامید دا بە تایبەتی مەلاچاک و زانای هۆزان گەلێک زۆرە و زوربەیان لە هەردوازدە زانستەکاندا زۆر زەبربەدەستن و گەلێکیان خوێندۆتەوە و فرەشیان لە بەرە. ڕەنگە لە دانانی کتێبانیشدا بەشدار بوبن بەڵام لەو بارەوە ناوبانگیان دەرنەکردوە."(ل، 32)

شەرەفخان ماوەیەک لە دەرباری سەفەوی دا بەرپرسی کاروباری میر و میرایەتیە کوردەکان بوە و، شارەزاییەکی زۆری لە ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابوری و ڕۆشبیری و جەنگیی میرەکانی کوردستان و عەشیرەتەکانیان و، تەنانەت وردەکاری ناوی بنەماڵە و نەوە و وەچەکانیان و، لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیان دا هەبوە. سەرەڕای ئەمانەش بنەماڵەکەیان کتێبخانەیەکی دەوڵەمەندی هەبوە. شەرەفخان خۆی لە کتێبەکەی دا ئاماژە بۆ دەیان سەرچاوەی دەگمەنی مێژو ئەکا کە سودی لێ وەرگرتون. ئەولیا چەلەبی کە لە کاتی داگیرکردنی بتلیس دا ئامادەی ڕوداوەکە بوە باسی تالانکردنی کتێبخانە گەورەکەیان ئەکا.
لەو سەردەمەدا ئەدەبی نوسراوی کوردی، چ شیعر و هۆنراوە و چ پەخشان، ئەبێ هێشتا لە دایک نەبوبێ، یان هێشتا نەگەیشتبێتە ئاستێکی ئەوتۆ کە باس بکرێ، ئەگینا وەکو بە ستایشەوە ناوی هەندێ لە زاناکانی کوردی هێناوە، کە لە مزگەوتەکان دا دەرسیان وتۆتەوە، یان بە زمانەکانی فارسی و عەرەبی کتێبیان داناوە، باسی ئەوانەشی ئەکرد کە بە کوردی شیعر و کتێبیان نوسی بێ.
شەرەفخان لە بارەی شیعر و ئەدەبیاتی کوردییەوە ئەڵێ:
"... و در مطالعه کد بسیار دارند واز فضایل وحیثیات رسمی و عرفی مثل شعر و انشا وحسن خط وطرز اختلاط که باعث تقرب حکام و سلاطین وسبب ازدیاد مناصب علیه نزد پادشاهان معدلت کزین میباشد چندان بهره ندارند..."(ل 15)

......

کوردییەکەی: "مەلاکانی کورد لەمەڕ ئەو زانست و هونەرانەوە کە زانین و فێربونیان دەرگای بارەگای پادشایانی ئێران و توران بە ڕودا دەکاتەوە و لە سایەی ئەوانەوە دەبن بە خاوەنی پایە و مایە. ڕەنجێکیان نەداوە و هیچ بۆی تێ نەکۆشاون."(ل 33)

شەرەفنامە ساڵی 1005 ک/ 1596 ز کۆتایی بە نوسینی هاتوە.
مەلای جزیری و ئەحمەدی خانی کە دو ئەدیبی هەڵکەوتوی کورد و، لە دانەرانی بناغەی مەدرەسەی ئەدەبیی کرمانجین، بە پێی هەندێ لێکۆڵینەوە سەردەمی ژیانیان کەوتۆتە دوای نوسینی شەرەفنامەوە.
مەلای جزیری، لە ساڵانی (1000 – 1070 ک/ 1590 – 1660 ز) ژیاوە.
فەقێ تەیران، کە ئەویش شاعیرێکی هەمان مەدرەسەیە، ئەبێ ئەویش هاوزەمانی ئەم بوبێ.
ئەحمەدی خانی، لە ساڵانی (1061 – 1119 ک/ 1650 – 1707 ز) ژیاوە.
حارسی بتلیسی، ساڵی 1758 ز داستانی "لەیل و مەجنون" ی هۆنیوەتەوە.
نەک هەر شاعیرانی مەدرەسەی ئەدەبیی کرمانجی، بەڵکو سەرهەڵدان و دەرکەوتنی شاعیرانی مەدرەسەی ئەدەبیی گۆرانیش دیسان کەوتۆتە دوای نوسینی شەرەفنامە.
مەلا مستەفای بێسارانی، لە ساڵانی (1053- 1113 ک/ 1641- 1702 ز) ژیاوە

خانای قوبادی لە سالآنی (1083 – 1168 ک) ژیاوە.
میرزا شەفیعی کولیایی (هاوزەمانی خانا بوە).
میرزا ئەڵماس خانی کەنولەیی، هاوزەمانی نادر شا (1100 – 1160 ک) بوە.

لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کە خودی کتێبی شەرەفنامە دابنرێ بە وێستگەی جیاکردنەوەی قۆناغەکانی پێش و پاش سەرهەڵدانی ئەدەبی نوسراوی کوردی، بەڵکو:

یەکەم، شەرەفنامە بەشێکی زۆری تەرخان کراوە بۆ گێرانەوەی ململانێی خوێناوی رۆم و عەجەم لە سەر ئەرزی کوردستان و، ململانێی ناوخۆی ئەمیرەکانی کورد لە گەڵ یەکتری. لە هەلومەرجێکی وەها شێواو و نائارام دا، کە شەرەفنامە بەشێکی لێ باس کردوە، نە "شار" گەورە ئەبێ و گەشە ئەکا و، نە ناوەندی بەهێزی فەرهەنگی دائەمەزرێ. بە تایبەتی کە لە سەرانسەری قەڵەمڕەوی میرایەتیە کوردەکان دا جگە لە "گوند" و "قەسەبە" باسی شاری گەورە نابینرێ.

دوەم، شەرەفنامە بەڵگەیەکی گرنگە بۆ نەبونی ئەدەبی نوسراو بە زمانی کوردی پێش ساڵی 1000 ک. بە واتەیەکی تر ئەدەبی نوسراوی کوردی بە هەمو لەهجە جیاوازەکانیەوە دوای ئەو مێژوە سەری هەڵداوە و گەشاوەتەوە.

سێیەم، دەیان ساڵ دوای ئەو روداوانەی کە شەرەفنامە تا ساڵی 1005 ز گێراویێتیەوە، شەڕ لە نێوان رۆم و عەجەم دا هەر بەردەوام بوە. لەو ماوەیەدا دو جار ئاشتی تێکەوتوە: جاری یەکەم ساڵی (1022 ک/ 1613 ز) و جاری دوەم ساڵی 1049 ک. ئاشتی یەکەم ئەشێ بە رێککەوتنی جەنگیی– ئاگربڕی کاتی و راگرتنی کاتیی شەڕ دابنرێ. ماوەیەکی کورتی خایاندوە و دیسانەوە شەڕ هەڵگیرساوەتەوە. بەڵام ئاشتی دوەم، کە رێککەوتنی زەهاوی بە دوادا هاتوە، ئەشێ بە رێککەوتنێکی سیاسی - فرە بابەت دابنرێ کە ئیتر سنوری هەردو دەوڵەتی تێدا دیاری کرا و، لە ئەنجامی ئەوەش دا کوردستان و ئەمارەتەکانی دابەش کران. ئەمارەتەکانی لوڕستان و ئەردەڵان و موکریان بە یەکجاری کەوتنە ژێر دەسەڵاتی ئێرانەوە، ئەمارەتەکانی بابان، سۆران، بادینان، هەکاری، جزیرەی بۆتان، بتلیس، کەوتنە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیەوە.
ئەم رێککەوتنە ئاسایشی گشتی و ئارامی تەواوی نەهێنایە کوردستانەوە، چونکە ململانێی میرایەتیە کوردەکان لە ناو خۆیان دا بەردەوام بو. بەڵام جێگیربونی هەردو دەوڵەت و دیاریکردنی سنوری بەینیان و تابعیەتی عەشیرەتەکان و قەڵاکان و ناوچەکان، تا سەردەمێکی درێژ کۆتایی هێنا بە لەشکرکێشیە گەورە وێرانکەرەکانی ئەو دو دەوڵەتە لە کوردستان دا.
جێبەجێکردنی پەیماننامەی زەهاو، دامەزران و جێگیربونی هەردو دەوڵەتی سەفەوی – ئێرانی و، دەوڵەتی عوسمانی و، دابەش بونی کوردستان و میرایەتیە کوردەکان بە سەر ئەم دو دەوڵەتەدا و، جێگیربونی میرایەتیە کوردیەکان هەر یەکەیان لە ناوچەی خۆی دا... چەندین ئەنجامی لێ کەوتۆتەوە، کە یەکێکیان سەرهەڵدانی ئەدەبی نوسراوی کوردیە وەکو یەکێ لە پێویستیەکانی بەردەوامیی ئەمارەتە کوردیەکان. لە ناوچەی ئەمارەتی ئەردەڵان و بابان دا لەهجەی گۆران و، لە ناوچەی ئەمارەتی بۆتان و بتلیس و هەکاری دا لەهجەی کرمانجی سەرو و، دوای ئەوانیش لە ناوچەی ئەمارەتی بابان دا لەهجەی کرمانجی خوارو بون بە زمانی نوسینی شیعری کوردی.

تا ئێستا تێکستی کوردی به هیچ لههجهیهک به دهستهوه نیه بکرێته سهرهتایهکی باوهڕپێکراو و بهڵگهدار. ئهوسا مهدرهسهی ئهدهبیی بابان هێشتا دروست نهبوه، له ڕۆژههڵاتی کوردستان به ههورامی و، له باکوری کوردستان به لههجهی کرمانجی سهرو، بێ ئهوهی ئاگایان له یهکتری بێ، یا نوسینهکانیان بگاته یهک، یا تهنانهت بگاته یهکتری، یا ئهگهر گهیشتبێ له یهکتری تێ گهیشتبن.
ئهدهبی کوردی به شیعر دهستی پێ کردوه. هۆنینهوهی شیعری کوردی له کهیهوه و له چ ڕۆژگارێک و له سهر دهستی کام شاعیردا دهستی پێ کردوه هێشتا دیاری نهکراوه. ئێستا بهرههمی ئهدهبی به 3 لههجهی جیاواز له بهر دهستدایه، که ئهشێ به 3 مهدرهسهی ئهدهبی ناو ببرێن:
مهدرهسهی ئهدهبیی گۆران
مهدرهسهی ئهدهبیی کرمانجی
مهدرهسهی ئهدهبیی بابان

# مەدرەسەی ئەدەبیی گۆران

سەرەتاکانی شیعری گۆران
جوگرافیای شیعری گۆران
بابەتەکانی شیعری گۆران

ئەمیر شەرەفخانی بتلیسی، کوردی بە سەر چوار بەش دا دابەش کردوە: کرمانج، لور، کەلهور، گۆران. دیارە لەو کاتەدا هێشتا کرمانجی خوارو نەبۆتە هێزێکی دیار و گەورە.
گۆران، بە تەنیا خێڵێک نەوتراوە، بەڵکو چەندین خێڵی گەورەی نیشتەجێی ناوچەیەکی فراوانی کوردستان بون و، زمانی دانیشتوانی ناوچەکەیشیان بە گۆرانی ناسراوە. هەورامان بەشێ بوە لەو ناوچەیە. لە ناو زاناکانی ئیسلام دا دەیان کەس هەڵکەوتون نوسەری بابەتی دینی و فیقهی، لێکدەرەوەی کتێبی دژوار، قازی و مامۆستا بون، کە نازناوی "گۆرانی" یان هەڵگرتوە.

## سەرەتاکانی شیعری گۆران

رەنگە نەتوانرێ کۆنترین تێکستی شیعری نوسراو بە لەهجەی گۆران دیاری بکرێ.
هەندێ باباتاهیری عوریان بە سەرەتا دائەنێن
هەندێک مەلا پەرێشان
هەندێک سرودەکانی کاکەییەکان
ئەگەر هەر کام لەمانە بە سەرەتا دابنرێ هێشتا ئەشێ شیعری هەورامی، بە بەراورد لەگەڵ شیعری کرمانجی سەرو و کرمانجی خوارو، بە یەکێ لە کۆنترین تێکستی شیعری نوسراوی کوردی دابنرێ.

ئەگەر شیعرەکانی مەلای جەزیری، ئەحمەدی خانی، عەلی حەریری، پرتەو بەگی هەکاری ...... دامەزرێنەرانی مەدرەسەی ئەدەبیی کرمانجی سەرو دابنرێن و، ئەگەر شیعرەکانی نالی، سالم، کوردی، دامەزرێنەرانی قوتابخانەی شیعری بابان و.
ئەگەر نوسینەکانی مەولانا خالید (1193– 1242 ز) و شێخ حسێنی قازی (1225– 1292 ز) بە سەرەتای نوسینی پەخشانی کرمانجی خوارو دابنرێ و، نوسینەکانی مەلا مەحمودی بایەزیدی بە سەرەتای نوسینی پەخشانی کرمانجی سەرو دابنرێ، هێشتا تێکستەکانی شیعری هەورامی لەوان کۆنترن.

## جوگرافیای شیعری گۆران

ئەوانەی بە هەورامی شیعریان هۆنیوەتەوە لە ناوچەیەکی فراوان دا ئەبینرێن. کرماشان، هەورامان، سنە، سلێمانی، گەرمیان، کەرکوک و تیرەکانی جاف، زەنگنە، هەمەوەند، جەباری....

مەلا مستەفای بێسارانی
خانای قوبادی
ئەڵماس خانی کەنولە
میرزا شەفیعی کولیایی
میرزا شەفیعی جامرێزی
مەلا وەلەد خانی جاف
وەلی دێوانە
مەولانا خالیدی شارەزوری
مەولەوی تاوگۆزی
ئەحمەد بەگی کۆماسی
مەلا عومەری رەنجوری
حەمە ئاغای غەمناکی زەنگنە
حەمە ئاغای دەربەندفەقەرە - تالعی
سەید یاقوی ماهیدەشت
سەید فەتاحی جەباری
فەقێ قادری هەمەوەند

لە شوێنی ژیانی ئەم شاعیرانەدا ئەشێ چەند ئەنجامێ دەربهێنرێ:

یەکەم، دانیشتوانی شوێنی ژیان و مانەوە و ناسینی هەندێ لەم شاعیرانە گۆران نەبون و بە هەورامی نادوێن.

دوەم، هەندێ لەم شاعیرانە لە سنوری ئەمارەتی ئەردەڵان یان لە ژێر سایەی والیەکانی ئەردەڵان دا ئەبون.

سێیەم، ئەم زمانە ئەدەبیە گەیشتۆتە شوێنی دوری وەکو کەرکوک، کەچی نەگەیشتۆتە موکریان.

چوارەم، "کەلام" ی دینی ئەهلی هەق یان وەکو لە کوردستانی عیراق پێیان ئەڵێن "کاکەییەکان" و شیعری شاعیرەکانیان بەم زمانە هۆنیوەتەوە. کاکەیی پەرتن، لە خواروی موسڵ وخۆرئاوای هەولێر، خۆرئاوای کەرکوک، خانەقین، مەندەلی، هەڵەبجە ... نیشتەجێن.

## بابەتەکانی ئەدەبی گۆران

بابەتەکانی ئەدەبی گۆران جۆراوجۆر و فرەبابەتن. گەنجینەیەکی دەوڵەمەندی ئەدەبی، هەروەها گەنجینەیەکی دەوڵەمەندی فیکر و فەلسەفە و عەقیدەی دینی گرتۆتەوە. ئەوەی جێی سەرنجە هەموی بە شیعر هۆنراوەتەوە و تا ئێستا دیار نیە هیچ بابەتێ لەو سەردەمانەدا بە پەخشان نوسرابێ.

بابەتەکانی بە گشتی بریتین لە:

یەکەم، شیعری "غینائی"، بابەتەکانی:

یەکەم. 1: جوانی سروشت

یەکەم. 2: دڵداری ناکام

یەکەم. 3: کڕوزانەوە، دڵداری یەکلایەنە، خۆبچوککردنەوە، خۆ سوککردن، پەیمانشکێنی، بە ئاوات نەگەیشتن، مردن.

یەکەم. 4: دوبارەکردنەوەی رەمزە عەشقیەکانی ئەدەبی فارسی: شیرین و فەرهاد، مەجنون و لەیلا، یوسف و زلێخا و، شێخی سەنعان... کە هەمویان نیشانەن بۆ سەرەنجامی تراجیدی.

یەکەم. 5: هەندێ دیاردەی باو: خەمینی، سکاڵا لە پیری، لاوانەوە، گۆڕینەوەی نامە.

دوەم، هۆنراوەی داستانی، بابەتەکانی:

دوەم. 1: داستانی دڵداری

مەنیجە و بیژەن

دوەم. 2: داستانی ئەخلاقی

یوسف و زلێخا

دوەم. 3: داستانی جەنگی

نادرنامە

سێیەم، هۆنراوەی دینی، بابەتەکانی:

سێیەم. 1: موناجات

نمونە 1: رەنجوری

(دیوانی رەنجوری، ل: 56)

نمونە 2: خانای قوبادی

نمونە 3: مەولانا خالید

سێیەم. 2: میعراجنامە

نمونە 1: رەنجوری

سێیەم. 3: عەقیدەی ئیسلامی (ئەهلی تەسەننون)

نمونە 1: شێخ جەسیمی تەختەیی

نمونە 2: مەولەوی، بڕوانە:

(العقيدة المرضية، هۆنینەوەی مەولەوی، 2452 بەیت شیعری کوردیە، بڵاوکردنەوەی محي الدين صبري النعيمي، قاهيرة – مصر، 1352)

نمونه 3: فەقێ قادری هەمەوەند، بڕوانە:
(کۆمەڵەی شیعری فەقێ قادری هەمەوەند، مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم، بەغداد، 1980)
سێیەم. 4: عەقیدەی ئیسلامی (ئەهلی تەشەیوع)
نمونە 1: مەلا پەرێشان، بڕوانە:
دیوانی مەلا پەرێشان، چاپی کرماشان
هەروەها چەند بەشی بە زنجیرە لە رۆژنامەی "کوردستان" ی چاپی تاران دا بڵاوکراوەتەوە.
سێیەم. 5: ئەهلی حەق (کاکەیی)
سەرئەنجام: ئایینی یارسان، طیب طاهری، چاپی هەولێر، 2007.
سەرئەنجام: فەرهەنگی یارسان، طیب طاهری، چاپی هەولێر، 2009.

چوارەم. هۆنراوەی فێرکاری
نمونە 1: مەلا خزری رواری
نمونە 2: شێخ وەسیمی تەختەیی

## ئایا لەهجەی گۆران زمانی رەسمی بوە؟

هەندێ لە نوسەرانی کورد ئەڵێن لەهجەی گۆران زمانی رەسمیی میرایەتی ئەردەڵان بوە. بۆ نمونە:
محەمەد ئەمین هەورامی لە ل 16 کتێبی "لەیلێ و مەجنون" بەغداد، 1985. هەمان بۆچون دەرئەبڕێ. لەم بارەیەوە نوسیویێتی:
"بە هەر حاڵ زاری کوردی هەورامانی (گۆران) کۆنترین زاری کوردیی‌یە کە شیعر و پەخشان و رێڕەوی دینی پێ رازێنراوەتەوە. ئەم شێوازە لە کۆنەوە رواڵەتی، یاخود ئەرکێکی دینی کەوتە سەر، دەوروبەری 800 کۆچی کاتی ئاشکرا بونی دینی کاکەیی (ئەهلی هەق) سرودەکان و رێڕەو پەخشان ئەریتی دینیەکانیان بە گۆران وتراون لە بەر کراون و فەرمانیان پێ کرا.
"ئاشکراشە، کە سەرانسەری فەرمانڕەوایی بابا ئەردەڵانی شان بە شانی زمانی دینی (ئەهلی هەق) هەر زمانی رەسمی بوە"
هەروەها:
د مارف خەزنەدار، لە (ل197) ی بەرگی سێیەمی "مێژوی ئەدەبی کوردی" دا نوسیویێتی:
"بەڵام زمانی رەسمی خوێندن و نوسین و شیعروتن بە دیالێکتی گۆران بو، بە تایبەتی لە ئەردەڵاندا. "
............
زمانی رەسمی، واتە زمانی بەکارهێنراوی ناو داودەزگا رەسمیەکانی حکومەت و نامەو نامەکاری نێوان فەرمانڕەواکان. ئەوەی زانراوە هیچ لەهجەیەکی زمانی کوردی لە هیچ میرایەتیەکی کوردی دا، لە سەرانسەری کوردستاندا، زمانی رەسمی نەبوە.

میرایەتی ئەردەڵان بەشێ بوە لە دەوڵەتی ئێران. زمانی رەسمی دەوڵەتی ئێران فارسی بوە. زمانی رەسمی میرایەتی ئەردەڵان فارسی بوە. هەمو ئەو نامانەی کە لە فەرمانڕەوایانی ئەردەڵان بەجێ ماوە، چ ئەوانەی لە ناو خۆیاندا بۆ یەکتریان نوسیوە و چ ئەوانەی ناردویانە بۆ شا و کاربەدەستانی تری ئێران، بە فارسی بون.

زمانی مزگەوت و مەدرەسەکانی ئیسلام لەم ناوچەیەدا عەرەبی بوە. قورئان و حەدیس و شەریعەتی ئیسلام و زانستە دینیەکانی تێدا خوێنراوە. لە پاڵ ئەمەش دا فارسی خوێنراوە و فێری بون.

فارسی هەر ئەوە نەبوە زمانی رەسمی دەوڵەتی بوبێ بەڵکو سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی فەرهەنگ و ئەدەب و زانست بوە.

مەلا ئەبو بەکری موصەنیف، کە یەکێکە لە بلیمەتە هەڵکەوتوەکانی ناوچەکە و هەر لە ناوچەکەشدا ژیاوە و مردوە چەندین کتێبی داناوە:

سەید ئەبوبەکر کوڕی هیدایەتوڵا حوسەینی گۆرانی ساڵی 1014 مردوە لە گوندی چۆری مەریوان نێژراوە. چور لە خواروی قەڵای مەریوانە گۆیا ئەم گوندە لە لایەن خان ئەحمەد خانەوە بەو دراوە ئەو زەمانە مەریوان بەشێ بوە لە شارەزور

"الوضوح في شرح المحرر"

"طبقات الشافعية" ساڵی 1356 لە بەغداد چاپ کراوە، دەربارەی ئەوانەی کە قسەکانی ئیمامی شافعیان وتۆتەوە

"سیراج الطریق" و"ریاض الخلود"، کە دو کتێبن لە حیکمەت و فەلسەفە و ئامۆژگاری دا بە فارسی.

"سیراج الطریق" ی ساڵی 948 داناوە، عیرفان و ئەخلاق، چیرۆک و شیعری تیایە

"ریاض الخلود" ی ساڵی 989 نوسیوە.

| | |
|---|---|
| در آن دم کاین معانی روی بنمود | زهجرت نهصد و هشتاد و نه بود |
| زمانی پرفتن شهری پر آشوب | نه دانش مطلوب و نه علم مرغوب |
| تو گونی هردم از چرخ مقوس | غم و اندوه باریدی بهرکس |
| خصوصا بندەرا در کوهساری | دهی بود از ولایت برکناری |
| گهی از ظالمان اهل اسلام | بغارت میشدی هر صبح و هر شام |

....

| | |
|---|---|
| دراین اشفتگی و زشت حالی | جهان را دیدم از تصنیف خالی |
| زبهر اخرت این چند اوراق | بهم بستم ز فضل حی خلاق... |

"لەو کاتەدا کە ئەم مەعنایانە رویەک بنوێنن
ساڵی کۆچی نۆسەدو هەشتاونۆ بو
زەمانێ پڕ فیتنە، شارێ پڕ ئاشوب
نە دانش مەتلوب، نە عیلم مەرغوب
تۆ ئەڵێی هەردەم لە چەرخی مقوس
غەم و ئەندوە لە هەمو کەس باریوە
بە تایبەتی بەندە لە کۆسارێ
گوندێکی بو، لە ولایەت بەرکەنار بو
گاهێ لە لایەن زاڵمانی ئەهلی ئیسلامەوە بەیانی و ئێوارە تاڵان ئەکرا

لەم ئاشوفتەگی و حاڵخراپیەدا
جیهانم بینی لە تەصنیف خالی
لە پێناوی ئاخیرەتدا ئەم چەند پەڕانەم پێکەوە بەست بە فەزلی حی خلاق" (محمد مکری، مجلە یادگار، سال پنجم، شمارە ششم وهفتم، ص 38-48.)

ئەیتوانی چیرۆکەکانی، کە سادە و پێویستی بە زمانی ئاڵۆز نیە، ئەم دو کتێبە بە کوردی گۆرانی بنوسێ. بەڵام هەردوکیانی بە فارسی نوسیوە. لە بەر ئەوەی نەک زمانی فارسی تەنیا زمانی رەسمی دەوڵەتی بوە، بەڵکو زمانی ناو دیوەخان و مزگەوت و کۆڕە ئەدەبیەکانی چینی دەسەڵاتداریش بوە.
(تێبینی) د محمد مکری لە دو ژمارەی مجلە یادگاردا باسی مەلا ئەبوبەکری موصەنیف ئەکا و، چیرۆکێ لە یەکێ کتێبەکانیەوە ئەگوێزێتەوە، کە لە سەر گۆلی زرێبار نوسیوێتی ئەوەندە سادەیە بلیمەتیکی وەکو ئەو ئەگەر بیویستایە ئەیتوانی بە زمانەکەی خۆی کە پێی دواوە بنوسێ.

هیچ نیشانەیەک نیە بۆ ئەوەی هیچکام لە ئەندامانی بنەماڵەی ئەردەڵان، بە تایبەتی ئەوانەی گەیشتونەتە پلەی "والی کوردستان" بایەخیان دابێ بە لەهجەی گۆران و، هانی کەسێکیان دابێ بەم لەهجەیە مێژوی بنەماڵەکەیان بنوسێتەوە، یان داستان و جەنگنامە و شیعریان پێ دابنێ، بەڵکو پێچەوانەکەی ئەبینرێ:

یەکەم، هەمو نامەکاریەکانی نێوان ئەردەڵان و ناوەندی دەسەڵاتی ئێرانی، لە هەر پایتەختێکی دەوڵەت بوبێ و، لە سەردەمی هەر شا و زنجیرەیەک دا بوبێ، سەفەوی، ئەفشاری، زەند، قاجاری بە فارسی بوە.

دوەم، هەمو ئەو مێژوانەی میرایەتی ئەردەڵان کە لە سەر داوای والیەکانی نوسراونەتەوە، یان نوسەرەکان بە دەسپێشخەری خۆیان نوسیویانەتەوە، بە فارسی بون:
زیاتر لە 10 مێژوی ئەردەڵان، کە مێژونوسەکانی ئەردەڵان نوسیویانە، لەوانە قازی مەلا محەمەد شەریف، خوسرەو بەگی ئەردەڵان، مەستورە، میرزا شوکروڵا... هەمویان بە زمانی فارسی نوسراون.
حوزنی موکریانی کە یەکێکیانی بە خەتی دانەرەکەی لە بەر دەستدا بوە، چەند بەشێکی لە فارسیەوە کردوە بە کوردی و بە زنجیرە لە ژمارە 32 ی بەرگی شەشەمی دەنگی گێتیی تازە دا بڵاویکردۆتەوە.

سێیەم، هەمو ئەو شاعیرانەی لەم بنەماڵەیەدا هەڵکەوتون، یا نزیک بون بەم بنەماڵەیە، شیعر و دیوانیان بە فارسی داناوە نەک بە لەهجەی گۆران:
خەسرەو بەگی موسەنیف جەوهەری
حەسەنعەلی خان
خەسرەو خانی ناکام
مەستورە، ماهشەرەف خانم
مەستورە سەرەڕای مێژوەکەی و کتێبی عەقیدەکەی سەراپای دیوانەکەی بە فارسیە. تەنیا شیعرێکی کوردی بابانی ئەدرێتە پاڵ مەستورە ئەویش تەرجومەی شیعرێکی فارسی مەستورەیە پیرەمێرد

کردویەتی بە کوردی و لە چلەکان دا لە گەڵ زنجیرەیەک شیعری تری مەستورە لە ژین دا بڵاوی کردونەتەوە.
میرزا عەبدوڵای مونشی متخلص بە رەونەق "حديقه امان اللهی" کە: "تەزکەرە" یەکە بۆ باسی ژیانی شاعیرەکانی ئەردەڵان و نمونەی شیعرەکانیان هەموی بۆ ئەوانە تەرخان کردوە کە بە فارسی شیعریان داناوە، یەک ئاماژەی تێدا نیە بۆ هیچ شاعیرێ کە بە کوردی شیعری دانابێ. رەونەق خۆیشی شیعرەکانی بە فارسی هەڵبەستوە.
رەنگە هۆیەکی گرنگی پاشەکشەی مەدرەسەی ئەدەبیی گۆران، بەو دەوڵەمەندیە زۆرەیەوە، لە بەردەم مەدرەسەی بابان دا ئەوە بوبێ، والیەکانی ئەردەڵان نوسینیان بەم لەهجەیە فەرامۆش کردوە، لە بەرامبەردا میرەکانی بابان هانی شاعیرەکانی ئەمارەتەکەی خۆیان داوە بەم زمانە بنوسن.
بنەماڵەی ئەردەڵان تێکەڵاو بون لە گەڵ بنەماڵەی شاکانی ئێران، ژن و ژنخوازییان کەوتۆتە بەینەوە:
خان ئەحمەد خان، لە دەرباری سەفەوی دا بارمتە بوە و، لەوێ پەروەردە کراوە، ژنەکەی لە بنەماڵەی شاکانی سەفەوی بوە و، هەڵۆخانی باوکی لە سەر داوای شا بە گیراوی رەوانەی ئەسفەهان کردوە.
سوهرابی کوڕی خان ئەحمەد خان لە دەرباری سەفەوی دا پەروەردە کراوە
ئەمانوڵا خان، سەرو ناز خانمی لە فەتحعەلی شاوە بۆ هاوسەری بە دیاری پێ گەیشتوە
خەسرەو خانی کوڕی ئەمانوڵاخان، توبا خانمی کچی فەتحعەلی شا، بۆتە هاوسەری، کە ئەویش چەند کوڕێکی لێ کەوتۆتەوە نیوە ئەردەڵانی و نیوە قاجاری بون، هەر یەکەیان بۆ ماوەیەک والی سنە بون.
جگە لەم خزمایەتیە هاومەزهبی شیعەیەتی سەرانی بنەماڵەی ئەردەڵان و بنەماڵەی شای ئێران و مەزهەبی رەسمی ئێران هۆیەکی تری نزیکی ئەم دو بنەماڵەیە بوە، کە کاریگەری هەبوە لە سەر باری رۆشنبیری و، فەرهەنگی بە گشتی.

زمانی عەرەبی بە هۆی ئاینی ئیسلام و ناوەندە فەرهەنگیە بەهێزەکانی قاهیرە، شام، بەغدا، مەکە و مەدینە
زمانی فارسی بە هۆی زیندوکردنەوەی مێژوی ئێران و ناوەندە فەرهەنگیە بەهێزەکانی خوراسان و، دواتر تەورێز، شیراز، مەشهەد، ئەسفەهان، تاران...
زمانی تورکی لە دوای ئەوان بە هۆی دروستبونی دەوڵەتی عوسمانیەوە ...
ئەم زمانانە وەکو زمانی رەسمی کاروباری دەوڵەتداری و زمانی نوسینی ئەدەبی لە ناوچەکەدا بڵاوبونەوە.
کورد لەبەر ئەوەی نەیتوانی دەوڵەتی سەربەخۆی تایبەت بە خۆی دابمەزرێنێ تا سەردەمێکی درەنگ زمانی کوردی نەبو بە زمانی نوسینی ئەدەبی و زمانی کوردی هەرگیز نەبو بە زمانێکی یەکگرتو، هیچ لەهجەیەکیشی هیچ کاتێک و لە هیچ سەردەمێک دا، نەبو بە زمانی رەسمی هیچ یەکێ لە میرایەتیەکانی کورد. جا ئەبێ ئەو زمانە رەسمیەی گۆران، کە ئەمان باسی ئەکەن، لە کوێی ئەردەڵان کاری پێ کرابێ؟

**سەرچاوە:**

دیوانی بێسارانی، بەرگی یەکەم، کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی کیومرث نیک رفتار، بەغداد، 1982.
دیوانی بێسارانی، کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی حەکیم مەلا سالح، سەنەندوج، 1375.
دیوانی رەنجوری، کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی محەمەد عەلی قەرەداخی، بەغداد، 1983.

دیوانی مەولەوی، کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس، بەغداد،
دیوانی مەولەوی، کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس، لە گەڵ چەند لێکۆڵینەوەیەکی گۆران، محەمەدی مەلا کەریم، حەکیم مەلا ساڵح، ئەنوەر قادر محەمەد، دەزگای سەردەم، سلێمانی، 2006.
دیوانی وەلی دێوانە، کۆکردنەوەی مەحمود خاکی، سلێمانی، 1970. چاپی دوەم، سلێمانی،...
دیوانی وەلی دێوانە، ژیان و بەسەرهات و هۆنراوە، کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی، عوسمان هەورامی، بەغداد، 1976.
دیوانی ئەحمەد بەگی کۆماسی، کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی محەمەد حەلی سوڵتانی، تاران، 1384.
کەشکۆڵی شێخ موئمینی مەردۆخی، ئەنوەری سوڵتانی، چاپی لەندەن، هەروەها چاپی هەولێر
کەشکۆڵی شیعری کوردی، بەرگی 1 – 6، محەمەد عەلی قەرەداخی، چاپی بەغداد
حەدیقەی سوڵتانی، محەمەد عەلی سوڵتانی، چاپی تاران
ڕۆژنامەی کوردستان، چاپی تاران، ژمارەکانی ساڵانی 1959 – 1961.

# داستانی هۆنراوە

یەکێ لە تایبەتمەندییەکانی ئەدەبی مەدرەسەی گۆران هۆنینەوەی داستانە. داستانەکان هەموی بە کێشی دە بڕگەیی و بە قاڵبی مەسنەوی هۆنراونەتەوە. گەنجینەیەکی گەورەی زمان و فەرهەنگ و نەریتی کوردەوارین. لە مەدرەسەی ئەدەبی بابان دا ئەم بابەتە نەبوە، یا ئەوەندە دەگمەنە بە نەبو دانەنرێ. لە مەدرەسەی ئەدەبی کرمانجی سەروو دا هەمان تایبەتمەندی هەیە. بەم لەهجەیە چەندین داستان هۆنراونەتەوە. بەڵام ئەوەی بڵاو کراوەتەوە بە چەندایەتی کەمترە لە دانراوەکانی هەورامی. رەنگە شتێ کە ئەم دو مەدرەسەیە لە یەک جیا بکاتەوە ئەوەبێ لە مەدرەسەی کرمانجی دا، چیرۆکی زارەکی کوردی، کە لە ناو خەڵک دا، باو بون بۆتە کەرەسەتەی هۆنینەوەی داستانەکە لەوانە مەم و زینی خانی، کەچی لە داستانە هەورامیەکان دا سەرچاوەکانیان شاکارە ئەدەبیەکانی زمانی فارسین.

1. زانیاری دەربارەی داستانەکان
2. پۆلێنی داستانەکان
3. سەرچاوەی داستانەکان

## زانیاری دەربارەی داستانەکان

### سەرچاوەی ونبو

کورد لە کوردستانی عیراق دا کتێبخانەیەکی گشتی نەبوە ببێتە ناوەندی کۆکردنەوەی دەستنوس. لە هەندێ لە شارەکانی دا هەندێ کتێبخانەی گشتی هەبون ئەوانەش حکومەتی عیراق وەکو دەزگای ناوچەیی دای مەزراندون تەنیا کتێبی چاپکراویان تێدا بوە.

هەندێ دەسنوس رەنگە لە مەکتەبەی تایبەتی هەندێ بنەماڵە و هەندێ مزگەوت و مەدرەسەدا هەبوبێ، بەڵام هیچ کات مەکتەبەیەک نەبوە ناوەندی کۆکردنەوەی دەسنوسە کوردی و ناکوردیەکانی ناو کوردستان بوبێ.
نائارامی هەلومەرجی سیاسی کوردستان هەروەکو چەند جار بۆتە هۆی ویرانبونی شار و دێهاتی کوردستان، بەوجۆرەش بۆتە هۆی فەوتانی هەرچی لە ناو ئەو خانو و ماڵانەدا بوە لە ناو ئەوانەدا بەڵگە و دەسنوس.
لە ناو گۆڤار و رۆژنامە کوردیەکان دا هەندێ جار هەندێ لە نوسەران باسیان لە هەندێ سەرچاوەی بە نرخ کردوە، ئێستا کەس سەروسۆراخیان نازانێ، بۆ نمونە:

**نمونە 1:**

حسێن حوزنی موکریانی ئەو دەمەی سەرنوسەری گۆڤاری "دەنگی گیتیی تازە" بوە لە بەغداد لە وتارێک دا کە بە دو بەش لە ژێر سەردێری "نامە نوسراوەکانی کوردی" کە دەربارەی ئەم بابەتەی نوسیوە، لە باتی "داستان" وشەی "نامە" ی بە کار هێناوە. (دەنگی گێتیی تازە، ژ 12 ساڵی سێیەم 21ی کانونی دوەمی 1946)
لە بەشی دوەمی وتارەکەی دا نوسیویتی:
"بەڵام ناشوکری نەبێ گەلێک لەو نامانە ئەوانەیان تێدا نیە. هەروەک ئێستا لە لای خۆم چەند نامەییکی کەوا لەم وتارەدا ناویان دەبەم، وە یەک دو شیعری سەرەتایەکانیشیان نیشان دەدەم، دیار دەکرێت کە لە هیچ کامیان دا ناونیشانی خاوەند و نویسەر و ساڵی داناني نیە. وە لە لای گەلێ کەسانی دیکەش هەمو جۆرە نامەییکی وا هەن کە مونەلیفیان نادیارە. وە لە نویسینەوەشیان دا گەلێک شێوە و تەرزی نەزمی لە لایەن نویسەرەکانەوە تێک دراوە." حوزنی بۆ نمونە ناوی شەش لەو نامانەی هێناوە کە لای خۆی هەبون: وەرەق و گوڵ. شادِ نامە. دەرەخت نامە. برزو و فەلامرز نامە. بەوری بەیان نامە. جەنگ نامەی رۆستەم و زۆراب. مەنیج و بیژەن نامە. لەیلە و مەجروم. (ژ 13 ساڵی سێیەم 28ی کانونی دوەمی 1946)

حوزنی لە ژمارەیەکی تری گۆڤارەکەدا باسی دەسنوسێکی "شیرین و فەرهاد" ئەکا کە محەمەد سادق ناوێک نوسیوێتیەوە 206 لاپەڕە بوە و هەر لاپەرەیەکی 23 شیعری تێدابوە، و "بە 39 نیگاری رەنگاندراو رازاندویەتیەوە". حوزنی لەم بارەیەوە نوسیویتی ئەڵێ: "خانای قوبادی هەر چەند لە تەڕ و ئاوداری و خۆش و رێکی و سواری شیعردا هونەری نواند بێ، بەڵام محەمەد سادق نویسەر لە نوسینی و نیگار و وێنەدا شاهکاری کوردێکی نێو شاخ و کێوەکانی لادێی نیشان داوە کە لەو سەدانەدا لە دێهاتەکانی کوردستانیشدا چی هونەر و زانینێک لە کاردا بوە..." (ژ 3ی بەرگی پێنجەم، ساڵی سێیەم، 1945، دەنگی گێتیی تازە)

حوزنی لە ژێر سەرناوی "نامە و نوسراوێکی دێریکی بە نرخ: مێژوی فەرمانڕەواکانی ئەردەڵان" نوسیویتی:
"ساڵی 1244ی هیجری میرزا ئیسماعیل کوڕی مەلا محەمەد حسەین لە شاری سنە لە سەر فەرمایشتی خوسرەو خان والی کوردستان لە تەمەنی 64 ساڵی دا میژوی بنەماڵە و فەرمانڕەواکانی کوردی ئەردەڵانی لە سەرەتاوە تا ساڵی بێژراوی تەئلیف کرد. ئەو کتێبە گراندا و بە نرخی تاریخی کوردستانی ئەردەڵان کە مونەلیف بە جوانترین نوسینی نوسیوەتەوە و کەناری لاپەرەکانی زێرباڤت کردوە کە ئێستا لە دەستمان دایە، وا دو لاپەڕەی ئەو کتێبە بە قیمەتە کە 4 و 5 ن وە ناوی مونەلیف و خوسرەو خانی تێدان ئەمەیە لەم لاپەڕەی کۆوارەکەمان دا پێشکەش بە خوێندەوارە خۆشەویستەکان دەکەین.... تاد" (دەنگی گێتیی تازە، ساڵی سێیەم، بەرگی شەشەم، ژمارە 32)

حوزنی چەند بەشێکی ئەم مێژوەی کردۆتە کوردی بە زنجیرە لە گۆڤارەکەی دا بڵاویکردۆتەوە. لە گەڵ وەستانی گۆڤارەکەدا بەشەکانی تری بڵاو نەکردونەتەوە.

**نمونە 2:**

پیرەمێرد لە کۆتایی چلەکان دا ئاماژەی بۆ "یوسف و زلێخا" یەک کردوە کە رەنگە جیا بێ لەمەی بڵاو کراوەتەوە. پیرەمێرد بۆ حوزنی نوسیوە:

"استادی پر هونەری مەزن سید حزنی

تۆ لە کۆکردنەوەی یادداشتە کوردیەکاندا خمەتێکی زۆرت کردوە شیرین و خسروی خانای قوبادیت وە چنگ کەوتوە کە لای منیش هەیە جگە لەوە یوسف و زلێخایەکی تەواوی کوردیم لایە سەرداستانەکەی ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| بە تۆفیقی حق دانای لەم یەزەل | بە فەضل ئیعجاز مستەفای مورسەل |
| خودای بانی سەر بدۆ هیدایەت | بکەرون بەیان شیرین حیکایەت |
| بە لەفزی کوردی و شێوەی گۆرانی | زاهیر بو تەمام مەعنای پنهانی |

ئینجا بە تەواوی حیکایەتی یوسف و زلێخا ئەنوسێ بەڵام نالێ کێ وتویە. ئەڵێ مبارک... بو ئەی مەلا رۆستەم... ئێستا نازانم مؤلفەکەی کێیە. ئایا ئێوە یوسف و زلیخای واتان دیوە یان..." (ژین، ژ: 815. 2ی کانونی سانی 1946)

هەر لەم بارەیەوە جارێکی تر پیرەمێرد نوسیوێتی:

"استادی خۆم سید حزنی

داستانە چاپکراوەکەی شیرین و فەرهادم پێگەیشت! تۆیش رەنجی فەرهاد بۆ ئاساری کوردی ئەدەی جێی ئافەرینە یوسف و زلیخایەکی دەستخەتی تەواوم لە لایە خۆم پیری پەکی خستوم مەگەر بینێرم بۆ تۆ خوا پاداشی رەنج و ئەمەکت بداتەوە. پیرەمێردی شاگردی شاگردت" (دەنگی گێتیی تازە، بەرگ: 26/ ل:407)

هەر پیرەمێرد لە باسی دیوانی مەستورەی ئەردەڵانی دا لە ژێر سەرناوی "جەوهەری کوردی" دا نوسیوێتی:

........

"هێشتا زۆری وامان هەیە بۆمان نەهاتۆتە نوسین. لە میانەی ئەوانەدا کچە کوردێکی وەک تیشکی رۆژ لە ئاسمانی کوردستاندا بدرەوشێتەوە بە شیعر و. لە شیعرەکانی زیاتر بە خەتی شکستەی فارسی، کە ئەتوانم بڵێم لە هەمو ئێراندا وێنەی ئەو خەتە جوانە نەبینراوە. گەوهەرێکی شەوچراغی کوردستانە. مەستورە ناوە. بە خەتی خۆی شیعرەکانی خۆی و دیوانی خوسرەو خانی والی نوسراوەتەوە لە لامە. من بەش بە حاڵی خۆم کە خەتی فارسی: تەعلیق و شکستە و خەتی دیوانی و سولس و تورکی و چی و چی ... باش ئەنوسم و. لە جوانیەکەی زیاتر شارەزای قاعیدە و سەبک و شێوەیان هەم. ئاگەمە پایەی نوسینی مەستورە و شیعرەکانیشی زۆر باڵایە. چەندێک بەرە بەرە لە ژین دا کردومە بە کوردی بۆ ئەمەی دوای من یەکێک لە ژین دا کۆیان بکاتەوە لە چاپی بدا.

..........

"لە بەیازەکەدا لە پێشەوە بیست و پێنج غەزەلی لە بەحری ئەلفەوە تا بەحری سین لە ئەشعاری خوسرەو خان نوسیوە. دوای ئەوە لە ژێر سەرلەوحەی (من افکار منذبه الراقمه) دا دیوانی خۆی بەو خەتە جوانە نوسیوەتەوە. ئەگەر بمێنم ئەو خەتە بە فۆتۆگراف ئەکەم بە قلێشە و چاپی ئەکەم بۆ ئەوەی مەشقی ئەو خەتە بێن.

ئەو خەتە لە ئەوەل دێرییەوە تا دوایی دێری یەک نەسەق و یەک رەنگ، کەلیمەیەک و حەرفێکی ناڕێک و غەڵەتی تیا نیە. .. تاد" (ژین. ژ 833، 1ی ئاغستۆسی 1946)

**نمونە 3:**

محەمەد ئەمین کاردۆخی لە باسی "رەونەق" دانەری "حەدیقەی خوسرەوی" دا نوسیوتی:

"شاعیری بە ناوبانگ رەونەق

"رەونەق لە شیعری هەر یەکێ لەمانە چەند غەزەل و قەسیدەیەک هەڵئەبژێرێت و ئەیکا بە کتێب بە ناوی (حدیقەی خسروی) یەوە ئەینوسێتەوە. ئێستا کە خەریکی نوسینی ئەم وتارەم عەینی ئەو کتێبەم (بە خەتی دانەری) لە بەردەسایە. ئەم کتێبە 342 لاپەرەیە، 55 لاپەڕەی دوایی باسی ژیان و نمونەی شیعری رەونەق خۆیەتی. ئەمیش وەکو شاعیرەکانی پێش خۆی بۆ دەرخستنی هونەری خۆی هەمو شیعرەکانی بە زمانی فارسی وتوە." (گەلاوێژ، ژ 9 – 10 س 8ی ئەیلول و تشرینی یەکەمی 1947، ل 92 – 95.)

کاردۆخی ژیاننامەی چەند شاعیرێکی لەم کتێبە کردۆتە کوردی و لە گۆڤاری گەلاوێژدا بڵاوی کردۆتەوە.

ئەم کتێبە بریتیە لە ژیننامە و نمونەی شیعری کۆمەڵێ لە شاعیرانی فارسیبێژی ناوچەی ئەردەڵان. رەونەق سەرەتا کتێبەکەی بە ناوی خوسرەو خانی ناکامەوە ناو ناوە "حەدیقەی خوسرەوی" بەڵام کە خوسرەو خان مردوە ناوی کتێبەکەی گۆڕیوەو بە ناوی کورەکەیەوە ناوی ناوە "حەدیقەی ئامانوڵاهی".

ئەم کتێبە سالی 1344 هجری شمسی لە تەورێز "بتصحیح و تحشیە دکتر ع خیامپور" بە ناوی "تذکرە حدیقە امان اللهی" لە لایەن "مؤسسە تاریخ و فرهنگ ایران" ەوە چاپ کراوە. لە بەر ئەوەی دەسنوسی نوسەریان دەس نەکەوتوە و دەسنوسەکانی دەگمەن بون دانەیەکی دەسنوسی برازایەکی رەونەقیان کردۆتە بنچینەی ساخکردنەوەی کتێبەکە.

لە ناو گۆڤار و رۆژنامەکان دا چەندین باسی لەم بابەتە سەبارەت بە سەرچاوەی ئەدەبی و فەرهەنگی جۆراوجۆر هەیە، کە ئێستا چارەنوسیان دیار نیە. نازانرێ ماون یا نەماون، ئەگەر ماون لە کوێن و لای کێن.

## سەرچاوەی دۆزراوە

سامانی فەرهەنگیی کورد لە کتێبخانەکانی دەرەوەی کوردستان دا باشتر هەڵگیراون تا ناوەوەی کوردستان. رەنگە ناارامی هەلومەرجی کوردستان و، بەرتەسکی بواری بڵاو کردنەوەی زمان و ئەدەبی کوردی، ئەمە سەرەڕای بێ دەربایستی رۆشنبیرانی کورد خۆیان، کارێکی وای کردبێ بەشێکی گرنگی ئەم سامانە نەتەوەییە فەوتابێ یان هێشتا لە گۆشەی فەرامۆشی دا بێ. بەڵام کتێبخانەکانی دەرەوەی کوردستان، بە تایبەتی کتێبخانەکانی ئەڵمانیا و بەریتانیا و روسیا و بەغداد هێشتا گەنجینەی شاردراوەی گەلێ بە نرخ و هێژایان تێدایە، کە سەرچاوەی رونن بۆ لێکۆڵینەوە و ساخکردنەوەی گەلێ لەو بەرهەمانەی نە خۆیان و نە دانەرەکانیان بە خوێندەوارانی کورد ئاشنا نین.

**نمونە 1: ئاگاداریەکانی کەمال فوئاد**

د. کەمال فوئاد، لە کتێبەکەی دا بە زمانی ئەڵمانی:

Kurdische Handschriften, Wiesbaden, F. Steiner 1970

باس لە چەندین دەسنوسی کوردی ئەکا کە لە کتێبخانەکانی ئەڵمانیادا پارێزراون. لە ناو ئەوانەدا چەندین داستان و کۆمەڵە شیعری تێ دایە کە بە لەهجەی گۆران هۆنراونەتەوە. لەوانە: "شیرین و فەرهاد"، "شیرین و خەسرەو"، "خورشید و خاوەر"، "لەیل و مەجنون"، "مەنیجە و بیژەن"، "بەهرام و گولەندام"، "سەنعان و تەرسا"، "حەیدەر و سنەوبەر"، "حەوت خوانی رۆستەم"، "هەفت لەشکر"، "رۆستەم و زۆراب"، "بەوری بەیان"، "شەڕی ئیمام عەلی لە گەڵ کافران"، "شەڕی محەمەدی حەنیفە لە گەڵ کافران"، "ئیسماعیل نامە"، "نادرنامە"، "جەنگنامەی شازادە محەمەد عەلی میرزا لە گەڵ کەهیە پاشای بەغداد"، "گورگ و روباه"، "گوربە و موش"، "سوڵتان جومجومە"... هتد.

**نمونە 2: ئاگاداریەکانی ئەنوەری سوڵتانی**

ئەنوەری سوڵتانی، لە کتێبەکەی دا بە زمانی کوردی:

"21 دەسنووسی کوردی (و فارسی سەبارەت بە کورد) لە کتێبخانەکانی بەریتانیادا"، چاپی کتێبی ئەرزان، سوید، 1997.

باس لە چەندین دەسنوسی کوردی ئەکا کە لە کتێبخانەکانی بەریتانیادا پارێزراون. لە ناو ئەوانەدا چەندین داستان و کۆمەڵە شیعری تێ دایە کە بە لەهجەی گۆران هۆنراونەتەوە. لەوانە: "خوسرەو و شیرین" ، "خورشیدی خاوەر"، "لەیلی و مەجنون"، "بارام و گوڵەندام".

**نمونە 3: ئاگاداریەکانی مەعروف خەزنەدار**

دکتۆر مەعروف خەزنەدار، لە کتێبەکەی دا بە زمانی عەرەبی:

"مخطوطات فريدة و مطبوعات نادرة"، الجزء الاول، بغداد 1978.

باس لە چەندین دەسنوسی کوردی ئەکا کە لە کتێبخانەکانی روسیادا پارێزراون. لە ناو ئەوانەدا چەندین داستان و کۆمەڵە شیعری تێ دایە کە بە لەهجەی گۆران هۆنراونەتەوە. لەوانە: "شیرین و فەرهاد"، بەشێ لە داستانی "لەیلی و مەجنون"، "جنگ ملخ باتش ملوچ".

**نمونە 4: ئاگاداریەکانی قەرەداخی**

محەمەد عەلی قەرەداخی، لە زنجیرەی نوسراوەکانی دا بە زمانی کوردی:

"بووژاندنەوەی مێژوی زانایانی کورد"، بەرگی یەکەم، 1998 بەغداد. هەروەها بەرگەکانی تری.

باس لە چەندین دەسنوسی کوردی ئەکا کە لە کتێبخانەکانی بەغدادا پارێزراون. لە ناو ئەوانەدا چەندین داستان و کۆمەڵە شیعری تێ دایە کە بە لەهجەی گۆران هۆنراونەتەوە. لەوانە: "لەیل و مەجنون"، "زەنبیل فرۆش"، "شیرین و خوسرەو"، "یوسف و زلێخا"، "شەڕی ئیمام عەلی"، "شەڕی محەمەدی حەنیفە"، "ئیسماعیلنامە"، "جەنگنامەی شازادە محەمەد عەلی"، "حەوت رەزم"، "برزو و فەرامورز"، "هەفت لەشکر" ...

# پۆلێنی داستانەکان

1. داستانی دڵداری
2. داستانی ئەخلاقی
3. داستانی جەنگی

## داستانی دڵداری

هەندێ لە داستانە بە ناوبانگەکانی ڕۆژهەڵات کە لە ئەدەبی فارسی و عەرەبی دا باو بون، لە لایەن شاعیرانی گۆرانەوە بە شیعر هۆنراونەتەوە. لە ئەدەبی فارسی وەرگیراون و هەندێکیان جلی کوردیان لە بەر کراوە. لەوانە: "شیرین و فەرهاد"، "لەیل و مەجنون"، "بارام و گوڵئەندام"، "خورشید و خاوەر"، "مەنیجە و بیژەن"، "شێخی سەنعان و تەرسا"....

**نمونە 1:"شیرین و خەسرەو"**

نیزامی گەنجەوی بە فارسی داستانی شیرین و خەسرەوی بە شیعری مەسنەوی هۆنیوەتەوە. دوای نیزامی زیاتر لە 30 شاعیر بە زمانی فارسی و چەند شاعیرێ بە زمانی تورکی هەمان داستانیان هۆنیوەتەوە، بەڵام هەمویان چاویان لە نیزامی کردوە و داستانەکەی ئەو لە چاو هەمویان دا سەرکەوتوترە.
هەروەها چەندین شاعیری کورد بە لەهجەی گۆران داستانی "شیرین و فەرهاد" و "شیرین و خوسرەو" یان هۆنیوەتەوە، لەوانە خانای قوبادی، میرزا شەفیع، مەلا وەلەد خان، سەرچاوەی هەمویان داستانەکەی نیزامی بوە.
ئەم داستانە چەند جارێ، بە ناوی خانای قوبادیەوە، چاپ کراوە:
جاری یەکەم، حوزنی موکریانی بە زنجیرە لە گۆڤاری "ڕەنگی گێتیی تازە" دا بڵاوی کردۆتەوە، دواتر لە کتێبێک دا بە کۆکراوەیی لە بەغداد چاپی کردۆتەوە.
جاری دوەم، موراد ئەورەنگ ساڵی 1969 لە تاران بڵاوی کردۆتەوە.
جاری سێیەم، محەمەدی مەلا کەریم، لە بەغداد ساڵی 1975 بڵاوی کردۆتەوە. پێشەکیەکی شیکاری بۆ نوسیوە و، فەرهەنگێکی بۆ وشە نائاشناکانی داناوە.
جاری چوارەم، سدیق سەفی بۆرەکەیی، لە تاران بڵاوی کردۆتەوە، پێشەکیەکی شیکاری بۆ نوسیوە و، فەرهەنگێکی بۆ وشە نائاشناکانی داناوە.
ئەم داستانە چونکە چەند شاعیری بە توانا، هەر یەکە بە پێی زەوق و سەلیقەی خۆی، لە داستانەکەی نیزامی وەرگرتوە، ڕەنگە تێکەڵاویەک لە تێکستەکانیان دا دروست بوبێ. تا ئێستا کەسێ بەراوردی تێکستە جیاوازەکانی نەکردوە و، جیاوازی پلەی ئەدەبی لە گەڵ یەکتری هەڵ نەسەنگاندوە.

**نمونە 2: "خورشیدی خاوەر"**

هۆنینەوەی میرزا مستەفای دڵێدلی
ئەم داستانە مەریوانی ساڵی 1933 لە بەغداد چاپی کردوە.

پێ ئەچێ داستانی "خورشیدی خاوەر" لە لایەن چەند شاعیرەوە بە لەهجەی گۆرانی لە سەردەمی جیاوازدا هۆنرا بێتەوە. چەند دەسنوسی جیاوازی لە کتێبخانەکانی ئەڵمانیا پارێزراوە. سەرەتای یەکێ لەو دەسنوسانە بەمجۆرە دەس پێ ئەکا:

سرپۆشی سەتار
یا یەدی قودرەت سرپۆشی سەتار
دانای لەم یەزەل قەیومی جەبار　　　شکافندەی گوڵ جە ماوای موغار

بەر لە بەیتێکی بەشی کۆتایی دا ئەڵێ:

وە لەفزی شیرین بشنەو حیکایەت　　　پیرانی ماضی کەردەن ریوایەت

سەرەتای یەکێکی تر لەو دەسنوسانە بەمجۆرە دەس پێ ئەکا:

ئیبتیدا بەنام سەتاری سرپۆش
بواچیم صفات شاهان لال پوش
پادشاهێ بی ئەخاوەر دیار　　　ساحیب صەفی سان سپاش صەدهەزار

لە کۆتایی دا ئەڵێ:

عومری درازی و سەر بەردشان　　　موراداں دڵ حاصڵ کەردشان
هەرشەب مەنۆشان بادەی ئەرغەوان　　　گۆش مەدان وە دەنگ ناڵەی تەزەروان

دەسنوسێکی تری ئەم داستانە لە کتێبخانەی بەریتانیادا هەیە. ئەنوەری سوڵتانی مەزەنەی کردوە بە دو هەزار بەیت. سەرەتاکەی بەمجۆرە دەس پێ ئەکا:

دمای حەمدی زات جیهانئافەرین　　　یاوام پەی تەعریف شای خاوەرزەمین
شنەفتم نە پیر دانای هونەروەر　　　پادشاهێ بی نە موڵکی خاوەر

لە کۆتایی دا ئەڵێ:

چل شەو و چل رۆژ عەروسی کەردەن　　　کەس نەداشت وە یاد ئەو رۆژێ مەردەن
هەزاران درود، هەزاران سەلام　　　زوما بەر محمد علیە السلام

## داستانی ئەخلاقی

لەم جۆرە داستانەدا بەها بەرزەکانی رەوشتی مرۆڤ وەکو راستگۆیی، پاکی، جوامێری، لە خۆبردان و خۆنەویستی، بەرجەستە کراوە. بیرۆکەی چیرۆکەکانی هەندێ لەم داستانانە لە کتێبە دینییەکان و باوەڕ و ئەفسانە ئایینیەکانەوە وەرگیراون. تەنانەت هەندێ لە پاڵەوانەکانی چیرۆکەکان لە پێغەمەرانن. لەوانە: "یوسف و زلێخا"، "ئیسماعیلنامە".

### نمونە 1: "یوسف و زلێخا"

**هۆنینەوەی خانای قوبادی**

ئەم داستانە بە زۆر لە زمانەکانی رۆژهەڵات هۆنراوەتەوە. جولەکە یوسف و باوکی بە پێغەمەری خۆیان ئەزانن و چیرۆکەکەش بە چیرۆکێکی تەوراتی دائەنێن. قورئان چیرۆکی یوسفی بە درێژی گێڕاوەتەوە.

ئەورەحمانی جامی، بە فارسی، وەکو کتێبی پێنجەمی داستانەکانی "حەفت ئەورەنگ" هۆنیوێتیەوە. دوای ئەویش چەند کەسی تر بە شیعر دایان رشتۆتەوە.

خانای قوبادی داستانی "یوسف و زلێخا" ی بە شیعر هۆنیوەتەوە. داستانەکەی بریتیە لە 3519 بەیت. "حەکیم مەلا ساڵح" ساڵی 2006 لە هەولێر "بوژانەوە و لێکدانەوە" ی بۆ کردوە و، بڵاویکردۆتەوە.
جگە لەم "یوسف و زلێخا" یە، محەمەد عەلی قەرەداخی، لە "بوژاندنەوەی زانایانی کورد" دا، لە ناو دەستنوسەکانی بەغدادا باسی دو داستانی تری "یوسف و زلێخا" ئەکا:
یەکەم - بە لەهجەی گۆرانی کە دانەرەکەی نەناسراوە.
دوەم – بە لەهجەی کرمانجی وەکو ئەو ئەڵێ، دانەرەکەی ئەحمەدی خانیە.

**نمونە 2: "ئیسماعیل نامە"**

چیرۆکێکی قورئانیە. چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم و خەوبینین و ئامادەیی بۆ کردنی ئیسماعیلی کوڕی بە قوربانی گێڕاوەتەوە. ڕونوسی داستانەکە لە کتێبخانەکانی ئەڵمانیا و بەغداد هەیە.
ڕونوسێکی ئەڵمانیا بەمجۆرە دەس پێ ئەکا:

بەنامی خودای کەریم و ئەعزەم   خالقی مەخلوق تەمامی عالەم
هەم بە نامی حەق جیهان ئافەرید   محەمەد ژ خەلق کەرێش بەرگوزید

بەمجۆرەش کۆتایی دێ:

خولاصەی کەلام ئاخر سەرئەنجام   وە مەنزوم واتم دو کیتاب تەمام
پەرێ برادەر، هامسەران، قەومان   هەر وەقت موانان بەندە یادکەران

## داستانی جەنگی

هەندێ جار بەم جۆرە داستانەیان وتوە "جەنگنامە". چەشنەکانی داستانی جەنگی جۆراوجۆرن:

1. جەنگی ڕوداو
2. جەنگی هەڵبەستراو
3. جەنگی ئەفسانەیی
4. جەنگی خەیاڵی

## جەنگی ڕوداو

گێڕانەوەی ئەو شەڕانەیە کە لە نێوان دو هێزی چەکداردا بە ڕاستی ڕویان داوە. شاعیر بە هۆنراوە گێڕاویێتیەوە. مەبەستی گێڕانەوە ئەشێ جیاواز بێ. ئەشێ بۆ مەبەستی سیاسی، دینی، مەزهبی، نەتەوەیی، خێڵەکی بێ، ئەشێ بۆ لایەنگری لایەک بێ دژی لایەک، ئەشێ بۆ ستایشی کەسایەتیەک و شکاندنی کەسایەتیەکی تر بێ، ئەشێ بۆ چاپلوسی و دەسکەوتی مادی بێ. گەلێ لەم جەنگنامانە بۆ ئەوە ناشێن وەکو سەرچاوەی مێژویی بکرێنە سەرچاوە، بە تایبەتی ئەوانەی کە بۆ مەبەستی تایبەتی هۆنراونەتەوە. لەوانە:

**نمونە 1: "نادرنامە"**

هۆنینەوەی میرزا ئەڵماس خان.

محەمەد ئەمین زەکی لە خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان دا و. عەلائەدین سجادی لە "مێژوی ئەدەبی کوردی" دا ئاماژەیان بە داستانێ کردوە بە ناوی "نادر و تۆپاڵ" ەوە. پێ ئەچێ هەمان "نادرنامە" ی میرزا ئەڵماس خان بێ.

### نمونە 2: "جەنگنامەی شازادەی کرماشان و کەهیای بەغداد"

هۆنینەوەی میرزای کرندی.
گێڕانەوەی شەڕێکە لە نێوان سپای ئێرانی بە سەرکردایەتی شازادە محەمەد عەلی میرزای قاجار و سپای عوسمانی و بابان بە سەرکردایەتی کەهیای بەغداد لە ساڵی 1821 دا.
لە سەرەتادا ئەڵێ:

یا دانای داوەر
یا حەی، یا قەیوم، یا دانای داوەر
جهان دا جهان لەنگەر وای لەنگەر    وە شوعلەی شەریف، شەوقی ماه، خور
لە کۆتایی دا ئەڵێ:
روحش نەفیرقەی شای شەهیدان بۆ    موریدی ئیخلاس سای خانەدان بۆ
مەدەد تەڵەب کەی نە خولاصە کەونەین    عەلی و فاتیمە و حەسەن و حوسەین

## جەنگی هەڵبەستراو

روداوی دینیە. بەڵام لە سەر ئەرز بە راستی روی نەداوە، بەڵکو شەڕێکە بە خەیاڵ هەڵبەستراوە. لە چوارچێوەیەکی هونەری دا لە بەرگێکی ئاینی دا بۆ سەلماندنی سەرکەوتنی هەمیشەیی موسوڵمانان و شکستی بەردەوامی کافران هۆنراونەتەوە. لەوانە: "جەنگنامەی محەمەدی حەنیفە". شەڕەکانی "ئیمام عەلی و سەیاف"، "ئیمام عەلی و جوڵندی"...

### نمونە 1: "شەڕی عەلی و کافران"

عەلی لەم شەڕەدا شەش هەزار شەڕکەری کافری کوشتوە. سێ هەزاریان بە شمشێر و سێ هەزاریان بە دەست.
هۆنەر ئەڵێ:

کێشا بەسەردا پەردەی زەرنیقاب    نشت وە پای ئالەم وینەی ئافتاب
جەو دما حەزرەت کێشا زولفەقار    رو کەرد نە میللەت تائیفەی کوفار
جە سپای گەوران شەش هەزار بکوشت    سێ بە زولفەقار، سێ بە زەربی مشت
لە کۆتایی دا ئەڵێ:
تێدا نیشتە بی هەردو چون پەری    یەکێ زوهرە بی، یەکێ موشتەری

### نمونە 2: "حاتەم نامە"

رۆژێک محەمەد (سەیدی سەروەر) بە یارانی ئەڵێ، حەزم لە گۆشتی راوە.
حاتەم ئەچێ بۆ راو. لە رێگا چاوی بە لەشکری کافران ئەکەوێ. حاتەم ئەکەوێتە شەڕ لە گەڵیان. زۆریان لێ ئەکوژێ. بەڵام خۆیشی لەو شەڕەدا بە دەستی کافرەکان ئەکوژرێ. ئەسپەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ مەدینە.

عەلی بڕیار ئەدا تۆڵەی حاتەم بسێنێتەوە. عەلی ئەچێ بۆ شاری شەهریار. لەو شارە زەماوەندی کچی پاشای کافران ئەبێ. پاش شەڕێکی زۆر عەلی بەسەر پاشای کافران دا زاڵ ئەبێ و داوای لێ ئەکا ببێتە موسوڵمان. بەڵام پاشا ئامادە نابێ موسوڵمان بێ. عەلی ئەیکوژێ.
ئەوسا عەلی لە گەڵ ئەسحابەکان بە سەرکەوتویی ئەگەڕێتەوە بۆ مەدینە.
لە سەرەتا دا ئەڵێ:

تەحقیقی بەحەق
الا لاشەریک تەحقیقی بەحەق

| | |
|---|---|
| یا ئەبەد بە زات قەیومی موتڵەق | یا نوربەخشی نور شوعلەی سوب شەفەق |

لە کۆتایی دا ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| قەومان مەردود سرشان کرت بەدەست | رو کەردەن پەرێ قەوم بتپەرەست |

.....

عەلی توڕە ئەبێ ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| ساقی دەرونم تار و نمینەن | مەجلیسی بەزمم خار و خەمینەن |
| بار ئەندۆهم یەکجار سەنگینەن | سەرتاپای بەرگم جە هون رەنگینەن |

دانەر لە کۆتایی دا ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| هەرکەس بوانو بە لەفزی رەوان | نائومید نەبۆ جە دەرگای ئەوان |

......

دانەر درێژە بە داستانەکەی ئەدا بەوەی عەلی ئەچێ تۆڵەی حاتەم بسێنێ:

| | |
|---|---|
| حەیدەر چون شنەفت کێشا زولفەقار | ێکا وە کەللەی کور نابەکار |
| کەردش بە دو لەت مەردودی باتڵ | خەڵتان بی وە خاک شاهی موقاتل |

.....

| | |
|---|---|
| باقی ئەسحابان چەنی شای سەروەر | هەم ئامان وە شار مەدینەی ئەنوەر |

**نمونە 3: "تاڵی مەغریبی"**

تاڵ، شای مەغریب، بۆ دوژمنایەتی ئیسلام لەشکر ئەباتە سەر مەدینە. حەسەن و حوسەین، کوڕانی عەلی، بە دیل ئەگرێ. بەڵام عەلی بە سواری ئەسپەکەی دوڵدوڵ دوایان ئەکەوێ. پاش شەڕێکی قورس بە یارمەتی جوبرەئیل بە سەر کافران دا زاڵ ئەبێ. عەلی، تاڵ و هەمو سەربازەکانی سپاکەی کە 900 هەزار کەس بون ئەکوژێ. کوڕەکانی رزگار ئەکا. عەلی بە سەرکەوتویی ئەگەڕێتەوە بۆ مەدینە بۆ لای محەمەد و فاتیمە.
سەرەتاکەی بەمجۆرە دەس پێ ئەکا:

مەعبودی بێ باک
پادشای شاهان، مەعبودی بێ باک

| | |
|---|---|
| واحید و ئەحەد، فەردی تەنیای تاک | بەخشندەی رەحمەت، جە کەرەم بێ باک |

دینجا ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| پادشاهێ بی جە مەغریب زەمین | تاڵی گومراە بی مەلعونی بێ دین |

لە کۆتایی دا ئەڵێ:
تاریخی ئین نەزم ویەردەی وەرین
الف اثنین مایە ثلاثە سبعین (1273)
ج ع ر چەنی حەرفی غین
تاریخ ئین نەزم ئاوردم بە زەمین
.....

## جەنگی ئەفسانەیی

هەندێ لەم جەنگانە لە سەر ئەرز بە راستی رویان نەداوە، لەوانەیە ئەفسانەیەکی کۆن بێ، یا سەرگروشتەیەکی زارەکی بێ دەمادەم وترابێتەوە، یان بەندوباوێکی ناو خەڵک بێ سینە بە سینە هاتبێتە خوارەوە، یان شاعیر لە خەیاڵی خۆی دا خولقاندونی و روداوی لێ دروست کردون. هەندێ لەم جەنگانە بۆ مەبەستی خلافاندنی وەرگر و بەسەربردنی کات دانراون، هەندێکی تری بۆ مەبەستی تایبەتی. هەندێ لەم جەنگانە لە نێوان دێو و درنج و هەژدیها و پاڵەوانی پیاوانە دایە. هەندێکی تری خولقاندنی قارەمانی مێژوییە بۆ دروستکردنی سەروەری نەتەوەیی. نمونەی ئەمانە:

بەشێ لەم هۆنراونە لە شانامەی فیردەوسیەوە وەرگیراون، لەوانە:

"هەفت رەزم"، "هەفت لەشکر"، "هەفت خوانی رۆستەم"، "رۆستەم و زۆراب"، "برزو و فەرامورز"، رەنگە هەندێ لەمانە یەک بابەت بن ناوەکانیان دەسکاری کرابێ، یان شاعیری جیاواز هەڵی بەستبن.

### نمونە 1: "مەنزومەی جەواهیرپۆش"

هۆنینەوەی مستەفای کوڕی مەحمودی گۆرانی.

بریتیە لە 5080 بەیت.

بەشێ بوە لە شاهنامەی کوردی. باسی جەنگەکانی ئێران و توران ئەکا لە دەورانی شەهریاریی کەیخوسرەوی کەیانی دا. گومان ئەکرێ لە قەرنی 12 ی هیجری قەمەری دا دانرا بێ.

ساڵی 1383 ی هیجری خۆرشیدی لە تاران لە لایەن "ایرج بهرامی" بە "پیشگفتار، تصحیح، توضیح و واژەنامە" ەوە لە گەڵ پێشەکیەکی فارسی بڵاو کراوەتەوە.

سەرەتاکەی بە ستایشی خوا دەس پێ ئەکا:

یا حەق تۆ موعین فریاد رەسەنی
پەرێ بێکەسان هەر تۆ کەسەنی
پەرێ زەلیلان هەر تۆنی موعین      کەریم و رەحیم ئەی دنیای موبین
یا رەب بە حەقێ رەسولی سەروەر      بدەری نەجات ئەی بەندەی کەمتەر
جە غەل و جە غەش ساف کەی سەوادم      جە درک و جە هۆش زەین کەی زیادم
بدەریم تەوفیق حەیی بێ میسال
بواچۆم تاریف گرد تایفەی زاڵ (55)

لە کۆتایی دا ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| وەسەن مستەفا دەستان وەرین | روکەر نە دەرگای دانای بیهتەرین |
| پەی سەودای مەجاز ویت کەردی زەبون | خاکت بۆ نە سەر ئەی بیرای مەجنون |
| دەی مەکەر هەرگیز زوان درازی | بەلکم خوداوەند و لێت بۆ رازی |
| نەبادا شەیتان بدەرۆت بازی | روسیای خودا و رەسولی تازی |
| روکەر نە دەرگای کارساز بێچون | پەناه بەر بە ئەو نە راسی دەرون |
| توشە پەی عوقبات بکەر کارسازی | دیی نەشۆ نە پەی سەودای مەجازی |

درود و سەلام هەزاران هەزار
پەرێ محەمەد سەیدی ئەطهار

### جەنگی خەیاڵی

ململانێی نێوان خێر و شەڕ، چاکە و خراپە ... بە تێگەیشتنێکی سادە و بە زمانێکی سادە ئەگێڕێتەوە. لەوانە: "شەماڵ و زەلان"، "سەما و زەمین"، "کولە و عەینەمەل"، "گورگ و روباه"، "گوربە و موش"...

## سەرچاوەی داستانەکان

### ناوەندی فەرهەنگی

کوردستان ناوچەیەکی شاخاوی کەم دەرامەت بوە. ناوچەیەکی ناارام بوە. سەرەرێی هاتوچۆی لەشکرە گەورەکان بوە. شاری گەورەی تێدا نەبوە. خوێندنگەی گەورە و ناوەندی گەورەی فەرهەنگیی تێدا نەبوە.
لە کرماشانەوە تا موسڵ جگە لە چەند شارێکی بچوکی وەکو سلێمانی، سنە، کۆیە، هەولێر، شاری گەورەی تێدا نەبوە.
شاری سنە ساڵی 1046 ک ئاوا کراوەتەوە.
شاری سلێمانی ساڵی 1199 ک ئاوەدان کراوەتەوە.
کۆیە و هەولێر کە دو شاری دێرینن هەر بە بچوکی ماونەتەوە و گەورە نەبون.
کرماشان و کەرکوک تێکەڵاو بون لە کورد و نەتەوەی تر و، ناوەندی دەسەڵاتی بێگانەی داگیرکەر بون.
لەم بەشەی کوردستان دا مەرجەکانی گەشەکردنی فەرهەنگی و زانستی لە بار نەبوە. تەنیا کانگای زانست و خوێندەواری مزگەوتەکان بون. مزگەوتەکان یش بە وەقفی خێرۆمەند و کۆمەکی دەسەڵاتدارەکان ژیاون. ژمارەیەکی کەمی مەلایان تێدا بوە. ژمارەیەکی کەمی قوتابیڕیان تێدا کۆبۆتەوە. دەرسەکانیان زۆرتر دینی بون. زانستە ئیسلامەکان: قورئان، تەفسیر، حەدیس، نەحو، سەرف، کەلام، شەریعەت .... بابەتی سەرەکی خوێندن بوە. لە پاڵ ئەمانەدا ئەدەب و فەرهەنگی فارسی، وەکو بەشێ لە رۆشنبیری گشتی، خوێنراوە.

### شاهنامەی فیردەوسی

یەکێ لە سەرچاوە دەوڵەمەندەکانی مەدرەسەی ئەدەبیی گۆران شاهنامەیە.
فیردەوسی (329 – 411 ک) ناوی ئەبولقاسمە. لە توس لە دایک بوە و لە توس نێژراوە. دانەری شاهنامەیە. هاوزەمان بوە لەگەڵ دوا ساڵەکانی حوکمی سامانیەکان و سەرکەوتنی غەزنەویەکان. لەو سەردەمەدا زمان و

ئەدەبی فارسیی دەری لە خوراسان لە بوژانەوە و گەشەکردن دا بوە. چەندین شاعیر و ئەدیب کەوتونەتە دانانی شیعر و کتێب بەو زمانە و، سەروەریەکانی رابوردوی ئێرانیان زیندو کردۆتەوە.
فیردەوسی نزیکەی 30 ساڵی تەمەنی بۆ هۆنینەوەی شاهنامە تەرخان کردوە کە، زیاتر لە 50 هەزار بەیتە. لە یەکەمین شای جیهانەوە، کە بە لای ئەوەوە کەیومورسی ئێرانی بوە، تا روخانی دەوڵەتی ساسانی بە دەستی عەرەبی ئیسلامی، مێژوی ئێرانی بە شیعر گێڕاوەتەوە. لە گێڕانەوەکەی دا سەرەڕای چیرۆکی دەماودەمی خەڵک، سەرچاوە ئەدەبیەکانی سەردەمی ساسانیەکان و کەلەپوری ئەدەبی پەهلەوی بەکارهێناوە.
فیردەوسی شاهنامەی شاکانی پێشدادی، کەیانی، ئەشکانی، ساسانی و ململانێی ئێرانیەکانی لە گەڵ توران، هیند، رۆم و عەرەب، بە جۆرێکی ئەفسانەیی کە قارەمانەتی ئێرانی دەرئەخا گێڕاوەتەوە. لە ناو ئەم گێڕانەوە مێژوییەدا چەندین داستانی تێهەڵکێش کردوە، لەوانە: داستانی زوحاک و کاوەی ئاسنگەر، رۆستەم و زۆراب، مەنیجە و بیژەن، سیاوەش... کە ئێستاش لە ناو کوردا باس ئەکرێ.
شاهنامە، یەکێکە لە شاکارە ئەدەبیە ئەمرەکان، کە نەک هەر لە ئێران بەڵکو لە ئەدەبی مرۆڤایەتی دا جێگەیەکی تایبەتی هەیە، بۆیە لە ئێران و دەرەوە بە سەدان جار چاپی جۆراوجۆر کراوە و، وەرگێڕاوەتە سەر زۆر لە زمانە زیندوەکانی گەلانی دنیا.
کوردیش یەکێ بوە لەو گەلانەی کەوتۆتە ژێر کاریگەریی جادوی ئەم شاکارەوە. لە ماڵی زۆر لە ئەمیر و گەورەپیاو و کتێبخانە تایبەتیەکان دا هەبوە و، لە کۆڕ و دانیشتنەکان دا و، لە مەیدانی شەڕدا خوێنراوەتەوە. چەندین بابەتی بە شیعر کراوەتە کوردی، بە تایبەتی لەهجەی گۆران. بە سەدان کەس، لە کوڕ و کچ، بە ناوی قارەمانەکانی شانامەوە ناو نراون.
شەرەف خان (شەرەفنامە: 15) بۆ سەلماندنی کورد بونی هەندێ لە قارەمانە ئەفسانەییەکانی مێژو وەکو رۆستەمی زاڵ و بەهرامی چوبین ئاماژە بۆ شانامەی فیردەوسی ئەکا.
حاجی قادری کۆیی هەر لەو بابەتەوە ئەڵێ:
کوردی شاهنامە پاکیان کوردن     کافی ئەم سافە، کافی ئەو وردن
ریچ کە دەربارەی مێژو پرسیاری لە مەحمود پاشای بابان کردوە، میر لە وەڵام دا وتویەتی: "جگە لە مێژوی پێغەمبەران و پیاوچاکان، ئەوەندەی بتوانم لە رۆژگار و گوزەرانیان بزانم. ئیتر زۆر تامەزرۆی مێژو نیم و لە شانامە زیاتر، شتێکی لێ ناخوێنمەوە."(ریچ: 275)
حاجی قادری کۆیی لەو شیعرەی دا کە بۆ شاعیرانی کوردستانی داناوە گلەیی لە کورد ئەکا کە بەیتەکانی خۆیان وەکو شانامە ئەنوسیوەتەوە:

| | |
|---|---|
| وەک محەمەدی حەنیفە بەیتی مەتین | نیە ئیللا حەساری قوستەنتین |
| بەیتی دمدم کە قەدری نازانن | پاکی سیحری حەڵاڵی کوردانن |
| وەکو شەهنامە گەر بنوسرایە | لێت موعەیەن دەبو چ وەستایە |

## خەمسەی نیزامی

یەکێ لە سەرچاوەکانی داستانەکانی خانا و هەندێ لە شاعیرانی تر کە هۆنیویانەتەوە "خەمسەی نیزامی" ە کە پێی ئەڵێن "پەنج گەنج".
نیزامی (530 – 600 ک) تخلصی ئەلیاسی کوڕی یوسفی کوڕی زەکیە. لە شاری گەنجە، کە ئێستا کەوتۆتە ئازەربایجانەوە. لە دایکێکی کورد لە دایک بوە. لە ریزی شاعیرە گەورەکانی ئەدەبی فارسی دا، لە پاڵ

فیردەوسی و سەعدی و حافز دا، ئەژمێردرێ. دیوانی شیعری هەیە بەڵام گرنگترینی بەرهەمەکانی بریتیە لە "پەنج گەنج" کە بە "خەمسەی نیزامی" ناسراوە کە پێک هاتوە لە پێنج دانراوی شیعری:
مخزن الاسرار، ساڵی 572 ک لە دانانی بۆتەوە، 2263 بەیتە. 20 مقالەیە دەربارەی ئەخلاق، مەواعیز، حیکمەت.
خەسرەو و شیرین، ساڵی 576 ک لە دانانی بۆتەوە.6512 بەیتە.
لەیلا و مەجنون، ساڵی 588 ک لە دانانی بۆتەوە. 4718 بەیتە.
هەفت پەیکەر، 5136 بەیتە. سەرگروشتەی ئەفسانەیی دڵداری بەهرامی گور لە گەڵ حەوت شازادەی حەوت ئیقلیم گێڕاوەتەوە.
ئەسکەندەرنامە، بریتیە لە شەرەفنامە و ئیقبالنامە. ساڵی 599 ک لە دانانی بۆتەوە. 3684 بەیتە. لە زمانی حەکیمەکانی یۆنانەوە ئامۆژگاری و پەندی گێڕاوەتەوە.

## سەبعەی جامی

مەولانا عەبدورەحمانی جامی (817 – 898 ک). یەکێک بوە لە سەرانی زنجیرەی تەریقەتی نەقشبەندی.
گەلێ دانراوی بە شیعر و پەخشان هەیە جگە لە دیوانێکی گەورەی شیعر، "حفت اورنگ" ی هەیە، کە حەوت مەسنەویە لە سەر شێوەی "پنج گنج" ی نیزامی دایناوە، بریتیە لە 7 بابەت: "سلسلة الذهب. سلامان وابسال. تحفة الاحرار. یوسف و زلیخا. لیلی و مجنون. خردنامه اسکندری".
جگە لەمانە: مەسنەوی مەولەوی جەلالەدینی رۆمی، گولستان و بوستانی شێخی سەعدی، دیوانی حافزی شیرازی و گەلێ شاعیری تری فارس، کاریگەرییان بە گشتی لە سەر ئەدەبی کوردی و، بە تایبەتی لە سەر مەدرەسەی گۆران، دیارە.

## ئەنجامگیری

ئەمانە ئەوانەن کە ئاشکرا بون و ئەزانرێ کە هەن، ئەبێ چەندی تریش لە دوارۆژدا دەربکەون. لەمەیش کە زانراوە کەمێکی بڵاوکراوەتەوە و، هەندێ لە داستانەکان یش کە بڵاوکراونەتەوە ناویان لە ریزی ئەمانەدا نیە.
رەنگە خانای قوبادی موناجاتەکانی بۆ خۆی نوسی بێ، لە خوا پاڕاوەتەوە لە گوناهەکانی ببورێ و لە ریزی پیاوچاکان دا بە بەهەشت شادی بکا. مەلاوەڵەد خان شیعرەکانی بۆ دەربڕین لە هەست و سۆزی تایبەتی خۆی بەرامبەر دڵبەرەکەی نوسی بێ، بەڵام بێگومان داستانەکانی شیرین و خەسرەو و لەیل و مەجنون و خورشید و خاوەریان.. بۆ خەڵک نوسیوە. بۆیە:
یەکەم، ئەبێ لەو سەردەمەدا لەهجەی گۆرانی زمانی کوردی لە ئاستێکی بەرزی گەشانەوەدا بوبێ تا بتوانێ داستانی وا درێژ و بەو هەمو بابەتە جیاوازەی پێ بنوسرێ؟ لە سەردەمێکی وەکو ئێستادا کەسێ بابەتێکی ئەندازیاری بنوسێ هێشتا ئەوەندە کەرەستەی زمانەوانی بە کوردی لە بەردەس دا نیە بتوانێ هەقی خۆی بداتێ.
دوەم، ئەبێ لەو سەردەمەدا ئەوەندە خوێنەر و گوێگری، لە حوجرە و مزگەوت و دیوەخان و ماڵان دا، هەبوبێ کە بهێنێ رەنجێکی وەهایان بۆ بدا؟
سێیەم، ئەبێ جۆرێ لە پەیوەندی ئەدەبی لە نێوان کوردستان و ناوەندە ئەدەبیەکانی ئێران دا هەبوبێ تا ئەم سەرچاوە گرنگانە بگاتە دەس شاعیری کورد لەو ناوچە شاخاوی و دابڕاوانەدا؟

# گەشتێ لەگەڵ خانای قوبادی

خانا و هۆنراوەی داستانی
خانا و موناجات
خانا و شیعری ویجدانی

## سەردەمی ژیانی خانا

خانا کەی ژیاوە، لە کوێ ژیاوە، چەند ژیاوە، چۆن ژیاوە، بەرهەمەکانی چین و چەندن؟
زۆری ئەم پرسیارانە هێشتا وەڵامی تەواو نەدراونەتەوە.
رەنگە نیشانەیەک کە یارمەتیمان بدات بۆ وەڵامی هەندێ لەم پرسیارانە شیعرەکانی خۆی بن. خانا خۆی لە هەندێ لە داستانەکانی و لە هەندێ لە شیعرەکانی دا ئاماژە بە ساڵی هۆنینەوەیان ئەکا:

لە داستانی شیرین و خەسرەودا ئەڵێ:
غەین و قاف و نون جەم کەر بە حساب
لێش مبۆ رۆشن چون قورسی ئافتاب 1150
لە داستانی لەیل و مەجنون دا ئەڵێ:
غەین و قاف و نون، داڵی ئەبجەدی 1154
حساب کەرۆ حەرف وێنەی عەسجەدی
هەزار و یەکسەد پەنجا و چوارەن
رۆشنتر جە سوی شوعلەی وەهارەن

ئەو ساڵانەی خانا داستانەکانی تێدا هۆنیوەتەوە هاوزەمانی قۆناغێکی نائارامی مێژوی ئێرانە. ئەففان پەلاماری ئێرانیان داوە و کۆتاییان بە زنجیرەی سەفەوی هێناوە. نادرشای ئەفشار (1100 – 1160 ک) کۆتایی بە دەسەڵاتی ئەففان هێناوە. کەریم خانی زەند کۆتایی بە دەسەڵاتی ئەفشار هێناوە. جەنگی رۆم و عەجەم بەردەوام بوە. کوردستان بە گشتی، هەردو ئەمارەتی ئەردەڵان و بابان بە تایبەتی، بەشێ بون لەم شەڕانە و، ناوچەکانیشیان مەیدانی هەندێ لە دەبەردە خوێناویەکانیان بوە.
لەو ماوەیەدا، والیەکانی ئەردەڵان چەندین جار گۆڕاون، دانراون و لابراون، کوژراون و لە کوردستان دورخراونەتەوە، براون بۆ شەڕی ئەففان، بۆ شەڕی هیندستان و گورجستان و داغستان، بۆ شەڕی بابان و بەغداد و موسڵ و بەسرا. عەباسقولی خان، سوبحان ویردی خان، مستەفا خان، خان ئەحمەد خان، حەسەن عەلی خان، خەسرەو خان... چەند جار بە والی دانراون و لێخراون. لە ناو ئەوانەدا بۆ نمونە سوبحان ویردی خان (1143 – 1161 ک) هەشت جار دانراوە و لابراوە.
شاری سنە و ناوچەکە، چەندین جار لە لایەن نادرشای ئەفشار، کەریم خانی زەند، خانە پاشای بابان، سەلیم پاشای بابان، سلێمان پاشای بابان، داگیر و وێران و تاڵان کراوە.
خانا ئەبێ لەم رۆژگارە نائارام و لەو هەلومەرجە نالەبارەدا لە کوێ نیشتەجێ بوبێ، سەرەڕای ئەو هەمو پەشێوانە توانیوێتی، سامانێکی ئەدەبی گەورە پێکەوە بنێ و کەڵەکە بکا و، بە میراتی بەجێبهێڵێ؟

## خانا و والی

خانا لە دوتوێی یەکێ لە داستانەکانی دا باسی "والی ولایەت" ئەکا کە ئەگەر نیازی باش بێ زەوی لە جێگەی گوڵ گەوهەر بەرهەم ئەهێنێ و بەرد ئەبێ بە لەعل و خاک ئەبێ بە عەنبەر. لە سیستەمی سیاسی و کارگێڕی ئێران دا، شا هەبوە، کە گەورەی هەمو وڵات بوە، لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی دا حاکم بە نازناوی جیاواز و، بە پلەی جیاواز هەبوە. تەنیا بە حاکمەکانی کوردستان و لوڕستان و گورجستان، پلەی والی بەخشراوە. بۆیە پیاوێکی شارەزای وەکو خانا، کاتێ وشەی والی بە کار هێناوە، ئەبێ لەوە مەبەستێکی دیاریکراوی هەبوبێ، ئەگینا ئەیتوانی وشەیەکی تر بە کار بهێنێ. ئەڵێ:

خانا بۆ وەسەن زبان درازی — کۆن ئەو ساحیب عەدل تۆ پێش بنازی
کۆتاکەر ئی حەرف بە دەوان دەو — ویر دەر بە فەرمان دڵگیر خەسرەو
بەڵێ جە خانای عوتارید خامە — مونشی وەسفی زوڵف عەنبەر شەمامە
بە سەمعی شەریف بشنەو حیکایەت:
ئەر قەسدش خێرەن والی ولایەت
بە جای گوڵ زەمین ماوەرۆ گەوهەر
سەنگ مەبۆ بە لاڵ، خاکش بە عەنبەر
ئەر والی بێ عەدڵ، شەرارەت پیشەن
بەدجنس بەدکار، دور جە ئەندیشەن
وڵکەی مەملەکەت کەی مەعمور مەبۆ
ئەیمەنی و راحەت جە خەڵق دور مەبۆ

## خانا و زمانی کوردی

ناوی تەواوی خانا و شوێنی ژیان و خوێندن و گەورە بون و مردنی تا ئێستا نازانرێ تا پەیوەندی نێوان ژینگەی کۆمەڵایەتی، سیاسی، رۆشنبیری خانا و بەرهەمەکانی شی بکرێتەوە. تەنیا ئەوەندە ئەزانرێ وەکو خۆی لە داستانەکانی دا دانی پیدا ناوە "قوبادی" بوە. قوبادی تیرەیەک بون لە عەشیرەتی گەورەی جاف کە دابەش بون بە سەر هەردو دیوی سنوری رۆم و عەجەم دا. تیرەی قوبادی لە ناوچەی جوانرۆ ژیاون.
خانا کۆڵەکەیەکی سەرەکی مەدرەسەی ئەدەبی گۆرانە. جگە لەوەی خۆی بە کوردی داستانەکانی هۆنیوەتەوە و، شیعری پێ داناوە، پێ ئەچێ بەم هۆیەوە لە سەردەمی خۆی دا سەرزەنشتی کرابێ، لە سەر ئەوەی بە کوردی نوسیویێتی، هەروەکو دوای ئەویش نالی و حاجی قادری کۆیی توشی هەمان لۆمە بون، بەڵام خانا داکۆکی لە بە کارهێنانی زمانی کوردی و برەو پێدانی کردوە. لە پێشەکی شیرین و خەسرەودا وتویەتی:

| | |
|---|---|
| راستەن مەواچان فارسی شەکەرەن | کوردی جە فارسی بەل شیرینتەرەن |
| پەی چێش نە دەوران ئی دنیای بەدکێش | مەعلومەن هەرکەس بە زبانی وێش |
| مەعلومەن هەرکەس بە هەر زبانێ | بواچۆ ئەزمێ جە هەر مەکانێ |
| وێنەی عەروسان زێبای مولکی چین | مەکەرۆش جە حوسن عیبارەت شیرین |
| خاریج جە مەعنی ئەبۆ مەزمونش | گۆیا بۆ چون شیعر جامی مەوزونش |
| جە لای خیرەمەند دڵپەسەند مەبۆ | شیرینتەر جە شەهد شیرەی قەند مەبۆ |
| جە عەرسەی دنیای دونی بەدفەرجام | بە دەستوری ئەزم نیزامی مەقام |
| بە لەفزی کوردی کوردستان تەمام | پێش بوان مەحزوز! باقی والسلام |

خانا، بەم هۆشە فەرهەنگیەوە، لە سەر ئەم رێبازە رۆیشتوە هەر بۆیە دوای ئەم داستانە چەندین داستانی تری بە هەمان زمان هۆنیوەتەوە و، دەیان شیعری داناوە و، سامانێکی ئەدەبی گەورەی بەرهەم هێناوە، کە تا ئێستەش نرخی ئەدەبیان بە گرانی ماوە. خانا ئەشێ تا ئێستا بە پڕ بەرهەمترین شاعیری کورد دابنرێ، وەکو حەکیمی مەلا ساڵح لە پێشەکی "یوسف و زلێخا" دا وتویەتی، تا ئێستا 14445 بەیتی خانای کۆ کردۆتەوە. جا ئەگەر ئەو بە تەنیا ئەوەنـدەی کۆ کردبێتەوە، ئەبێ لەملاوئەولا چەندی تری مابێ. ئەگەر رۆژێ "کلیات" ی خانا کۆ بکرێتەوە، ئەوسا پایەی ئەدەبی خانا لە مێژوی ئەدەبی کوردی دا چەند ئەوەندەی ئێستا بڵندتر ئەنوێنێ.

## قاڵبە شیعریەکانی

خانا لە هەمو شیعرەکانی و، لە هەمو داستانەکانیدا پێڕەوی هەمان قاڵبی کردوە کە شاعیرانی مەدرەسەی ئەدەبیی گۆران پێڕەویان کردوە.
شیعرەکانی، مەسنەوی جوت قافیەی دەبرگەیین.
سەرەتای شیعرەکانی، تەنانەت هەندێ لە بەشەکانی داستانەکانی، بە هەمان قاڵب دارشتوە، کە نەریتی ئەم مەدرەسەیە بوە. سەرەتای داستانی لەیل و مەجنون بەمجۆرە دەس پێ ئەکا:

خانا هەم جەسەر!
نیگەهدارت بۆ خوداوەند جە سەر

| | |
|---|---|
| پشت و پەنات بۆ دەهەندەی داوەر | لوتفش چەنی تۆ دایم بۆ یاوەر |
| تۆم سپەرد بە زات شای شاهان جە سەر | وە دەستگیرت بۆ دایم پەیغەمەر |

تاج سولەیمانی هەم جە سەرت بۆ — حەزرەتی خزر وە ڕەهبەرت بۆ
عەلی شای مەردان هەم جە پشتت بۆ — قەبزەی زولفەقار شەب نە مشتت بۆ
سورەتی بەرات وە تیغبەندت بۆ — دیدەی بەدکاران دور جە وەمندت بۆ
ئەخی جوبرائیل باڵ کێشۆت وە سەر — نیگەهدارت بۆ دەهەندەی داوەر

## بەرهەمەکانی خانا

ئەوەی تا ئێستا زانرابێ خانا 3 جۆر بەرهەمی هەیە:

## یەکەم، خانا و هۆنراوەی داستانی

### داستانی دڵداری:

شیرین و خوسرەو
شیرین و فەرهاد
لەیل و مەجنون

### شیرین و خەسرەو

سەرو 5500 بەیتە. چەند جارێ چاپ کراوە:

جاری یەکەم، حسێن حوزنی موکریانی بە زنجیرە لە دەنگی گێتی تازەدا بڵاوی کردۆتەوە. دوای ئەوەش لە کتێبێکی سەربەخۆدا.

جاری دوەم، مورادی ئەورەنگ و سدیق بۆرەکەیی لە تاران بڵاویان کردۆتەوە.

جاری سێیەم، سدیق بۆرەکەیی دیسان لە تاران بڵاوی کردۆتەوە.

جاری چوارەم، محەمەدی مەلا کەریم لە بەغداد بڵاوی کردۆتەوە.

چاپەکەی محەمەدی مەلا کەریم لە هەموویان زانستیتر و باشترە. وەکو حەکیمی مەلاساڵح نوسیویێتی، ڕونوسی ئەم داستانە لای ئەو 300 بەیتی زیاترە لەوەی کە محەمەدی مەلا کەریم بڵاوی کردۆتەوە.

### شیرین و فەرهاد

هێشتا تێکستی ئەم داستانە بڵاونەکراوەتەوە. بە قسەی حەکیمی مەلا ساڵح، خانا ئەمەیشی هۆنیوەتەوە. ئەو ساخی کردۆتەوە و ئامادەی کردوە بۆ بڵاوکردنەوە. وەکو ئەو نوسیویێتی: 2340 بەیتە. لە کۆتایی داستانەکەدا ئەڵێ:

ئەشعاری کیتاب بێ کەم و زیاد
خوسرەو و شیرین، شیرین و فەرهاد
هەشت هەزار چەنی پانسەد و بیسەن
ئەر تاریف ئەبۆ خەیلێ ئەفیسەن (یوسف و زلێخا: 6)

خانا لە هۆنینەوەی داستانەکانی دا ئاماژە بە سەرچاوەکانی و نوسەرەکانی ئەدا و، لە سەرەتای هەندێ لە چیرۆکەکانی داستانەکانی دا باسی نیزامی ئەکا، بە شانازیەوە دان ئەنێ بەوەدا کە داستانەکانی لە نیزامی گەنجەوی وەرگرتوە و، هەندێ لە چیرۆکەکانی لە زمانی ئەوەوە ئەگێڕێتەوە.

لە بەشێکی شیرین و خەسرەو دا ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| ئومێدم بە زات بەخشندەی داوەر | خانای خەم خەیاڵ، زامی دڵ خەتەر |
| بیەخشۆ گوناش جە عەرسەی مەحشەر | بەو شەمع میحراب رەسول سەروەر |
| یا رەب بە فیراق فەرهاد کۆکەن | بە خورشید حوسن شیرین ئەرمەن |
| بە ئیستیلای عەشق خوسرەو پەروێز | بە خۆشخەرامی گوڵ گونی شەبدێز |
| بە خامەی موشکین شاپور چینی | بە نازی شیرین بەو نازەنینی |
| بە ساز، بە ئاواز شۆخی ئەکیسا | مینبەری ئاهەنگ، موعجیزەی عیسا |
| بە توغیانی دەرد بێ دەرمانی عەشق | بە تۆفان سەردا سەر مەینەت مەشق |
| وێنەی نیزامی سەیقەل دەر زەینم | بە سورمەی دانش رەوشەن کەر عەینم |
| ئاکاما جە رای شیرین و خەسرەو | سەنگ تەراش فەرهاد سەرگوزەشتەی ئەو |
| باوەرۆ وە ئەزم خاستەر جە گەوهەر | بە رەشحەی خامەی شۆخی بۆ عەنبەر |
| بەی تەور کەردمان ئەی نامەی نامی | ئینشا بە دەستور نەزمی نیزامی |
| ئومێدەن بە زات دانای شیرین کار | مەزمونی ئەی ئەزم جەواهیر نیگار |
| چون رازی شیرین نادرەی ئەیام | شیرین بو بە کام خاسەی خاس و عام |
| بە شیعر شیرین ئەزم شەکەر ریزەی راز | شێخ نیزامی تەور، شەفیعا ئەنداز |
| بە رەشحەی خامەی موشکین چون جانی | بەی تەور کەرد ئەفشان لەوح مەعانی |

(دەنگی گێتی: بەرگ 26. ل 354)

لە چەند شوێنی جیاجیادا دیسان ئاماژە بە ناوی نیزامی ئەکا:

| | |
|---|---|
| تا جەلای شیعرت شیرین رەونەق بۆ | چون دوعای خاسان مەقبولی حەق بۆ |
| عەزیزولقەدرێ ئەو چون نیزامی | بپرسۆ تاریخ ئەی نامەی نامی |
| عەین و قاف و نون جەم کەر وە حساب | لێش مەبۆ رەوشەن چون قورس ئافتاب (دەنگی گێتی: ب 26. ل 286) |

گا چون نیزامی، گا چون مەولەوی گا وێنەی خوسرەو شوعەرای دەهلەوی
(د. گ. ب 26. ل 260)

| | |
|---|---|
| نویسندەی ئەزم ئەی نامەی نامی | بەی تەور کەرد تەسدیق گوفتەی نیزامی |
| شوعەرای شیرین ئەزم شانایی نیزامی | بەی تەور کەرد رەقەم ئەی نامەی نامی |
| توتی خۆشتەقریر خامەی شەکەر رێز | شەمە جە شەرحی شیرین و پەروێز |
| وێنەی نیزامی شوعەرای دڵپەزیر | بەی دەستور ئاورد بە رشتەی تەحریر |

جگە لە خانا چەند شاعیرێکی تر بە هەمان زاری گۆرانی هەمان داستانیان هۆنیوەتەوە. کامیان لە پێش کامیان دا دایان ناوە؟ خانا دانراوەکانی ئەوانی دەدیوە، یان نیونی و بە لای ئەوەوە لە داستی پێویست دا ئەبون؟

جیاوازی چیرۆکەکانی ناو داستانەکەی ئەم لەگەڵ چیرۆکەکانی ناو داستانەکانی ئەوان چیە؟ ئەشێ دوای بڵاوکردنەوەی تێکستەکان و بەراورد کردنیان لە گەڵ یەکتری وەڵامی ئەم پرسیارانە بدرێتەوە.

## لەیل و مەجنون

هێشتا تێکستی ئەم داستانە بڵاو نەکراوەتەوە. سەرو 1600 بەیتە. خانا ساڵی 1154 ک هۆنیویتیەوە.
سەرەتاکەی بەمجۆرە دەس پێ ئەکا:

| | |
|---|---|
| بەنام ئەو کەس بە کن فیکن | عالەمش جە کەتم عەدەم کەرد بیرون |
| مەحزی خاتری ئان سید الکونین | محەمەد فاتیح خەیبەر و حونەین |
| حەمد و سەنا و شوکر پەی ئەو زاتی پاک | هەم سەلات لە سەر پاتشای لەولاک |
| ئەر تەوفیق دەرۆ بینای بیهتەرین | جە دمای مەکتوب خوسرەو و شیرین |
| عەجەب تەر جە سیر سیحری سامیری | واچوم وەسفی عەشق قەیسی عامیری |
| یانیهای مەجنون مەفتون لەیلی | دێری دێوانەی دەشت دوجەیلی |
| وێڵی و مەحرومی جە شادی و سرور | هامرازش چەنی وحوش و تیور |
| عەشقی مەجازی، بەعدەن حەقیقی | واچوم جە تاریخ جە روی دەقیقی |
| بە واتەی حەکیم دانای نیزامی | گەنجەوی ئەلیاس بن یوسف نامی |
| شاعیری شەریف شەفیعی دەستور | ئەر پرسۆ تاریخ ئەی نامەی مەستور |
| غەین و قاف و نون. دالی ئەبجەدی | حساب کەرۆ حەرف وێنەی عەسجەدی |
| هەزار و یەکسەد پەنجا و چوارەن | رۆشنتەر جە سوی شوعلەی وەهارەن |
| جە هیجرەت خاس شای خیر الانام | وە رەوزەی ئەو بۆ سەلات و سەلام |

عیبرەت بۆ پەرێ ئەبنای رۆزگار
واتەی قوبادی یش مانۆ یادگار

لە کۆتایی دا ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| ئەوان شین ئەشۆن راگەی رۆزگار | شێوەی عەشق لێشان مەند وە یادگار |
| ئەشعار خانایش پەی یادگاری | مانو پەی یاران چەند رۆزگاری |
| بە نام خودا و ئەحمەدی موختار | خامە بکەر خوشک، خەتم کەر گوفتار |
| حەمد و سەنا و شوکر پەی زاتی عەلام | پەرێ محەمەد سەلات و سەلام |
| تاریخی وەفات قەیسی عامیری | ساڵی هەشتاوهەفت هیجری و قەمەری |
| هەفت سەد و دە ساڵ میلادی مەسیح | واتەی مورخەی بەغدادی فەسیح |
| هەزار و شەش سەد چهل و چوار بەیتەن | پەی دۆستان دەبۆ خانە پەی کێتەن؟ |
| سەد هەزار سەلات، خاتیمەی کەلام | بە رەوزەی رەسول، علیە السلام |

کۆپیەکی دەسـنوسی داسـتانەکە لە بنکەی ژیـن هەیە "عەبدورەحمان شێخ عەباسی" لە 12 ی فەروەردینی 1354 ی شەمسی/ 18 ی ربیع الاولی 1395 ی قەمەری لە نوسینەوەی بۆتەوە. هەرچەندە هەندێ تێبینی سەید تاهیری هاشمی پێوەیە، بەڵام ئەم تێکستە پێویستی بە پێداچونەوەیەکی وردی بەراوردکاری هەیە چونکە پێ ئەچێ دەسکاریەکی زۆر لە زمان و رێزمان و بەیتەکانی دا کرابێ.

لە داستانی "لەیل و مەجنون" یش دا چەندین جار ناوی نیزامی دوبارە ئەکاتەوە. لە پێشەکی داستانەکەدا ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| بە واتەی حەکیم داناى نیزامی | گەنجەوی ئەلیاس بن یوسف نامی |

لە سەرەتای هەندێ چیرۆکەکانی دا ئاماژە بە نیزامی ئەدا و، چیرۆکەکە بە ناوی ئەوەوە ئەگێڕێتەوە:

| | |
|---|---|
| جەو پەی نیزامی داناى گەنجەوی | کەردەنش بە نەزم نامەی مەعنەوی |
| نیزامی جە قەول داناى بەغدادی | وەی تەورە ڕێژان تەرحی ئوستادی |
| نیزامی جە قەول بەغدادی سەلام | وەی تەور تەنزیم کەرد ئەی شیرین کەلام |
| نیزامی پەی فەوت لەیلی عامیری | بەی تەور دان دادی شیعر و شاعیری |
| نیزامی جە قەول بەغدادی سەلام | وەی تەورە کەردەن ئیبتیدای کەلام |

جگە لە خانا چەند شاعیرێکی تر بە هەمان زاری گۆرانی هەمان داستانیان هۆنیوەتەوە. کامیان لە پێش کامیان دا دایان ناوە؟ خانا دانراوەکانی ئەوانی دیوە، یان دیویتی و بە باشی نەزانیون؟ ویستویەتی بینبڕکێیان لە گەل بکا؟ ئەشێ دوای بڵاوکردنەوەی تێکستەکان و بەراورد کردنیان لە گەڵ یەکتری وەڵامی ئەم پرسیارانە بدرێتەوە.

## داستانی ئەخلاقی:

### یوسف و زلێخا

حەکیمی مەلا سالح، ساڵی 2006 لە هەولێر، بە "بوژانەوە و لێکدانەوە" بڵاوی کردۆتەوە.

"یوسف و زلێخا" بریتیە لە 3519 بەیت.

سەرەتاکەی بەمجۆرە دەس پێ ئەکا:

سەڕافی لاڵ سەنج دەریای مەعانی
گۆش بدەر بە سونع داناى ڕەبانی

| | |
|---|---|
| بە قەولی ڕاوی تەواریخ بەستە | بەی تەور ویەردەن بەستە و شکستە |
| جە صولبی ئادەم ئاما پشت بە پشت | گوڵێ جە گوڵزار یەعقوب کەرد سروشت |
| نامش بە یوسف میسری موانان | جەماڵش چۆن خۆر چوارەمی ئاسمان (25) |

ئەم سەرەتایە وەکو سەرەتای داستانەکانی تری خانا نیە، چونکە خانا داستانەکانی هەمیشە بە ستایش خوا و پێغەمبەر دەس پێ ئەکا، بەڵام لێرەدا بە سەر ئەوانەدا تێپەڕیوە، ڕاستەوخۆ دەستی کردوە بە گێڕانەوەی داستانەکە.

لە کۆتاییەکەی دا ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| هەم بەحسی یوسف چەنی زلێخا | یاوا بە ئیتمام جە ڕاگەی سەفا |
| بەی تەور بەیان کەرد خانای خان قوباد | پەرێ هامسەران بمانۆ وە یاد |
| گاگا جە ڕوی حەمد باوەران بە یاد | ڕۆحم بە دار الجنان بکەن شاد |
| یوسف و زلیخا یاوا بە ئیتمام | واتەی قوبادیش ماوۆ جە ئەییام |
| یا غافر الذنب سرپۆشی ستار | احفظنی بالفضل من عذاب النار |
| جە زەلزەلەی حەشر یوم التنادی | بیەخشێ گونای خانای قوبادی... (406) |

جاف ئێستا لە پانتاییەکی فراوان دا، تێکەڵاو لە گەڵ هەندێ خێڵ و تیرەی تری وەکو زەنگنە، ئەلۆ، هەمەوەند، لەک، کەڵوڕ، نیشتەجێ بون لە: خانەقین، مەندەلی، کفری، کەلار، قەرەداغ، دەربەندیخان، هەڵەبجە، سەید سادق، پێنجوین، دوکان، چەمچەماڵ...

ریچ ساڵی 1820 ز نوسیوێتی: ئەم خێڵە بە ئاسانی دەتوانێ چوار هەزار پیادەیان چەک هەڵبگرێ. چاکترین جەنگاوەری ناو سوپای کوردن... ئەمانە لە کاتی شەڕدا کە میری سلێمانی سەرۆکە دەرەبەگەکانیان بانگ دەکات دوهەزار سوارێک پێکدێنن....

ئیدمۆندز ساڵی 1922 ز خەمڵاندویەتی بە 10 هەزار خێزان. (ادموندز، ترجمة جرجيس فتح الله، كرد وترك وعرب، بغداد، 1971، 139)

جاف کۆچەری دەوارنشین بوە. کۆچەکەی لە جەبەل حەمرینەوە بۆ کێوەکانی مەریوان و بانە و سەقز و سنە کشاوە. بنەی زستانەیان هەردو دیوی جەبەل حەمرینی گرتۆتەوە لە قزرابات و قەرەتەپە و کفری و کەلار، دەشتی شیروانە، کەناری ئاوی سیروان و، هەواری هاوینەیان کوێستانەکانی پێنجوین، مەریوان، بانە، سەقز، سنە بوە. وەکو ئیدمۆندز خەمڵاندویەتی رێگەی کۆچەکەیان 140 میل درێژ بوە.

هۆرە، سۆزی تایبەتی جافە، گۆرانیەکە بە دەربڕینی دەنگەوە لە گەرو، بە شیعری دەبڕگەیی ئەوترێ. ئاوازی هۆرە ئەندازەیەکی زۆر "سوتانی دەرونی" لە کڕوزانەوە و لاڵانەوە و لاوانەوەی شێوە گریانی تێدایە، رەنگە هەر لە بەر ئەوە بێ خۆیان پێی ئەڵێن "سۆز" نەک "گۆرانی".

ریچ لە سەردانەکەی دا بۆ کوردستان هەندێ لە سەرانی خێڵەکانی دیوە. کەیخوسرەو بەگی یەکەم جار لە سلێمانی لە کۆڕی دانیشتنی پاشای بابان دا دیوە. ریچ لە یاداشتەکانی 18 ی ئایاری 1820 ز نوسیوێتی:

"ئێوارەش جگە لەو کۆمەڵە خەڵکەی تر کە دەهاتنە لام، کەیخوسرەو بەگ میوانم بو. خێڵی جاف کە کەیخوسرەو بەگ سەرۆکیانە، لە بەرزایی چیاکانی قەڵەمڕەوی سنەدا دەژین. پیاوگەلی ئەم خێڵە سەروسیمایان جوان و ئازان. تەنانەت لای کوردەکان خۆیشیان لە خێڵە هەرە جاربەزە و دواکەوتوەکانن.

شێوە زمانیشیان جیاوازیەکی زۆری لە گەڵ شێوەزمانی کوردانی بابانی هەیە.

سیمایان ئەوەندە جیاوازە بە ئاسانی ئەتوانرێ بناسرێنەوە.

جافەکان هەمویان لە رەشماڵدا دەژین و هاوینان لە چیا بەرزەکانی حاجی ئەحمەدی سەر سنوری سنە هەڵدەدەن و بە ناوچەی شارەزوردا بڵاودەبنەوە، زستانانیش لەمبەروبەری ئاوی سیروان لە نزیک شیروانە هەڵدەدەن." ل 120-119.

لە یاداشتەکانی 13 ی ئابدا لە باسی کۆچ و کۆچباری جافەکاندا کە "بە ناو کاروانی کۆچی خێڵێکی جاف دا لە کاتی گەرانەوەیاندا بۆ شارەزور" دا تێپەڕیوە ئەڵێ دیمەنێکی "دڵگیر و گەش و خۆش بو، چونکە رەشماڵ و کەلوپەل و باروبنەیان زۆر بە رێکوپێکی پێچابوەوە و زۆر رێکیش لە سەر پشتی گا و مانگا، باریان کرد بون."

لە یاداشتەکانی 20 ی ئابی 1820 دا باس لە هەندێ لە سوارەکانی جاف ئەکا کە "هەمویان قۆز و سوارچاک بون، پەری شینەشاهۆیان بە سەروپێچەکانیانەوە کرد بو. فەرشیشیان بە ژێر سکی ئەسپەکانیانەوە دادوری بو، گوڵنکەی زەردی پیا شۆڕ بیوەوە." 180-181.

هەروەها ئەڵێ: "پیاوەکانیان کراسێ لە بەر دەکەن، لە ناو قەدا توندی دەکەن. شەرواڵی تەنکیش دەکەنە بەر. پێلاوەکانیشیان لە خوری چنراوە. تەپلەیەکی خڕ دەکەنە سەر لە لباد دروست کراوە، هەموشیان چەکدارن و شمشێر و زرێی بچوکیان پێیە، هەندێکیان دەمانچە دەبەستن. بەڵام سوارەکانیان هەمیشە نێزەیان پێیە" ل 171-172. (کلۆدیۆس جێمس ریچ، گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان 1820، وەرگێڕانی لە عەرەبیەوە محەمەد حەمە باقی، هەولێر، دەزگای ئاراس، 2002)

## ئافرەتی جاف

بە هۆی جۆری بەشداری لە ژیانی خێزان و هۆز و خێڵەکەی دا. لە پەروەردە و ئامادەکردنی بەروبومی ئاژەڵ و بەشداری لە هەڵدان و کۆکردنەوەی رەشماڵ و لە هاوڕێیەتی پیاوەکان دا لە بارکردن و کاروانی هۆزەکەیان دا، جۆرێ لە ئازادی هەڵسوکەوتی هەبوە. روی خۆی دانەپۆشیوە. لە گەڵ کاروانەکەدا بە رێ کەوتوە، تێکەڵاوی پیاوانی خێڵەکەی بوە. لە شاییەکانیدا بەشدار بوە و خۆی رازاندوتەوە.
لە ناو هەندێ خێڵی کورد و، لە هەندێ ناوچە کوردستان دا "ژن هەڵگرتن" و "رەدوکەوتن" رێگەیەکی باو بوە بۆ "هاوسەرگیری". لە ناو جاف دا ئەمە کارێکی نەشیاو و رێگە پێ نەدراو بوە.

ریچ لە یادداشتەکانی رۆژی 13 ی ئاب دا، کە توشی کاروانێکیان بوە لە گەڕانەوەیاندا لە کوێستانەکانەوە بەرەو شارەزور، بەمجۆرە لە ئافرەتەکانی جاف ئەدوێ:
"... ژنان و پیاوانیان بە پێ رێیان ئەکرد. ئای کە خەڵکێکی لەش تۆکمەن. پڕن لە جوانی و شیرینی. ئافرەتیشیان کراس و شەرواڵی شین لەبەردەکەن سەربەستی بچوکیش دەبەستن و ئەگریجەی لولیان بەملاولای رویاندا دەخەن. چارۆکەش دەدەن بە کۆڵدا کە بە رەنگی شین و سپی دەچنرێ. بە شێوە لەو دەسماڵانە دەچێ کە چیانشینەکانی نۆسکۆتلاند بە کاری دێنن. چارۆکەش بەشێکە لە جلوبەرگ. هەمو ئافرەتێکیش هەیەتی بەڵام چارۆکەی ئافرەتە دەوڵەمەندەکانیان، لە ئاوریشمی زەرد و سور دەچنرێ.
چاومان بە ئافرەتێکیان کەوت، لەوە دەچو پلەیەکی گەورەی لە ناویاندا هەبێ، بە سەر ئەسپێکەوە بو، سەرو کەلله و پشتی زۆر جوان بە گوڵونکەی خوری و مورو رازێنرا بوەوە، لادێکیان بە سەر زینەکەیدا دابو، گوڵونکە بە پەراوێزەکانیەوە بون، لە دواوەش دو وڵاخ کەلوپەلەکانیان بۆ هەڵگرتبو. نۆکەرێک بە سەر یەکێکیانەوە بو. سوارێکی چەکداریش لە تەنیشتیەوە لە خزمەتیا بو. هیچ ئافرەتێکیشمان نەدی خۆی داپۆشی بێ. ئەختێر تەنانەت ئەو سەرپۆشەش کە ئافرەتی عەرەب لە خۆیەوە دەپێچێ" ل 171-172. (کلۆدیۆس جێمس ریچ، گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان 1820، وەرگێڕانی لە عەرەبیەوە محەمەد حەمە باقی، هەولێر، دەزگای ئاراس، 2002)

## وەلی و رەوەندایەتی

لە ناو شاعیرەکانی کوردا وەلی دیوانە هەندێ لە دیمەنەکانی رەوەندایەتی جافی وێنا کردوە. لە شیعرەکانی دا هەندێ وشەی بە کار هێناوە کە تایبەتن بە کۆچی جاف لەوانە: هەوار، لەیلاخ، هۆز، ئێلی مرادی، سیایانە، سیاماڵ، ئێل، خێڵ، خێڵخانە، تەڵمیت... هتد

وەلی حەزی لە کچێکی جاف کردوە. ناوی بە شەم بردوە. شەم و خێڵەکەی کۆچەر بون. لە هەوارێکەوە چون بۆ هەوارێکی تر. لە ڕەشماڵ دا ژیاون. ئەمانە لە شیعرەکانی وەلی دا ڕەنگیان داوەتەوە.
وەلی مەبەستی لە شەم، شەمعی پەروانە بێ، یان کورتکراوەی شەمسە بێ، یاخود ناوێکی وەهمی بێ بۆ خۆشەویستەکەی، بۆتە سەرچاوەی ئیلهامی هەمو شیعرەکانی. لە زۆری شیعرەکانی دا ناوی ئەبا و، هەندێ لە شیعرەکانی بە تەنیا بۆ ئەو تەرخان کردوە و، لە هەندێکیان دا وشەی شەمی کردوە بە قافیە.
وەلی بەو پەڕی بێباکیەوە باسی ئینتیمای خێڵەکی دڵدارەکەی ئەکا. لە تەرجیعبەندێک دا ئەم میسراعەی کردۆتە دوا بەیتی شیعرەکەی:
کوشتەی نیگای نازی شەخسی جافێکم (دیوان: 87)
لە شیعرێکی تری دا ئەڵێ:
"مەحبوبی جافان
خۆشەویستە بێ خەوشەکەی ناو ئێلی جاف
پێشەنگی ڕەوەی ناوک بۆنخۆشەکان
سەرکێشی ڕەوێڵی ئەگریجە موشکینەکان
ئاسکی سڵی هەردەنشین... هتد" (دیوان: 68)

ئاوات بە مەلانی تیژباڵ ئەخوازێ کە بە ئاسمانەوە ئەتوانن سەیری ڕەشماڵەکان بکەن ئەڵێ:
"مەلانی تیژباڵ
قازان، قولنگان، مەلانی تیژباڵ
خۆزگەم بە خۆیان بۆ جێگە و شوێنیان
ئەچون بۆ کوێستانی ساراڵ
بەندی زۆزان کاوکاو ئەگەڕان
نیشتمان و لەوەرگای لوتبەرزەکان
بە چاو ڕەشماڵی خێڵیان ئەبینی
ئەگریجە بۆنخۆش
پۆل پۆل ڕەوەی پەری تایەفەی جاف
نازک نازداری ناوک عەنبەربۆ
هەمو نازدارەکان چارۆکە بە کۆڵ و بە بەرگی ئاڵوواڵاوە
یەک یەک خاڵخاسانی خێڵی مرادی
لە زۆزان لە گەڵ خۆشەویستەکەم
ئەگەڕان بە بان سەری ڕەشماڵەکاندا
ئەیان دا بە لای سۆسەن خاڵاندا
خەوتوان هەمو بەیانیەک، بەر لە هەڵاتنی خۆرەتاو، لە دەنگی ئەوان لە خەو هەڵ ئەستان
ئافتاورەکان، ناوچەوانی شۆڵەی شەمیان لە گەڵ خۆشەویستەکەی من بە چاو ئەبینی
دریغ منیش مەلێکی باڵدار بومایە
بە نیشان لەو زێدە تارایم بوایە
بە باڵ لەو زێدە بنیشتمایەتەوە

شاد بومایە بەو زێدە، بەو ماوا و مەحاڵە
تا دڵخوازەکەمم لە گەڵ پۆلی رەوێلان،
لە پێشەنگی رەوەی تەتاری خێڵان دا بدیایە!"(دیوان: 32)

## گەرمیان و کوێستان

شەم کچی کابرایەکی جافە. کۆچەرە. هەمو ساڵێ لە نێوان گەرمیان و کوێستان دا هاتوچۆ ئەکەن. پێ ناچێ وەلی هاورێی کۆچی خێڵ بوبێ. لە کاتێک دا دا شەم و خێڵەکەیان چون بۆ کوێستان وەلی لە گەرمیان چاوەرێی گەرانەوەی کردون. لە چاوەروانی دا ئەڵێ:

"یاران نەوبەهار
ئەمساڵ لە بەختی منا نەوبەهار بێ فەر بو
کۆچی تەڵمیتبار هاتەوە داوێنەکان
هەرچەند سەیرم کرد کۆچی یارم نەدی
خێڵان گشت هاتن
بەریز بڵاوبونەوە بە داوێنی بارگەی ئیمامانداا
نە کۆچی یاری تێدا بو، نە دەنگی یاران
بەهار بۆ من بو بە ژەهری مار
هەر گوڵێ بە رەنگێ لە خاک دەرهاتوە
ئەوان گوڵخەندان، من چاو بە گریان
هەر خونچەیەکم لێ بو بە پەیکانێ
هەر گوڵێ بە نێشی درکی هیجرانێ
هەر لالەیەکی داخدار، بە سەد هەزار داخ
داخیان ئەنا بە سەر دڵی حەسرەتکێشی مندا
سونبول وەک ئەشتەر ژانی ئەکردە دڵمەوە
تیژترە لە درکی لە پێما لە پەرەی گوڵ
نێرگز ئەبینێ خەمم بەرز ئەبێتەوە
ئاگر لە لەشما وەکو قەقنەس بو
سۆسەن زمانی تانەی لێ کێشام
لە داخی دوروڵاتی خۆم
سەیری چیمەن لای من وەک ژەهری مارە
هەر کە ئەڵێن بەهارە
لە بەرچی؟
لە بەر دوری شای شەم جەمینم
خەریکە گیانی شیرینم دەرئەچێ
یارا، هامسەران، سا چۆن ئەبێ
من تەبەس جێگەمە، شەم لە کوێیە؟"(دیوان: 84)

چونە کوێستان
"دڵ بەداخەوە
ئەمشەو دڵ بە داخەوە خەریک بو
بە داخی شەمی شەوچراوە
تا بایەک لە زۆزانەوە هات
بایەک وەکو شەماڵی باخی بەهەشت
هێزی ئەبەخشی بە گیانی سەدساڵە مردو
شەماڵێ وەکو هەناسەی مەسیح
ئارامی دڵی بریندار
هەم شارەزای ڕێگەی شای شەم جەبین بێ
دۆستی پەروانە خەمبارەکان بێ
بۆنێ لە عەتری زوڵفی شەم ئەمشەو
لە لوتی پەروانەی بێ خەوی دا
پرسیم:
ئەی شەماڵی هەڵکردوی بەیانی
لوت پڕ لە بۆنی عەتری زوڵفی شەم
دەوەندەی تیژباڵی سارا
ڕێنمای ڕێگەی حەیرانی
چۆنت زانی ئەمشەو منی مات، پەپولەیەکی پەشێوی بەندی تاریکستان بوم
کێ بۆنی عەتری شەمی دایتێ
ئەم بۆنەت بۆ هێنا، شەماڵ کێ دایتێ؟
وتی:
ئەی پەپولەی پەرسوتاوی زیز
تەن ماندوی ڕۆژگار، خورەمی ویساڵ
لەو جێیەی شەم ئەگریجەی شانە ئەکرد
ئەم بۆنەم هێنا بۆ پەپولە، بەڵکو ئازاری ئەسرەوتوی بشکێ و،
سەودای داخی دورکەوتنەوەی لەیلەکەی دابمرکێتەوە
منیش بۆ ئیحسان، لەو کاتەدا پرچەکانیم دا بە یەکداو،
بە پەلە هێنام بۆ تۆ
زانیم سودی هەیە بۆ بێخەوی!

بە فیدای شەماڵ بم عەتری شەمی پێ بو
ئەمشەو برینەکانم یەک یەک سارێژ بو
ئەگەر شەماڵ دەرمانی دەردی نەهێنامایە،
بێگومان لە دوری ئەو ئەمشەو ئەمردم!"(دیوان: 46)

ماڵی شەم دوا ئەکەوێ لە گەڕانەوەی بەرەو گەرمیان. وەلی داوا لە هەور ئەکا داکاتە باران و لافاو هەڵسێنێ بۆ ئەوەی ناچار بن زو بار و بنە بپێچنەوە و بگەڕێنەوە هەواری زستانە:

"هەوری نوێ!

تۆ خەمت پۆشیوە، منیش خەیاڵم خەماویە

بۆ تا هەردوکمان دەرونمان خەمگینە بە وێڵی

سەرانسەری ئەرز بگەڕێین

تۆ لە ئاسمان لاف، من لە سەر ئەرز ئاه

هەردوکمان روی گەردون رەش بکەین

تۆ لافاوی فرمێسکی چاوت بە گریان وەکو سێلاوی بەهار داڕێژە

منیش لە زەمین ئاهوناڵەی لە دڵی هەناسە ساردم هەڵسێ

تا بێ بە تۆفان تۆفی رستاخیز رەشماڵەکان ناچار بن لە بورجی لەیلاخ هەڵێن.

خێڵخانە لە تاو دوکەڵی ئاهی من و تۆ

سەرلەنوێ بگەڕێنەوە داوێنی گەرمەسێر

کۆچی خێلی جافی مرادی

لە گەڵ خۆشەویستەکەم بە شادیی بگەڕێنەوە

ئەوسا گەرمیان فەری تێ ئەکەوێ لە خۆشی تەتارانی دەشت

هەوری نوێ!

ئەگەر لە گەڵ یەک رێک بکەوین، من لە سەر ئەرز و تۆ لە ئاسمان، هەردوکمان بە تاو بگرین تۆفی زمهەریر پەیدا بکەین

بە جۆرێ تۆفان هەڵ بسێنین

تا خێڵەکان لە بورجی زۆزانەکان هەڵێنێن

هەمو رەشماڵەکان بگەڕێنەوە داوێنەکان

داوێنەکان بە خۆشی ئەوتوڵ ئەمامەکانەوە زەوق بکەن

شای شەم جەمین شاد بێ بەم شوێنە

خەیاڵی خەمباری منیش بکرێتەوە

تا منیش بە بینینی چاوی ئەو شاد بم

لە جەوری گەردون خاترم ئازاد بێ." (دیوان: 75-76)

## رەشماڵ

شەم لە رەشماڵ دا ئەژی، نەک هەر لە رەشماڵ دایە بەڵکو شای ناو رەشماڵەکان و خانی خانانە. ئەڵێ:

"شای رەشماڵەکان

شۆخی شیرینشەوق، شای رەشماڵەکان

شەمی شفابەخش شادی پەروانە

پێشەنگی رەوەی ئاسکە چاورەشەکان

تەتاری تائیفی تایەفەی تەتار

کە لە سێبەر سڵ ئەکا

قسەکانی وردەشەکری جوانەکانی رەوێڵان
نازی بە نەزاکەتی نازداری خێڵان
مامزی پەروەدەی کوێستان
دڵگیران بە دەردەوە، راوکەرەکان بە داخەوە
ئاسکی ناو هەردە و هەڵەتی گەرمیان
شاهینی شۆخی چاوجوان
داخێ کە تۆ داوتە بە جەرگما
تا رۆژی مردنم سارێژ نابێ
من راوکەرێکی نەزان بوم، تۆش نێچیرێکی سرک
بەداخەوە لە دەستم دەرچوی
مەگەر خواوەند
رۆژێ من و تۆ بە یەک شاد بکا
ئەگینا من راوکەرە سەرلێشێواوەکەی دەروەشتم
تا مردن بە دەردی دوریەوە ئەتلێمەوە" (دیوان: 56)

## کوچکی هەواران

رەشماڵ ئەگوێزرێتەوە لە هەوار هەڵئەدەن و چەند رۆژێ بە دیار مێگەلەوە ئەمێننەوە ئینجا ئەگوێزنەوە بۆ هەوارێکی تر. هەمو جار لە دوای خۆیان هەندێ شوێنەوار بە جێ ئەهێڵن، لەوانە ئاگردان.
ئاگردانی کوچەری کاتیە بۆ چەند رۆژێکە. بریتیە لە 3 بەرد کە بە 3 سوچ دائەنرێ بۆ ئەوەی مەنجەڵی دروستکردنی خواردن و ساجی نان کردنی لە سەر دابنرێ. وەلی لە بەردی یەکێ لەم ئاگردانە بەجێماوانە ئەپرسێ:
"بەردی هەواران!
بەردی رەشی سوتاوی هەواران
داماوی خەمگینی پاشماوەی یاران
هەی وەکو من هاوبەشی دەرد و پەژارە
تۆ بەردی کوێ و و هی کام هەواری.
لە تاو کێ رەنگت خەمبارەو
سوتاوی عەشقی کام ئەوهاڵی
کەوا بێدەنگ و بەدرەنگ و مات و دڵتەنگی؟
تۆ لە داخی کێ سوتاوی
پاشماوەی هەواری کام هۆزی؟
راست بڵێ: داخی دوری کێت لە دڵدایە
لە دوری کێ بەرگت رەشە؟

بەرد وتی: بەخترەشی ستەمکێشی خەم
پەروانەی پەشێوی دورکەوتنەوەی شەم

مەگەر نازانی و کوێراییت داهاتوە
کە ئەم جێیە شوێنی گوزەرگای خێڵە
نیشتمان و لەوەڕگای خێڵی جافە
جێگەی ژیان و جموجوڵی ناوکبۆنخۆشەکانە
هەوارگەی ڕەوێڵی خێڵی مورادیە
جێگەی شەوق و زەوقی کۆمەڵی دڵشادەکانە
من هەواری شەمی شای پەروانەکان و
خانی خاڵخاسەکانی ڕەشماڵەکانم
پایز. کاتێ کۆچی خێڵ کە دێتەوە داوێنەکان
تەشریف دەهێنن بۆ ئەم شوێنە
من سوتاوی شەوقی شوعلەی ڕوی شەمم
داخداری روناکی ئەو ئەستێرەی بەیانەم
کە بەردی هەوارەکە وای پێ وتم
ئیتر من لەو خراپتر زمانم لاڵ بو
زانیم ئەویش سوتاوی شەوقی ئەو شەم روخسارەیە
داخی تامغەی دەستی ئەو یارەی پێوەیە
منیش لە دوری شای شەم روخسارەکان
بوم بە هاورەنگی بەردی هەوارەکان
لەشی منیش وەکو بەردی ڕەشی هەوارەکان
پاشای خەمکێش و خەمدارە" (دیوان: 53)

**سەگ و مێگەل**

ماڵی باوکی شەم داژەڵدارن. داژەڵدار سەگ بۆ پاسی مێگەلەکەی و ڕەشماڵەکەی رادەگرێ. ئەوانیش وەکو خەڵکی تر سەگیان ڕاگرتوە. سەیر لەم شیعرەدا ئەوەیە وشەی "کەلب" ی عەرەبی لە باتی وشەی "سەگ" بە کار دەهێنێ، لە کاتێک دا لە ناو جاف دا ئەم وشەیە باو نەبوە. لەمەش سەیرتر ئەوەیە سەگ، بە پێی ئاینی ئیسلام، گیاندارێکی گڵاوە کەچی وەلی کە لە گەڵی دەکەوێتە گفتوگۆ، لە بەر خاتری شەم خۆی دەکا بە فیدای، ئەمەش ئەوپەڕی سوکایەتی کردنە بە کەسایەتی خۆی.

"سەگی کۆی یارم!
پاسەوانی دەرگای یارم
هاوڕێ و هاورازی دۆستە دڵدارەکەم
خاکی پێت سەر هەردو چاوی تاریکم
خۆ تۆ لە تاقمی وەفادارەکانی
خەمخۆر و دڵسۆزی هەمو دڵبریندارەکانی
سەگێکی لە ماڵی باوکی دۆستدا لە دایک بوی
دلگوشای یارانی مەجنون پۆستی
ئەزانم بۆ ئەوەی زویر نەبی، دڵدارەکەم بە دەستی خۆی پەروەردەی کردی

ئەگەر خوانەخواستە قەستی سەری بکەی
هەمو ڕۆژێ لە ڕۆژەکەی تر سزا بکێشی
بە بیرما نە ئەهات وەفادارێکی وەکو تۆ دەس لە دەرگای ماڵی دۆست هەڵبگرێ.
ئەی هاودەردی دەردم!
لە جێگەی هەمو خزم و کەسوکارم!
هۆی چیە بەمجۆرە لە دەرگای دۆست دور کەوتویتەوە و
چۆنە ئارامت گرتوە و سرەوتوی و
وەکو من وێڵی دەشتەکانی.
هەر شەوەی لە جێگایەکی؟
سەگ وتی: ستەمکێشی زەمانە. هەی ئاحاڵ، پەروانەی جوانی روی شەم
مەگەر کوێرابیت ئاهاتوە کە نازانی ئارەزوی من ئەبوە بەڵکو دەستی زۆر بوە
باوکی شەم ئارەزوی شاری بەغدای کرد، ئەویشیان بە زۆر، بە بێ ئارەزوی خۆی، هێناوە بۆ پاسی مێگەلەکەی
تا گورگ لە ڕانەکەی نەدا
ئەمە مەرەکانی باوکی دۆستەکەتە..
ئەگینا لە کوێ بە بێ بیانو
بەرگەی جەوری ئەم بیابەنەی ئەگرت؟
ئازیز!
فیدای سەگە وەفادارەکەی ڕاسپێردروای ڕێگەی شاری بەغدات بم." (دیوان: 67)

## چاوەڕوانیی بێ هودە

پاش ئەوەی ماوەیەکی درێژ هەواڵی شەمی پێ ناگا. دەلیل ڕانەسپێرێ هەواڵێکی ڕاستی بۆ بهێنێ کە ئاخۆ بە تەمای شەم بێ یان بێ ئومێد بێ چونکە دڵی بە یەکێکی تر داوە؟
"دەلیل شەمت نەدی
کە لە لەیلاخەوە هاتی سپی شەمت نەدی؟
...
کۆچی خێڵخانەی ئێلی جافت نەدی
سەرباری جوانەکانی سەوڵساف،
شەمی شادی پۆلی پەروانەکان.
خانی ڕەشماڵی گشت خانەکانت نەدی؟
... هتد(دیوان: 44)

## بە کۆی زوخاڵ بێ

ئەڤین ئەشێ خۆشەویستی بەرهەم بهێنێ بەڵام لە لای وەلی خەشم و قینی هێناوە. لەم شیعرەی دا ئەوپەڕی خۆپەرستی دەرئەبڕێ. دوعای شەڕی لە باوکی دڵدارەکەی کردوە توکی لێ ئەکا ماڵی باوکی شەم کوێر بێتەوە بۆ ئەوەی ئەچن بۆ کوێستان:
"قیبلەم زوخاڵ بۆ

ماڵی باوکت بە کۆی زوخاڵ بێ
چاوی کوێر و زمانی لاڵ بێ
باوکمردو بی و شاییت لێ تێک بچێ
خوایە هاوار!
دور لە باڵای تۆ ماڵەباوانت کوێر بێتەوە
بە جۆرێ بێکەس بیت کەست نەمێنێ
بایەقوش لە شوێنی باوانت بخوێنێ
بۆ ئەوەی نارەزوی چونە بورجی کوێستان نەکەی
وەک من خەمبار و دڵپڕ لە خەم بی
ئەگینا تۆ بەو بورجی بەرزی زۆزانەوە،
کەی دەربەدارێکی دێوانەی ناشادی وەکو منی بیر ئەکەوێتەوە؟"(دیوان: 65)

گا مویەرد هون چەمەی چەم
تەکرار مەکەرد فەرد دێوانەکەی شەم
"سەیری سەربەردان لەیلاخان کەردی
ئەی شەم حەیفت کرد جە من ویەردی (دیوانی مەولەوی: 189)

# گەشتێ لە گەڵ تالعی

## تالعی

## کێیە؟ کەی ژیاوە؟ لە کوێ ژیاوە؟ چۆن ژیاوە؟

پیرەمێرد لە وتارێکی ئەدەبی دا، کە لە ژێر سەرناوی "شاعیرە گوم بوەکانمان" دا نوسیوێتی ئەڵێ:

"ئەم خاکی ئێمەیە وەک دەشتی گەرمیان چۆن لە خۆیەوە دومەڵانی لێ هەڵدەتۆقێ ئەویش ... بێ خوێندن و فێرکردن هەروا لە خۆیانەوە شاعیر بون. ئەمما چۆن شاعیرێک؟ گرەویان لە دوازدە عیلمە داهیەکان بردۆتەوە. موفتی زەهاوی، کە داهی زەمان و ئافەتی جیهان بوە، لە شیعری رەوانا ناگاتە حەسەن کەنۆش. چاومار نابێ بە حەمە ئاغای دەربەندفەقەرە. پێنجوینی نەیتوانیوە چوار شیعری وەک ئەولای حەسەن بڵێ. ئەمە بەهرەیەکە خوایی و هەوایی..."(ژین، ژ: 894)

حەمە ئاغا، لە شیعرەکانی دا هەندێ جار تالع (طالع) و هەندێ جار تالعی (طالعی) ی هەڵبژاردوە بە نازناو (تخلص) ی خۆی. لە کۆتایی شیعرەکانی دا ئاماژەی پێ کردوە. زۆر کەم لە سەر تالعی نوسراوە و تا ئێستا کەمێ لە شیعرەکانی کەوتۆتە بەر چاو. ئەوەی لە سەریشی نوسیوە هیچ بەڵگەیەکی بە دەستەوە نەداوە، بەڵکو هەندێ لەو زانیاریە کەمانەی هەن جیاوازییان تێدایە.

ئەمین زەکی نوسیوێتی:

"خەڵکی دێی دەربەندفەقەرەی نزیک سلێمانی بوە. شاعیرێکی دێهاتی بوە. حەزی لە ئافرەتێ کردوە شەیدای بوە. ئەورەحمان پاشا خواستویەتی و مارەی بڕیوە. محەمەد ئاغا ئارامی لێ بڕاوە قەسیدەیەکی لە هەجوی ئەورەحمان پاشادا داناوە. داوای گێڕانەوەی خۆشەویستەکەی لێ کردوە. پاشا بەزەیی پیا هاتۆتەوە. دڵدارەکەی بە جل و جیازی و خشڵەکانیەوە پێشکەش بە محەمەد ئاغا کردوە.

ئەم "هەجو" ە مەشهورە 50 بەیتە لە سەرەتاکەی و کۆتاییەکەی دا ئەڵێ: میرزام تەوارێ...

ئەم قەسیدەیە لە دەوروبەری ساڵی 1210 ک دا نوسراوە." (355: مشاهیر الکرد و کردستان)

ئەمین زەکی لە جێگەیەکی تردا نوسیوێتی:
"حسێن نازم بەگ لە دەفتەرەکەی خۆی دا، دەرحەق بە فەزائیلی ئەورەحمان پاشا زۆری نوسیوە..
باسی کچێکی دەربەندفەقەرەییش ئەکا کە ئەورەحمان پاشا حەزی لێ کردوە و مارەی بڕیوە و گواستویەتیەوە.
محەمەد ئاغا ناو عاشقێکی ئەو کچە چەند قەسیدەیەکی پڕ لە هاوار و شیوەنی بۆ پاشا ناردوە و لە سەر ئەوە ئەورەحمان پاشا بەزەیی پیا هاتوتەوە و کچەکەی بە هەمو جل و تەداروکاتەوە پێشکەشی ئەو عاشقە دڵسۆزە کردوە.
ئەوەل و ئاخری ئەو مەنزومەیە ئەم دو شیعرەیە:
میرزام تەوارێ.....

بەعزێک بە خیلافی حسێن نازم بەگەوە ئەڵێن ئەم ماجەرای محەمەد ئاغای دەربەندفەقەرەیە لە دەوری ئەحمەد پاشای ئاخر ئەمیری بەبەدا بوە." (94-95: تاریخی سلێمانی وە وڵاتی)
ئەحمەدین مەلا نوسیوێتی:
"حەماغا شاعیرێکی زگماک و نەخوێندەوار بوە، نازناوی تالعیە، لە ناوەڕاستی سەدەی سیازدەهەمدا ژیاوە، وە هاودەوری ئەحمەد پاشای بابان بوە. حەماغا بێجگە لەوەی کە شاعیر بوە پیاوێکی دلێر و زەبردەست و بەخشندەش بوە، لە بەر ئەمە ئێلەکەی کردویەتی بە کوێخا و دەمڕاستی خۆیان. لەم هەڵبەستەی خوارەوەی دا دەسگیرانەکەی کردوە بە باز و ئەو مێملەش کە فڕاندویەتی بە شمقار، ئەڵێ:
میرزام تەوارێ..." (ژین، ژمارە: 1350)
حەمە ئاغا لە سەردەمی حاجی قادری کۆیی دا (1816- 1897 ز) ناسراو بوە. ناوبانگ و بەرهەمی گەیشۆتە ناو کوردەکانی ئەستەموڵ. حاجی لەو شیعرەدا کە تەرخانی کردوە بۆ تۆمارکردنی ناوی شاعیرانی کوردستان، هەم ناوی ئەحمەد بەگی کۆماسی بردوە و هەم ناوی حەمە ئاغا و، ئەڵێ:
دو وەحیدن محەمەد و ئەحمەد
یەکێ کۆماسیە و یەکێ دەربەند

تالعی تا ئێستا دیوانێکی کۆکراوەی نیە. هەندێ لە شیعرەکانی بە پەرت و بڵاوی لە کتێبی جیاواز و گۆڤار و ڕۆژنامەکان دا بڵاوبونەتەوە. ژمارەشیان زۆر نیە. زۆرترین ژمارەی شیعرەکانی لە کەشکۆڵەکانی محەمەد عەلی قەرەداخی و بەرگی سێیەمی "بوژاندنەوەی مێژوی زانایانی کورد" دا بڵاوکراونەتەوە. بەڵام پێ ئەچێ دەسنوسەکانی کە شیعرەکانی لێ گواستونەتەوە، بە باشی نەنوسرابنەوە. یا ئەو بە باشی بۆی نەخوێنرابنەوە. بۆیە جۆرێ لە هەڵە و تێکەڵی کەوتۆتە ناو شیعرەکانەوە کە هەندێ لە مەعناکانی شێواندون.

## دەربارەی شیعرەکانی

قاڵبە شیعریەکانی تالعی، ئەوەندەی لە بەر دەستدایە دەری ئەخەن:
**یەکەم،**
پەیڕەوی هەمان قاڵبی مەدرەسەی گۆرانی کردوە لە دەسپێک و سەرەتای شیعرەکانی دا.

نمونە 1:
شیرین جەماڵش
شیرینتر جە ماە حوسن و جەماڵش
چون زەنگی زوڵمات زوڵفی زوخاڵش
منمانۆ چون نەجم حەب دانەی لاڵش
دو ئەبرۆ چون قەوس نیکی سەربەستە
هیلالەن نە بورج قەمەر پەیوەستە.... هتد (79)

**دوەم،**

کێشی هەر یەکێ لە سەدر و عیجزی بەیتەکانی (نیوە بەیتێ) لە شیعرەکانی 10 بڕگەیە و لە نێوان 5 بڕگەی یەکەمی و 5 بڕگەی دوەمی دا ئیستێک هەیە.

نمونە 1:
گەر – دن – می – نا - رەنگ / سو – را – حی - س - فەت
سا – فیش - وە - می - نا / چەند - دا - دەن - خە - فەت
کەیلەن جە بادەی شاهان پەسەندە
ئەقواتەر جە مەی ئەربەعین مەندە (81)

نمونە 2:
غە - زا – لی – غا – زی / غە - زا - کەر - دەی - دڵ
چە - ری - دەی - چو - زەی / سەن - گەر - چەی - سون - بوڵ
تەواری تەرلان تەیری هومافەڕ
چنگت بە هوناو دڵەی عاشق تەڕ(87)

نمونە 3:
سەدای تەپڵی دڵ نە تۆی دەرون دا
دەنگ دا نە ئەفلاک، شی وە هامون دا (90)

**سێیەم،**

لە قافیەدارایی دا هەوڵی داوە "سنعەتکاری" بنوێنێ بۆیە بە چەند جۆرێ قافیەدارایی کردوە:

**ئەلف،** هەندێ لە شیعرەکانی مەسنەویی جوت قافیەن.

نمونە 1:
نەوهاڵی ئەوخێز ئەورەستەی چەمەن
نازکتر جە وەڵگ شکۆفەی سەمەن
شەمعی شەبوستان، جەمین جامی جەم
تۆپی گوڵ سورەت، عەقدی خونچەدەم
عاریز جە مایەی ئیعجاز منەوەر
ماهتابی شەب، شوعاعی خاوەر(87)

نمونە 2:
ناری فیرقەتت جە فەرقم بەرزەن
شوعلەی شەم ئاسات شەرارە تەرزەن
ڕەونەقم جە ڕەنگ زەعفەران تارەن
زەردی و زەبونیم گەوهەر وە بارەن
دیدەم بینابیم نە ڕاگەی ڕاتەن
پەی نەدینی تۆ ڕەنگی زوڵماتەن (90)

بێ، هەندێکی تری سەدر و عیجزی بەیتەکانی هەمو شیعرەکەی لە سەرەتاوە تا کۆتایی هاوقافیەن.

نمونە 1:

دڵ وە تۆن مایل
وە دیدەت سەوگەند دڵ وە تۆن مایل

| | |
|---|---|
| نوری بینابیم شیرین شەمایل | کێ وە باڵای تۆ مەبۆن حەمایل |
| زیندەگیم نەمەند، عومرم بی زایل | ڕۆێ وە ڕوی تۆ نەبیم موقابیل |
| بەشقی ڕای نەڵا مەکەران سایل | حەق واچە پەریم هیچ نەبۆت حایل |
| ئەر تۆ وە ئەرواح جێم مبی قایل | فیدای فەرقت بام وە بێ دەلایل |
| وەرنە سۆزانەن وە سۆزی هایل | سۆزی عیشقی تۆ من کەردەن زایل |
| بەرزەن بڵێسەم جە گشت حەوایل | تالیع بی وە پەند – بین القبائل – (93) |

نمونە 2:
چراخم ماران
سەرسام بیم نە سام زەمزەمەی ماران
............ اران. تا کۆتایی (78)

نمونە 3:
قیبلەم ئیتیفاق
قیبلەم ئەر مەبۆت چەنیم ئیتیفاق
.......... اق. تا کۆتایی (83)

نمونە 4:
پەیکی عەنبەر بۆ
فیدات بم شەماڵ پەیکی عەنبەر بۆ
........ ۆ. تا کۆتایی (272)

جیم، یەکێ لە شیعرەکانیشی، لەوانەی لە بەر دەست دان، بە قاڵبی تەرجیعبەند هۆنیوەتەوە. تەرجیعەکەی ئەڵێ:

تا سەرم زیندەن هەر وە تەماتم

**چوارەم،**
لە کۆتایی شیعرەکانی دا ئاماژەی بە نازناوی ئەدەبی خۆی داوە:

نمونە 1:
فوغانم بەرز بی چون گەستەی ماران
"تالع" م نە بورج عەقرەب شوماران (79)

نمونە 2:
کۆتاکەر کەلام "تالعی" زەخمین
دڵزەدەی ناواک پەیکانی شیرین (82)

نمونە 3:
بنمانۆ نیهان نە پەردەی پێوار
نیگاکەر "تالع" وە کێ مەبۆ یار (83)

نمونە 4:
"تالع" تا زیندەی دەوری نافاقەن
چون تەیری تاقتاق ویردش هەر تاقەن (84)

نمونە 5:
خەتمی سەوگەندم تولی باڵاتەن
"تالع" تا زیندەن سەرش نە راتەن (86)
ئەم نەریتە لە ناو شاعیرانی ئەدەبی فارسی دا باو بوە. شاعیرانی مەدرەسەی گۆران هەندێکیان پێڕەوی ئەم نەریتەیان نەکردوە و هەندێکیان کردویانە. تالعی یەکێکە لەوانەی کردویانە.

**پێنجەم،**
ئەم وەستایەتیە لە هۆنینەوەی شیعرەکانی دا دەری ئەخەن کە نەک هەر نەخوێندەوار نەبوە بەڵکو ئاگاداری ئەدەبی مەدرەسەی گۆران بوە و، تەلاری هۆنراوەکانی بە پێی هەمان ئەندازەگیری بنیات ناوە.

**شەشەم،**
جگە لەمانە، هەندێ وشە و تەعبیری عەرەبی بەکارهێناوە کە نەخوێندەوارێکی کورد، بە تایبەتی نەخوێندەواری ئەو سەردەمە، نەیتوانیوە بیانزانێ و تێهەڵکێشی هۆنراوەی رێکخراویان بکا. ئەمەش پێچەوانەکەی ئەسەلمێنێ. حەمە ئاغا، وەکو بە ناوەکەی دا دەرئەکەوێ، مەلا نەبوە، ئاغا بوە، بەڵام چەندێ خوێندوە و لە کوێ خوێندویەتی ئەوە بابەتێکی ترە. تەنانەت هەندێ جار باسی سورەتەکانی قورئانی کردوە، هەندێ جاریش یاری بە حەرفەکانی نوسین کردوە:

نمونە 1:
ئەفشان کەردەن موشک وە روی کافوردا
چون سورەی – واللیل – وە سەفحەی نوردا (92)

نمونە 2:
خەطێ ئەلف وار کەشیدەن جە سیم
جە مابەینی عەین ساختەن دو میم (نیم!)(80)

نمونە 3:
بەو گێسوی موشکین سەودایی خەم خەم
چون میم حامیم (!) دەم گەرتەن ئەدەم (86)

نمونە 4:
خاڵی روی بەدر یا فەرقی جیمەن
یا خەطی مەعکوس خامەی قەدیمەن(79)

## هەڵسەنگاندن

پاشماوە ئەدەبیەکانی تالعی ئەوەندەی لە بەر دەست دان زۆر نین. ئەگەر لە هەندێ لایەنی رەخنەییەوە سەرنجی لێ بدرێ، چەند شتێکی لێ ئەخوێنرێتەوە:

**یەکەم،**

بیرۆکەی جوان و سۆزداری بە بیردا هاتوە. وەکو:

باسی ئەڤین ئەکا، کەسێ کە خۆشەویستی یار نیشتبێتە ناخی دڵی هەزار لوقمان ناتوانێ زامی دوریەکەی چارە بکات...

باسی ئەگریجە ئەکا، بە دوژمنشماریان ئەچوێنێ، لە پەڕی باڵی پلیسرک (پەرەسێلکە) رەشترن و لە بیری ئەرەستو ناسکترن و، کە وەکو دو مارەکەی سەر شانی زوحاک بەسەر شانی ئەمیش دا شۆڕ بونەتەوە...

باسی گوڵ و درک ئەکا، یار ئەشوبهێنێ بە گوڵ و ئەیارەکەی بە درک. بەڵام لە هەر جێیەک گوڵ هەبێ درکێکی تێ ئاڵاوە...

هەوڵی داوە ئەم بیرۆکانە لە چوارچێوەی شیعردا دابرێژێ. دارشتنەکانی ناهەنگدار نین و زمانەکەی سادەن بەڵام رەوان نین. ئەڵێی زۆری لە خۆی کردوە بۆ ئەوەی شیعر بەم لەهجەیە دابرێژێ.

نمونە1:
عەشق

عەشقی تۆ بەی تەور نە دڵ کەردەن کار
غەیر جە تۆ جە لام – لیس فی الدیار –

کەسێ عەشقی یار جە دڵ بۆ موقیم
عاجزەن جە دەست لوقمانی حەکیم

دەوای دەردی عەشق پەی وەسڵی دولبەر
نمەبۆ خەلاس تا وە رۆی مەحشەر

تالع ئەر کەسێ زەخمی نێش بار بۆ
چون مەبۆ خەلاس لوقمان هەزار بۆ(91)

نمونە 2:
گێسو

جفتێ سیا حەی چون توغرای مەنجوق — سەراوێز نە ئەوج مەکانی عەیوق
غەبرا، موزەییەن، میشکین، موسەلسەل — شکەن بەر توغرای ... موتەوەل
سیاتەر جە باڵ پەڕی پەرەستو — نازکتەر جە فیکر بیکر ئەرەستو
ئەفشان کەرد میشک وە روی کافوریا — چون سورەی – واللیل - وە سەفحەی نوریا
چەلیپا چەوگان بەندی زنجیرەن — خەم ئەندەر خەمەن مورغ دڵگیرەن
چەنبەری چەنبەر، سەرکەشەی سەرکەش — میشک چین چین ریشەی دڵان کەش
هیندوی سیاکار ئەیجوری شەب رەنگ — رشتەی کافرکێش زوناری فەرەنگ
رایحەی رۆحەن تاتاش مدۆ سو — عارفان بەردەن نامش بە گێسو

تالع جەو سەبەب سینەش چاک چاکەن
ماران ئاوێزان نۆش زوحاکەن(93)

نمونە 3:
گوڵ و درک

ئەورم دا ئەوران دایرەی شەش تاق — گوڵێ وە بێ خار ئەدیم جە ئافاق
ئەر جە باغستان ئەر جە گوڵزارەن — جە هەر کۆ گوڵێن ئالودەی خارەن
ئەلخسوس گوڵێ چون تۆ عەجەب رەنگ — بۆی عەترت مشۆ فەرسەنگ وە فەرسەنگ
مەگەر جە فیردەوس باقی پەیدا بۆ — یاخو جە گوڵزار رەوزەی ئەعلا بۆ
خارێ نە پادا دایم پەیوەستەن — جە داخی ئەو خار جەستەی من خەستەن
.....
فوغانم پەی وێم مناڵۆم پەی گوڵ — خار و گوڵ وە هەم کارێوەن موشکڵ
سا مەر بە ئەلتاف دانای بێ قیاس — بەرباد کەرۆ خار، گوڵ کەرۆ خەلاس

وەرنە تالعی زام زەدەی فەلەک
زامش هەزارەن، ئەو هەزار و یەک(89)

رەنگە ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە زمانی قسەکردنی رۆژانەی تالعی خۆی هەورامی یان گۆرانی نەبوە و، دانیشتوانی ناوچەکەشی بە گۆرانی نەدواون. ئەو سەردەمە هێشتا دانانی شیعر بە لەهجەی بابان و قاڵبە شیعریەکانی مەدرەسەی بابان نەبوە بە باو. بەڵکو شاعیرانی ناوچەی بابانیش بە لەهجەی گۆران شیعریان هۆنیوەتەوە، لەوانە رەنجوری و مەولانا خالید...

**دووەم،**

کاریگەری ئەدەبی فارسی بە شیعرەکانەوە دیار نیە، کەچی هەندێ جار وشەگەلی عەرەبی و تەعبیری ناقۆڵای هەڵبژاردوە و لە شوێنی نالەباردا بە کاری هێناون، کە ئەگەر بیویستایە ئەیتوانی وشەی جوانتری کوردیی خۆجێی لە جێگەیان دابنێ.

شاعیرانی مەدرەسەی گۆران لە بێسارانی و خانای قوبادییەوە تا مەولەوی کە رەفتاریان لەگەڵ زۆربەی وشە عەرەبیەکان کردوە، بە جۆرێ لەگەڵ زمانی کوردی سازاندویانن کە بە ئەستەم ئەناسرێنەوە. وشەکان بونەتە بەشێ لە فەرهەنگی زمانی کوردی.

لەوانە: ئازیز: عزیز. ئالا: اعلی. ئەلوەدا: الوداع. مۆبەت: محبە. مۆلەق: معلق. وادە: وعدە. زامەت: زحمە. عەزاو: عناب. جواو: جواب. تاڵە: طالع. تاقی: تحقیق...

تالعی لە بەکارهێنانی وشەی عەرەبی دا ئەم رێبازەی نەگرتوە. وشەکانی وەکو خۆی هێشتۆتەوە. هەندێ جار لە ناو وشەگەلی کوردی دا ناساز ئەزرنگێنەوە.

لەوانە: بورجی بەیضا، تازە توفاح، دو عەینی شەهلا، دو عەینی مەخمور، عەینی عینایەت، صەحیحول نەسەب، صەفحەی سیم، شەمسی مونیر، سری میقراض، قاعیدەی ضەیقەتول نەفەس، لەیسە فیل دیار، مونقەطیع ئاثار، لەم یەزەل، تەحتەینی ئەور و سەمەک، ئەزراق، ئینحیراق، مینقار...

رەنگە ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ژینگەی تالعی، ناوچەی دەربەندفەقەرە و دەوروبەری، لە عەرەب و کۆمەڵگای عەرەبیەوە نزیکتر بوبێ تا فارس و کۆمەڵگای ئێرانی.

**سێیەم،**

لە کێشانی وێنە شیعریەکانی دا هەمو جار سەرکەوتو نەبوە.

لە گەڵ هەمو ئەمانەش دا چەندین شیعری شایانی لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنن. بە تایبەتی ئەوانەی کە پەیوەندییان هەیە بە زەوتکردنی یارەکەی لە لایەن کەسێکی دەسەلاتدارەوە. هەروەها بە شێوەیێکی کە بۆ مەرگی "یار"ەکەی کردوە و هاوشێوەیە لە گەڵ شێوەیێکی کە ئەحمەد بەگی کۆماسی بۆ "لەیل" ەکەی کردوە.

تالعی لە شیعری "میرزام تەوارێ" دا سکاڵا ئەکا کە خۆشەویستەکەی لێ رفێنراوە. بە دیاریکراوی ئاماژە بە کەس ناکا. رەنگە پاشا بوبێ، رەنگە کەسێکی کە بوبێ. یارەکەی خۆی بە تەوار (بازی مێ) و رفێنەرەکەی بە شمقار (بازی نێر) ئەشوبهێنێ. باسی ئەوە ئەکا تەوارێکی لە پای کۆسارێک دا راو کردوە و، پەروەردەی کردوە

لە چەرمی لەشی خۆی ئەسبابەکانی ساز کردوە

لە ناو کالانەی چاوی دا جێگەی کردۆتەوە

بە برژۆڵی چاوی پەرژینی نشینگەکەی کردوە

لە پێستی سەری کڵاوی بۆ دروست کردوە

لە چەرمی لەشی داوە بەنی قاچی ساز داوە

لە پارچەی جەرگی چەشەی بۆ داناوە

بەڵام لە پڕ شمقارێکی لێ پەیدا بوە پەلاماری داوە بازە نازدارەکەی بە هەمو کەلوپەلەکانیەوە لێ رفاندوە. ئیتر ژیانی تاڵ کردوە، بەڵام خۆی، بۆ هێنانەوەی، هیچی لە دەست نایە مەگەر دەستی بە توانای قودرەت موعجیزە بنوێنێ بازەکەی بۆ بگێڕێتەوە. ئەڵێ:

میرزام تەواریێ!
شیروانی بازێ، تەرلان تەواریێ
چوستی تێزپەرواز، شیرین شکاریێ یاوا وە دەستم نە پای کۆهساریێ
دڵ بێ ئیختیار موبتەلای باز بی ئەقڵ و فکر و فام گشت نە پەرواز بی
وە سەد نەزاکەت تەرتیب باز دام ئەسبابش نە چەرم ئەعزای وێم ساز دام
جە سوب تا ئێوار، جە شام تە سەحەر وازام چەنی باز وێنەی بازی کەر
ئەوەڵ، نە عەینم عەیان کەردم جاش
مەقام عەینەین کەردم وە مەئواش
کڵاوش نە پۆست فەرقم قەرار دام تاکە فەرقەدان فەرق نەبۆ مودام(!)
بەندی ریشەی دڵ کەردم وە جلفوش سازدام توعمەی جەرگ پەی بانگی قوقوش
پارچەی ئیستیخوان گەردن کەردم واز کەردم بە وەتراق بازی تێزپەرواز
تایێ جە تۆمار هەستی جەستەم سەند وەستم نە پای باز نە جای پارچەی بەند
دەورانش پەی حیفز وە موژگان تەندم پەی نشینگەی باز شۆخی دڵبەندم

شاد بیم چەنی و باز شاهانە دەستور نە خەسرەو زانام، نە بەهرام گور
بێ خەبەر جە مەکر دەوری ئەفلاک بیم لاقەید جە شۆرش دایەرەی خاک بیم

هجوم کەرد نە چەرخ بە یەک پرتابش رفانا بازم چەنی ئەسبابش
من لەو جاگە مام سەراسیمەوار غەڵتان بیم جە خاک وە بانگ و هاوار
لەو دوا خێزام وە زاری و مەلال رو کەردم ئەو شۆن شمقارێ قەتال
هەرچەند قوقوم کەرد هیچ نەداشت ئەسەر عەدەم بی نە عەین باز ناز پەروەر
میرزام! جەو رۆژە بازم نایابەن زیندەگیم زاری، زەوقم عەزابەن
مەر یەدی قودرەت – مالک الاعجاز – بە ئیعجازی وێش باز ماوەرۆ باز
وەرنە تالعی چێش مەیۆ جە دەست
خەستە و غەم نە دۆش، زەعیف و دەستبەست (99)(ژین: 1350)

پەروەردە کردنی باز بۆ راو و، راوکردن بە باز، یەکێ بوە لە سەرگەرمیەکانی چینی سەرەوەی کۆمەڵی کوردەواری و وەرزشێکی گرانی ئاریستۆکراتی‌یانە بوە.

لەم شیعرەدا، دەرئەکەوێ تالعی شارەزاییەکی باشی هەبوە لە چەشنەکانی باز و بازەوانی و راوی باز و راو بە باز. وشەگەلێکی بەکارهێناوە، پەیوەندیدارن تایبەت بە بازەوانیەوە لەوانە: باز، شمقار، تەوار، قوقو، جلفوش، توعمە، کڵاوی سەری باز و داوی پابەندی قاچی...

شارەزایی لەم وەرزشەدا نیشانەی پایەی کۆمەڵایەتی تالعیە.

داگیرکردنی خۆشەویستی یەکێ لە لایەن یەکێکی بە دەسەڵاتترەوە، روداوێکی نالەباری کۆمەڵایەتیە، لە هەمان کات دا کارەساتێکی دەرونیە بۆ لێقەوماوەکە.

کەسێ لە خۆی بەهێزتر خۆشەویستەکەی بڕفێنێ دەسەڵاتی سەندنەوەی نەبێ، چی ئەکا جگە لە پاڕانەوە لە خوا و دوعای شەڕ لە دوژمنی زەوتکەر. تالعی یش هەروای کردوە، لە چەند شیعرێکی دا ئەم بارە دەرونیە ڕەنگی داوەتەوە. لە شیعرێکیان دا ئەڵێ:

من جە تۆ جیا
هەرکەس کەردە بۆ من جە تۆ جیا
هانام وە بارگەی بورجی ئەنبیا
کۆی غەم ئەدۆش بۆ، سەرتاپا سیا
بە شمشێری مەرگ جەستە زەخمین بۆ ....(!) غەرقی زەمین بۆ
مەئیوس جە ئەلتاف ئەنعامی حەق بۆ فەرقش چون میقراز کاتب وە شەق بۆ
کەڵلەش گەرم نالود، جگەر پارە بۆ ئەعزاش چون خارپشت پڕ جە خارە بۆ
دایم چون مەعلول خەستە و مەلول بۆ شەرمەندەی دیوان بەزمی ڕەسول بۆ
مەقامش نە موڵک، کونجی دۆزەخ بۆ گاهێ ئاتەشناک، گاهێ چون یەخ بۆ
نە ساڵش مانۆ، نە ڕۆژش، نە ماه عومرش چون یەکدەم بویەرۆ ناگاه
چونکە ئەی ئەردە شانای جە بەینا
تۆ بەرد ئەو حیجاب من دا وە تەندا... هتد (84)

لە شیعرێکی تری دا، کە بە هەمان ئەفەس هۆنیویتیەوە و، لە شیعرەکانی تری زیاتر بڵاو بۆتەوە، دوعای شەڕ لە سەبەبکارەکەی ئەکا. ئەڵێ:

سەبەبکاری یار!
یا حەی، یا قەیوم، سەبەبکاری یار!
فانی بۆ جە دەهر، مونقەتیع ئاسار
عومرش کۆتا بۆ، بسوچنۆ بە نار
فەوتی باریقەی بەرقی فەڵەک بۆ مەئواش جە تەحتەین سەور و سەمەک بۆ
شەفەق نە دیدەش وێنەی دەیجور بۆ کاسەی بینایی‌یش مەنزڵگەی مور بۆ
مەحبوسی ئازار، مەعلولی دەرد بۆ مودام چون (ئاهر!) سەرتاپا سەرد بۆ
بە ئاهی جەرگم لەت لەت جەستە بۆ یەک ڕۆ نیمەساغ، سەد ڕۆ خەستە بۆ
من بەدیم چێش بی ئید کەرد ئەکارم
بەی تەور مەئیوس بیم جە دین یارم؟
چونکە ئەو بەدکار بەدی بەدشیعار غەداری خائین، خەیانەت ڕەفتار
کەففەن پەی من جە ساڵێ یەک بار بوینام جە دور توڵی باڵای یار
یاخو جە ماهێ یەک دەم دیدارش بدیام پەی ئارام شەوقی ڕوخسارش
تا شەوقی شوعاع شەمسی خاوەر بۆ تا تالع جە دەهر وە زیندەی سەر بۆ
شەرت بۆ بێ دوعا ئەکێشۆم ئەفەس
تاکە سەبەبکار مەبۆ وە قەقنەس (97)

تالعی وەکو خۆی لە تەرجیعبەندێک دا ئەڵێ سەرەڕای هەمو ئەمانە: "تاسەری زیندو بێ هەر بە تەمای" یارەکەی ئەبێ:

قیبلەم فیداتم
هەرتاکەی مەردەن من وە فیداتم
غولامان دەستور نە خاکی پاتم
تا سەرم زیندەن هەر وە تەماتم

لەعل قیمەتی پارچەی ئەڵماسم — خواجەی من تۆنی هەر تۆ مشناسم
غولامی زەرسەند، عەبدی ئیخلاسم — تۆ گەوهەر، ئەمن پەرێت غەواسم

ئەگەر نیم ساعەت نە روی بیساتم
تا سەرم زیندەن هەر وە تەماتم

کۆکەنم پەرێت چون فەرهادی چین — چون سەنعان پەرێت بەر مشوم جە دین
چون مەجنون زوخاو وێم مەکەرۆن نۆش — چون بەهرام پەرێت مبۆن نمەدپۆش

چون یوسف خەریک چاهی زوڵماتم
تا سەرم زیندەن هەر وە تەماتم (94)

بە پێی گێڕانەوەکەی حسێن نازم، ئەورەحمان پاشا "کچەکەی بە هەمو جل و تەداروکاتەوە پێشکەشی" حەمە ئاغا کردوە. حسێن نازم لە نوسەرانی بیستەکانی سەدەی بیستەم بوە، ئەویش لە دەفتەرەکەی دا بۆ باسی ئەم روداوە ئاماژەی بۆ هیچ سەرچاوەیەک نەکردوە. رەنگە پشتی بەستبێ بە گێڕانەوەی دەماودەم. لە کاتێک دا تالعی لە چەند شیعر دا دوعا لە مێمڵەکەی ئەکا و ئەفرینی بۆ ئەنێرێ، لە هیچ کام لە شیعرەکانی دا هیچ ئاماژەیەک بۆ ئەم چیرۆکە نیە. بەڵکو شیعرێکی تراجیدی تری هەیە کە شیوەنە بە بۆنەی مردنی یارەکەیەوە و هاوشێوەی شیوەنەکەی ئەحمەد بەگی کۆماسیە. ئەڵێ:

گلکۆی تازەی یار
ئارۆ شیم وە سەر گڵکۆی تازەی یار
خەیلێ کە.. رۆنەم نە پای ئەو مەزار
واتم:
"زولەیخای شۆخی خاتردار

یە چ کۆچێ بی ناوەعدە کەردی — من مەندەم پەی داخ هەناسە سەردی
یا تۆ خاترت هەر جە من ئێشان — یا تۆرت کەردەن جە قەوم و خوێشان
یا تۆرت کەردەن جە یانەی یاران — باوان رمیا بای مەزارت ئاوان
قەسەم بەو باڵای شۆخی عەرعەرت — بەو رێزەی رازان رێزەی شەکەرت
بەو قەوس قەتاران چون هیلال نۆت — بەو دەستە زوڵفان سیای عەنبەربۆت
بەو ئەگریجە و خاڵ سیا زوخاڵت — ئازیز جەو عەزاب چ تەورەن حاڵت؟"

دیم دەنگێ ئاما بە وەیلاوە
واوەیلا بەرز بی جە لای لەیلاوە
زاری و زایەڵەش کەرد تاکە تاوا
دودی هەناسەش جەرگ شکاوا

واتش:

"دێوانەی لێوەی لۆنگ بە پێڵ — قەیسی باربەلێو بەندەی هەردان گێڵ
ئەمەندەن رەونەق رەنگ نە جامینم — خەریکی سای فەرش خاکی زەمینم
جیۆتی لیباس کاڵای عەجەبرەنگ — سفیدەن بەرگم، باڵینم هەم سەنگ
ئەو دەستەی زوڵفان سیای عەنبەربۆم — ئامێتەن چەنی خاکپای گڵکۆم
لولوی سەرحەلقەی گێسوی مشکینم — مەندەن وە بێ ناز نە جای باڵینم
کرکرەی گەردن مینای بلورم — نەرم و نازکی سینەی کافورم
سەنگی روی ئەلحەد پێش کەردەن کارێ — قەترانەن نە تەرح سیاهەوارێ

دەسەڵات نیەن دەستم بەسیان
هەر نە سای یاران من یانەم جیان"
جەو ساوە تالع پرسا جەو مەزار
دیدەش یەک بوەن ئەسرینان هەزار

تێبینی: ئەم شیعرە بۆ یەکەم جار بەندە لە کەشکۆڵێکی دەسنوسی مەلا عەبدوڵای گەلاڵی وەرگرتوە و لە ژمارە... ساڵی... گۆڤاری رۆژی نوێ، دا بڵاو کراوەتەوە.

ئەحمەد بەگی کۆماسی شیوەنێکی بە سۆزی بۆ "لەیل" مکەی کردوە. نزیکەی 50 بەیتە. لەو شیعرەدا ئەڵێ:

گڵکۆی تازەی لەیل

ئارۆ شیم وە سەر گڵکۆی تازەی لەیل
نە پایەی مەزار ئەو لەیلی پڕ مەیل
جە دیدەم واران ئەسرینان چون سەیل

شیم وە سەرینش وە دڵەی پڕ جۆش — سەنگی مەزارش گرتەم نە ئاغوش

واتم:

ئەی دڵسۆز قەیسی لۆنگ وە کوڵ — موبارەکت بۆ یانەی بیدی چۆڵ
سەر هوردا نە خاک سەوڵی خەرامان — من مەجنونی تۆم، وەی تەور پێم ئامان
کۆچی بێ وادەت کارێ پێم کەردەن — بێزارم جە گیان، رازیم وە مەردەن
وەختەن چون قەقنەس تەن بۆ وە زوخاڵ — شاد بۆ بە گەردم زەلان و شەماڵ

دیم سەدایێ نەرم جە تۆێ خاکەوە — جەو یانەی تازەی حەسرەتناکەوە
ئاما وە گۆشم چون هەردە جاران
واتش:
ئەی مەجنون وێڵی کۆساران
سەوگەند بە واحید فەردی بێ هەمتا
بێ وادە کەردەن من جە تۆ جیا
رای جواو نیەن دڵ بێ قەرارەن
فرە سەنگ و خاک وە جەستەم بارەن... هتد

تێبینی: ئەمە چەند بەیتێکی شیعرەکەیە. چەند جارێ دەقی ئەم قەسیدەیە بڵاوکراوەتەوە. لە نوسینەوە و گواستنەوەدا هەندێ جیاوازی تێ کەوتوە. ئەوەندەی من ئاگادار بم تا ئێستا هیچ دەقێکی رەخنەیی و بەراوردکاری بڵاونەکراوەتەوە. (326-335: خەزنەدار)

ئەم دو قەسیدەیە لە دارشتنی "شێوە" و "ناوەرۆک" ی دەسپێک و کۆتاییەکەی دا لە یەک ئەچن. تەنانەت رستەی "من جە تۆ جیا" کە لە قەسیدەکەی ئەحمەد بەگ دا هاتوە، سەرەتای شیعرێکی تری تالعیە.

لێرەدا گرنگە بزانرێ:
ئەم شێوەنە بیرۆکەی کامیان بوە؟
کامیان لە پێش کامیان دا هۆنیوێتیەوە و کامیان لاسایی ئەوی تری کردۆتەوە؟
لە بەر ئەوەی سەردەمی ژیانی هیچ کامیان بە دیاریکراوی نازانرێ، رەنگە بێ مشتومڕ، نەکرێ ئەو بڕیارە بدرێ، بەڵام بەراوردکردنی سەردەمی هەردو شاعیر ئەتوانێ یارمەتی ساخکردنەوەی ئەمە بدا.
ناوچەی ژیانی حەمە ئاغا بەشێ بوە لە قەڵەمڕەوی میرایەتی بابان، لە ژێر دەسەڵاتی میرەکانی بابان دا بوە.
ناوچەی ژیانی ئەحمەد بەگ بەشێ بوە لە قەڵەمڕەوی ئەردەڵان، لە ژێر دەسەڵاتی والیەکانی ئەردەڵان دا بوە.
ئەگەر تالعی لە سەردەمی ئەورەحمان پاشا دا یان لە سەردەمی ئەحمەد پاشادا ژیابێ، بەوە روناکیەک ئەکەوێتە تاریکایی سەردەمی تالعیەوە. بەڵام ئەورەحمان پاشا و ئەحمەد پاشا لە دو سەردەمی جیاوازدا ژیاون:
- ئەورەحمان پاشا لە 1204 ک/ 1789 ز دا بۆ یەکەم جار کاروباری میرایەتی بابانی گرتۆتە دەست و لە 1228 ک/ 1813 ز دا مردوە.
- ئەحمەد پاشا لە ساڵی 1254 ک/ 1838 ز دوای مردنی باوکی کاروباری گرتۆتە دەس و لە 1264 ک/ 1848 ز دا لە بەردەم لەشکری عوسمانی دا شکاوە و کۆتایی بە دەسەڵاتی هاتوە.
ئەحمەد بەگی کۆماسی هاوزەمانی مەولەوی بوە. لەگەڵ مەولەوی دا شیعریان ئاڵوگۆڕ کردوە. مەولەوی لە شیعرەکانی دا بە خاڵۆی کۆماسی ناوی بردوە و، چەندین بەیتی ئەحمەد بەگی تێهەڵکێشی شیعرەکانی خۆی کردوە. ئەمەش سەرەڕای پەیوەندی دۆستانەی هەردوکیان نیشانەی پایەی بەرزی شیعرەکانی ئەحمەد بەگە، ئەگینا شاعیرێکی گەورەی وەکو مەولەوی شیعری لێ نەئەخواست و تێهەڵکێشی شیعرەکانی خۆی نەئەکرد.
ئەگەر کۆماسی هاوزەمانی مەولەوی (1806 – 1882 ز) بوبێ و، خۆیشی لە ساڵانی (1798 – 1878 ز) ژیابێ، کەواتە تالعی کۆنترە لە کۆماسی و، رەنگە تالعی ئەم بیرۆکەیەی بە شیعر هۆنیبێتەوە و، دوای ئەو کۆماسی قەسیدەکەی خۆی دانابێ، کە هەم درێژتر و هەم رەوانتر و هەم بەهێزترە.
محەمەد عەلی قەرەداغی، بووژاندنەوەی مێژوی زانایانی کورد، ب 3، بەغداد 2000، ل 274 – 280، لەم بابەتەدا ئاماژەی بۆ ئەو سەرچاوانە کردوە کە هەندێ لە شیعرەکانی تێدا بڵاوکردونەتەوە. 3 پارچەی تری بڵاوکردۆتەوە کە لە دەسنوسێکی وەرگرتوە، وەکو خۆی نوسیویەتی هەندێ بەشی ساڵی 1234 ک نوسراوەتەوە:
چراخ پەروانە
دڵ بێ تۆ تۆتۆن
... بۆشەن
لە بەر ئەوەی باش بۆی نەخوێنراوەتەوە ئەوەندەی هەڵە تێدایە کەڵکێکی ئەوتۆی لێ وەرناگیرێ.
یەکێ لە تایبەتمەندیەکانی تالعی، شیعری درێژە.

# هۆنراوەی داستانی

## داستانی دڵداری:

**(مەنیجە و بیژەن وەک نمونە)**

جاری یەکەم ساڵی 1966 ز لە پاریس لە لایەن "د محەمەد موکری" پێشەکی و تەرجومەی بە فەرەنسی بڵاوکراوەتەوە.

جاری دوەم ساڵی 1383 ی هیجری خۆرشیدی لە تاران لە لایەن "ایرج بهرامی" ەوە بە "پیشگفتار، تصحیح، توضیح و واژەنامە" ەوە لە گەڵ پێشەکیەکی فارسی بڵاوکراوەتەوە.

مەنزومەی "مەنیجە و بیژەن" کە پیکهاتوە لە 977 بەیت نوسەرەکەی دیارە وەکو بەهرامی دەڵێ رەنگە لە کۆتایی قەرنی 12 یا سەرەتای قەرنی 13ی کۆچی دا هۆنرابێتەوە. لە بنەڕەت دا بەشێ بوە لە "شاهنامەی کوردی".

هۆنەر داستانی "مەنیجە و بیژەن" ی لە "شاهنامەی فیردەوسی" ەوە وەرگرتوە و، بە دەسکاریەکی کەمەوە کردویەتی بە کوردی. تێکستەکەی لە بەر دەس دایە، بەڵام نە دانەرەکەی و، نە سەردەمی دانانەکەی هێشتا ساغ نەبۆتەوە، بۆیە لێکۆڵینەوەی داستانەکە دابڕاو نەبێ، لە لێکۆڵینەوەی ژیانی دانەرەکەی و، لەو ژینگە کۆمەڵایەتی و ئابوری و رۆشنبیری و سیاسیەی کە ئەم بەرهەمەی تێدا خوڵقاوە.

## کورتەی داستان

بیژەن لە باوکەوە کوڕی گیوی گودەرز و، لە دایکەوە کوڕی رۆستەمی زاڵە.

مەنیجە کچی ئەفراسیاوی شای تورانە.

لە وڵاتی ئەرمەن، کە بەشێ بوە لە سەرزەمینی ئێران، بەراز زۆر ئەبێ زەرەری زۆر لە کشتوکاڵ و ماڵ و دارایی دانیشتوانی ناوچەکە ئەدەن. خەڵک ئەچن بۆ شکات بۆ لای کەیخەسرەو شای ئێران.

کەیخەسرەو سێ هەزار سواری جەنگی ئامادە ئەکا و، لە دانیشتنێکی تایبەتی دا داوا لە پاڵەوانەکانی ئەکات بچن بۆ قەلاچۆکردنی بەرازەکان. پاڵەوانەکان سەریان دائەخەن. شا بۆ ئەوەی هانیان بدا گەنج و گەوهەر

ئەخاتە بەر دەمیان. لە ناو هەموویان دا بێژەن دانەیەک یاقوت هەڵئەگرێ و ئامادەیی دەرئەبڕێ بچێ بۆ ئەم جەنگە. هەرچەندە باوکی لێی تورە ئەبێ بەڵام لە بڕیارەکەی خۆی پەشیمان نابێتەوە. داوا لە شا ئەکا یەکێ لە مەردانی جیهاندیدەی لە گەڵ بنێرێ چاوساغی بکا بۆ دیاری ئەرمەن. شا داوا لە گورگین، یەکێکی تر لە پاڵەوانەکانی ئێران، ئەکا لە گەڵی بچێ. ئەویش ڕوگیر ئەبێ بە نابەدڵی لە گەڵ بێژەن ئەڕوا.

بێژەن لە گەڵ گورگین بە ڕێ ئەکەوێ. پاش چەندین ڕۆژ ڕێ پیوان ئەگەنە جێگەی مەبەست. سەد خێمەی ڕەنگینی زەرنیگاریان هەڵدا. بێژەن داوای لە گورگین کرد بچن بۆ بەراز کوشتن، بەڵام گورگین بێژەنی داوەتە بەر تانە و تەشەر. خۆی گەوهەری لە شا وەرگرتوە با خۆی بچێ بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکەی.

بێژەن تەنیا سوار کەوتە ڕێ. لە دەربەندێک دا کە بێشەی کۆبونەوەی بەرازەکان بوە، ئەکەوێتە کوشتنیان. هەزارانیان ئەکوژێ و کەڵبەکانیان ئەشکێنێ تا لە گەڵ خۆی بیباتەوە و لە پاداشتی ئەوەدا زێڕ و گەوهەری پێ وەربگرێ لە شا.

گورگین دوای گەڕانەوەیان ئەترسێ ببێ بە پەندی خاس و عام و لای کەیخەسرەو شەرمەزار بێ ئەیەوێ بێژەن توشی داوی بەڵایەک بکا. باسی مەنیجەی کچی ئەفراسیاو و، جوانی و بەزمی گەڕان و سەیرانی ئەوی بۆ ئەکا. بێژەن تەفرە ئەدا بچێ بۆ سەیری مەنیجە.

بێژەن ئەگاتە سەیرانگاکەی مەنیجە. سەری لە باخ و کۆشک و کۆڕی ڕابواردنی سوڕ ئەمێنێ. لە ماندویەتی دا لە بن دارێک دا خەوی لێ ئەکەوێ. کە نیزەکەکانی مەنیجە بێژەن ئەبینن و مەنیجەی لێ ئاگادار ئەکەن. مەنیجە دێ بۆ سەیری کە ئەیبینێ شەیدای ئەبێ. هەڵی ئەسێنێ و لە گەڵ خۆی ئەیباتەوە بۆ بەشداری لە ئاهەنگەکانی دا. بێژەنیش شەیدای مەنیجە ئەبێ. ماوەیەک پێکەوە ئەبن خەریکی ڕابواردن ئەبن. دەرمانی بێهۆشی ئەدا بە بێژەن و بە بێهۆشی ئەیباتەوە بۆ ناو کۆشکەکەی.

بێژەن دێتەوە هۆش خۆی بەڵام بە خۆشی ڕابواردن دا ئەکەوێ. بە خواردن و خواردنەوە و بەزم و ئاهەنگ ماوەیەک بە سەر ئەبەن. باوکی مەنیجە بەم ڕیسواییە ئەزانێ. ئەنێرێ بێژەن بگرن و مەنیجەش سزا بدەن. نێردراوەکەی ئەفراسیاو ناتوانێ بە زۆر بێژەن بگرێ فێڵی لێ ئەکا پەلبەستی ئەکا و ئەیباتە بازاڕ هەڵی ئەواسێ. بۆ ئەوەی بیکا بە پەند. مەنیجەش ڕوت ئەکەنەوە بە ڕوتی فڕێی ئەدەنە دەرەوەی شار.

پیران، یەکێ لە دانایانی توران، کە هاودەمی ئەفراسیاو بو، کوشتنی بێژەنی بە خراپ زانی، داوای لە شا کرد لە باتی ئەوەی بیکوژێ بیخاتە زیندانەوە. شا بێژەنی هاویشتە قوڵایی زیندانێکەوە کە ئەکوانی دێو دروستی کرد بو. کوڕەکەی ئەکوان بەردی زلی نا بو بە دەرگاکەیەوە و پاسەوانی لێ ئەکرد. ئەکوان دێوێکی گەورە بو ڕۆستەم کوشت بوی. کوڕەکەی ئەکوان ئەو داخەی لە دڵ دا بو.

مەنیجە کە بە ڕوتی لە شار دەر کرابو بە گەڵا خۆی داپۆشی بو. منداڵێکی دی پرسیاری زیندانەکەی شای لێ کرد. منداڵەکە شارەزا بو مەنیجەی برد سەری. لە سەر گابەردی سەربانی زیندانەکە دانیشت. درزێکی دی لە درزەکەوە گوێی لە ناڵەی بێژەن بو. لە گەڵی کەوتە قسە. هەمو ڕۆژ سواڵی ئەکرد هەندێ خۆراکی پەیدا ئەکرد و ئەیبرد بە گوریس شۆڕی ئەکردەوە بۆ بێژەن.

گورگین، بە تەنیا گەڕایەوە ئێران. کەڵبەی بەرازەکانی لە گەڵ خۆی بردەوە. وتی بێژەن ویستی کەڵێ بگرێ، کەمەندی بۆ هاویشت، کەڵەکە جادو بو، لە باتی ئەوەی بێژەن ئەو رابکێشێ، ئەو بێژەنی راکێشا و، ئیتر دیار نەما و ون بو.

گیو، باوکی بێژەن، ئەم چیرۆکەی نەسەلمان، پێی وابو گورگین پیلانی لە کوڕەکەی گێراوە بیفەوتێنێ. پەنای برد بۆ شا، کوڕەکەی مرد بێ یان زیندو، بۆی بدۆزێتەوە. گورگین هەمان چیرۆکی بۆ شا گێڕایەوە. شا باوەڕی پێ نەکرد. گورگینی زیندانی کرد. شا چەندی سۆراخی کرد، هیچ نیشانەیەکی دەس نەکەوت. سەرەنجام لە رۆژی نەورۆز دا، کە تەمومژ لە ئاسمان رەویەوە و، دنیا رۆشنی تێکەوت، ناردی، جامی جەمیان هێنا. سەرنجی هەمو دنیایان دا، دەرکەوت بێژەن ماوە بەڵام، لە وڵاتی توران، لە ناو زیندان دایە.

رۆستەم لە زابول دەژیا. شا نامەی بۆ نوسی بێژەن رزگار بکا. گیو نامەکەی بۆ برد. رۆستەم بەڵێنی رزگارکردنی دا. بیری کردەوە دو رێگەی لە بەردەم دایە: لەشکرکێشی، کە لەوانەیە ببێتە هۆی کوشتنی، یان تەگبیر بۆ رفاندنی لە زیندان. رێگەی دوەمی پەسەند کرد.

رۆستەم چو بۆ لای شا. تەگبیری کرد کە خۆی و کۆمەڵێ لە هاوڕێکانی، لەوانە گورگین، خۆیان بگۆڕن بە جلی بازرگانی گەوهەرفرۆشەوە بچن بۆ خاکی توران و هەوڵی رزگارکردنی بدەن. شا نەخشەکەی پەسەند کرد. گەوهەری زۆری بۆ ئامادە کردن.

رۆستەم رەخشی ئامادە کرد. لە گەڵ هاوڕێکانی بە خشڵ و گەوهەرەوە بە رێ کەوتن. بە کەشتی لە ئاو پەڕینەوە. رێگای دوریان بڕی گەیشتنە کەناری پایتەختی توران. توشی پیران بون. کە یەکێ بو لە گەورە کاربەدەستانی وڵات. رۆستەم خۆی دەرخست کە ئەوان بازرگانی نەشارەزان ئەترسێ کاڵاکانیان لێ بسێنن داوای لێ کرد شوێنێکی ئەمینی بۆ بدۆزێتەوە تیا نیشتەجێ بن. پیران پێشنیاری بۆ کردن لە کۆشکەکەی ئەودا بمێننەوە تا کاڵاکانیان ساغ ئەکەنەوە.

رۆستەم ماڵی پیرانی کردە بارەگا کەوتە ئاشکراکردنی کاڵا بە نرخەکانی. لە هەمو لا دەنگی دایەوە. مەنیجە بیستی چەند بازرگانی ئێرانی هاتونەتە خاکی توران. چو بۆ سەردانیان هەواڵی رۆستەمیان لێ بپرسێ. خۆیان لێ نەبان کرد. باسی بێژەنی بۆ کردن. بە ناوی بەزەییەوە مریشکێکی برژاویان دایە ببیا بۆ بێژەن. مەنیجە مریشکەکەی بۆ بێژەن برد. لە ناو خواردنەکەدا موستیلەیەکی تێدا بو. بێژەن موستیلەکەی ناسیەوە. نهێنیەکەی درکاند. مەنیجەی تێ گەیاند کە ئەوە رۆستەمە هاتوە بۆ رزگارکردنی ئەو.

رۆستەم نەخشەی رزگاری دانا. داوای لە مەنیجە کرد بۆ ئەوەی شوێنی زیندانەکە بدۆزنەوە ئاگرێکی گەورە لە سەربانەکەی بکاتەوە. رۆستەم چوە سەر زیندانەکە. کوڕەکەی ئەکوان کەوتە شەڕ لە گەڵ رۆستەم تۆڵەی خوێنی باوکی لە رۆستەم بکاتەوە. بەڵام رۆستەم ئەویشی کوشت. کەوتنە هەڵکەندی دیوار و لابردنی بەردەکان. بەڵام بێژەن لە قوڵایی زیندانەکەدا نەیتوانی سەر بکەوێ. ئەبو بە کەمەند هەڵبکێشرێ.

ڕۆستەم داوای لێ کرد کە گورگین ببەخشێ. بێژەن لە پێس دا ئامادە نەبو لێی ببورێ. ڕۆستەم هەڕەشەی لێ کرد کە ئەگەر لێی نەبورێ ئەمیش لە زیندان دەری ناهێنێ. بێژەن بە ناچاری بە ڕۆستەمی بەخشی. بێژەن لە زیندان دەرهێنرا.
سپای توران بە کارەکەیان زانی. پەلاماری ڕۆستەم و هاوڕێکانیان دا. شەڕ قەوما. نەیانتوانی چاری ڕۆستەم بکەن. هەندێ لە کەلوپەلە بەنرخەکانی کۆشکی ئەفراسیاو شا تاڵان کرا. ڕۆستەم بە سواری ڕەخش و، هاوڕێکانی بە سواریی بێژەنیان دەرباز کرد، مەنیجەشیان لە گەڵ خۆیان "هەڵگرت".

ڕۆستەم بە سەرکەوتویی گەڕایەوە ئێران. پێشوازی قارەمانانە کران. ئاهەنگ و زەماوەند ڕێک خرا. مەنیجە و بێژەن بە یەک شاد بون. ڕۆستەم گەڕایەوە زابول.

## تێبینی:

1. تێکستەکەی ئاغای بەهرامی: بە ڕێنوسی فارسی نوسراوە، لە هەندێ بەیتی دا وشەکان بە هۆی چاپەوە پارچە بون، لە هەندێکیشیان دا لەنگی هەیە.
2. ئەمە کورتەی وەرگێڕدراوە کوردیەکەیە نەک فارسیەکەی فیردەوسی.
3. ئەو ژمارانەی خراونەتە سەر سەرەتای هۆنراوەکان، ژمارەی زنجیرەی بەیتەکانی داستانەکەن.

## چەند سەرنجێ

لەم داستانەدا چەند دیاردەیەک، کە پەیوەندی نزیکیان هەیە بە تێگەیشتنی گشتی ژیانی کۆمەڵایەتی و سنوری ڕێکخراوەی بەها ڕەوشتیەکانی کۆمەڵەوە، لە زۆری چیرۆکەکانی دا دوبارە بونەتەوە و، بە زەقی بەرجەستە کراون. بۆیە ئەشێ ئێستیان لە ئاست دا بکرێ. لەوانە: پیلانگێڕی و، ڕابواردنی دنیایی و، خۆشەویستی جەستەیی:

## پیلانگێڕان

لە "مەنیجە و بێژەن" دا پیلانگێڕان، بە شێوەی جۆراوجۆر وەکو دانەر ناوی ناوێ: "مەکر"، "فەند"، "ئەفسون"... کارێکی ئاسایی ڕەوایە بۆ گەیشتن بە ئامانج، ئامانجەکە هەرچۆنێ بێ، سپی بێ یان ڕەش، باش بێ یان بەد، پاک بێ یان پیس. لە چەند قۆناغی داستانەکەدا تەفرەدان، بێهۆش کردن بە دەرمان، خاپاندن و فێڵکردن، خۆگۆڕین بۆ چەواشەکردن، وەکو ڕەوشتێکی ئاسایی دوبارە بۆتەوە. نمونەکانی:

نمونە 1: تەفرەدان
بۆ ئەوەی ناحەز بهاوێژێتە داوی بەڵاوە. گورگین بۆ ئەوەی بێژەنی لە کۆڵ بێتەوە تەفرەی ئەدا بیبا بۆ سەیری مەنیجە و سەیران و کەنیزەکەکانی:

| | |
|---|---|
| ترسا، ئە بێژەن، شوم ناپەسەند | سازناش "ئەفسون" خاوەن "مەکر" و "فەند" |
| واتش مەر "مەکرێ" باوەڕۆم ئە کار | سا مبۆم سەرژان واتەی ڕۆزگار |
| بپێچۆم ئە "دام بەڵای ناگەهان" | وەرنە بەدنامیم نمەبۆ پەنهان(105) |

(109)جەو تەرەف جە مولْک شای ئەفراسیاب حەسارێ کێشان. باغچەی بۆ گولاب
سەراوش جە تەرح بەهەشت منمانۆ | نە نەورش نوراج و قومری موانۆ
زەمینش نە تەرح زەعفەران کالاّن | خاکش وە شاخەی یاسەمەن مالاّن
حەوزێ بە سەد ناز ئاراستەن جە سەنگ | وەستەن چەند نوتاق توحفەی عەجاب رەنگ
هەر ساڵ کناچەی شای ئەفراسیاب | مشۆ وە سەیران باغچەی بۆ گولاب
زولْفان عەنبەرەن، مەنیج نامشەن | چەند هەزار شاهان گرفتارشەن
منیشۆ وە بان کورسی زەرنیگار | گۆش کەرۆ بە دەنگ ساز مۆسیقار
گاه و چەند کەنیز بالاّ ئەونەمام | مەکەرۆ سەیران باغچەی عەمبەر فام
ئەگەر بوینی بەژن و بالاّشان | شاد مەبی وە دین خاڵ ئالاّشان
گاه مەیلی گولْگەشت دلْنەوازیشەن | گاه عەزم سەیران چەوگان بازیشەن
گاه مشۆ نە سەحن چناران بەرز | گاه تەرتیب مدی زولْفان شەوتەرز
هەر رۆ تا شەوان منیشۆ بە ناز | جەو دما تەرتیب مدۆلوا باز
شاهان حەسرەتمەند هەر یەک نیگاشەن | سەران سەر توفەیل زولْف سیاشەن
خاستەر من و تۆ وە تەنیا سوار | بشیم بەو مەکان سەراو میرغوزار
بکەریم سەیران بانوی بی نەزیر | سێ چوار کەس لێشان باوەریم ئەسیر
جە ئەو کەنیزان زولْفان بۆ عەمبەر | پۆسە بە تورکان بنمانیم زەرەر
بێژەن چون شنەفت جە گورگین حەواڵ | کەرش ئیرادەی هەوای زولْف و خاڵ
نزاناش یەقین گورگین بەدبەخت | مەپێچۆش نە دام چای زیندانی سەخت
جەو دما بە شاد پیاڵەی شەراو | بێژەن بنۆشا و شی نە جامەی خواو(127)

نمونە 2: خەواندن

بە دەرمانی بێهۆشی بۆ ئەوەی دڵدار بە دیل بگری. مەنیجە پاش رابواردن بێژەن بە دەرمان بێ هۆش ئەکا و لە ناو سنوقی تایبەتی دا ئەیگوێزیتەوە بۆ ناو کۆشکەکەی خۆی:

(198) شی وە لای بێژەن تورکی جادوکار | دییش کە شی نە خواو دلێر نامدار
زەرێ جە "داروی بێهۆشی" کەم فام | مالاّش ئەبینی بێهۆش بی تەمام
نیاش نە سندوق ساختەی چوب عود | جەو دما نە جاش هۆرێزا بە زود
فەرما سارەبان کێشاشان قەتار | بار کەرد کەژاوان توحفەی زەرنیگار
بەرشین جە مابەین باغچەی بۆعەمبەر | بە تەعتیل و جەخت تا دادەی ئەکبەر
شی وە قەسر وێش خالاّن لاجیوەرد | تەک دا وە پشتی سەرخۆش و بێ دەرد
رەونەق دا خالاّن جەمین پڕ جە نور | شاد بین وە دینش نازاران تور
فەرما تا سنوق ئاوردەن پەرێش | لادێ عەیان کەرد حاڵ خەستەی وێش
واتش: "کەنیزان! بالاّ زەرستون | دەرونم جە عەشق، سەر پڕەن جە هون
ئەورۆ کە بالاّی بێژەن دیم بە چەم | سۆچیام وێنەی پەروانەی لای شەم
حەرفێ مەواچۆم یاران پەرێتان | مەبادا رەقیب بشنەوێ لێتان"
جەو دما ئید وات شۆخ نازەنین | مالاّ بە بینیش مایەی موشکی چین
بەو گرد عەمبەر، داروی فراوان | بێژەن بێدار کەرد جە شیرین خواوان

بێدار بی چە خواو سەرسام و بێدەنگ   وێش دی نە مابەین حوجرەی عەجاب رەنگ
گێلاوە چە رەنگ کێشا ئاهی سەرد   خەیاڵان ئاما عەقڵ و فامش بەرد
ئاما بە گوفتار شای سۆسەن خاڵان
واتش: "ئەی جەوان! وەس کەر خەیاڵان
سەرت هۆر گیرۆ چە وەختی خاوەن   یە قەسری جامرێز ئەفراسیاوەن
ئاروی بێهۆشی مایەی عەتاران   ماڵام نە بینیت چەنی نازاران
هەنی مەکەر ویر سەودای خەیاڵان   شاد بیۆ وە بەژن سۆسەنی خاڵان
بنۆشیم بە شەوق جورعەی جامی مەی   پشتان بە وە بەژن باڵای تولّ بەی"
بێژەن وات: "ئەی شۆخ! بێ خەوەر چە کار   نەترسای چە ئەنگ نە روی رۆزگار؟
ئیسە مەزانۆم سا کە سەرەنجام   مەبیم وە سەرژان واتەی خاس و عام
ئیران و توران گرد کینە کێشەن   شەوان تا بە رۆ عەداوەت پیشەن
من کەردی نە دام بەڵا گرفتار   بە قەولی شەیتان شومی بەدکردار"
"ئەر سەد کە بابۆم حوکمش عەزیمەن
ئیسە پەهلەوان چە وەختی بیمەن؟
چە سەودای عەشقت جەرگم کەبابەن   چە پەروام چە تیغ ئەفراسیابەن؟"
سا کە ئید شنەفت سەرسام کەم زەین   گرد شی نە ویرش تانە و مناو مین(!)
گاە بۆسەی لەبان زولالی بێ گەرد   گاە دەس نە مابەین شەمامانی زەرد
گاە شاد بی بە تار زوڵفانی شەودیز   گاە سەیر خاڵان مەنیجەی عەزیز
چل شەوانەرۆ گرتشان مەقام   مەنۆشان بە شاد بادەی عەمبەر فام....(227)

نمونە 3: خاپاندن

بۆ ئەوەی بە فێڵ بە سەر یەکێکی لە خۆت بەهێزتردا زاڵ بی. گرسیۆز کە ئەچێ بۆ گرتنی بێژەن، بێژەن لێی رائەپەڕێ و بە خەنجەر روبەروی ئەبێتەوە. گرسیوز لە ترسی ئەوەی چاری بۆ ئەکرێ، بە قسەی خۆش بێژەن ئەخاپێنێ و پەلبەستی ئەکا:

(239) دییش بێژەن چەنی و سەوڵ سایەدار   پشتانش نە روی کورسی زەرنیگار
کێشا بانگ سەخت گرسیوز بە قار   روش کەرد بە بێژەن پەهلەوان کار:
"نەترسای چە تیغ شای ئەفراسیاب
چە قارش جەرگی شێران هەن کەباب؟
هۆرێزە چە بان کورسی دانەبەند
بو تا دو دەست بنیۆم نە بەند!
سا کە ئەی فەرمان ئەفراسیابەن   نیەن جای دڕەنگ جەختت بە تابەن"
بێژەن چون شنەفت سیاە بی چە قار   سەڵا دا بە عەزم عەرسەی کارزار
نە تیغ و نە گورز، ئەساسەی ئەبەرد   هیچ ئەبی چە لاش کێشا ئاهی سەرد
دەس بەرد پەی خەنجەر پەهلەوانکار   پەنا بەرد بە زات بینای کردگار
واتش: "گرسیوز خەیاڵت چێشەن؟
قەسەم بە یەزدان بێ هەمتای وێشەن

## هەجو

سالم هەجوی چەند کەسێکی کردوە. هەروەک لە "مەدح" ەکانی دا "موبالەغە" ی زۆری کردوە، لە "هەجو" ەکانیشی‌دا دیسان "موبالەغە" زۆری کردوە. لە ئەدەبی فارسی دا وتویانە: "احسن" ی شیعر "اکذب" یانە. پێ ئەچێ سالم پێڕەوی ئەم پەندەی کردبێ.

لە شیعرێکی دا کە هەجوی میرزا سلێمان ئەکا، خۆی بە شاهێن، هەڵۆ، شێر و بەرامبەرەکەی بە قاز، چۆلەکە، گا، ئەشوبهێنێ:

| | |
|---|---|
| **تۆ قاز و ئەمن شاهێن، مەفرێنە بە دەورم دا** | **ئەک حەملە بەرم، گیر کەم چنگێ لە چیقەڵدانت** |
| **من توغرول و تۆ صەعوە، قەسەم ئەمەتە ناگا** | **میخلەب لە بەزت گیر کەم دەرچێ لە عەقەب گیانت** |
| **من شێرم و تۆ گاوی شەراڕی و ناترسی** | **جوستەن کەم و بشکێنم وەک نەی هەمو ئێسقانت** |

قەڵەمەکەی خۆی و کەرەستەکانی ئەو بەراورد ئەکا:

| | |
|---|---|
| **بۆ من قەڵەمە نێزە، بۆ تۆ سوپەرە دەزگا** | **بۆ تەجروبە با لێدەم یەک زەربە لە قەڵغانت** |
| **نوکی قەڵەمم تیژە وەک نوکی درەوشی تۆ** | **سوهان زەدەیە فیکرم وەک گازنی بوڕرانت** |
| **رەنگینە هەمو شیعرم وەک نەقشی تەکەڵتوی زین** | **مەزمون کەشە فیکرم وەک قولاپی درومانت** |

(دیوان:51)

لەم شیعرەدا چەند وشەیەکی بەکارهێناوە کە تایبەتن بە پیشەی زیندرون، لەوانە: دەزگا، درەوش، گازن، سوهان، تەکەڵتو، کشتەک، مشتە، تەقەڵ، ئەخ، دەرزی، ئاوزەنگی...

پێ ئەچێ میرزا سلێمان شاعیر بوبێ، چونکە سالم روی تێ ئەکا و ئەڵێ: "سەراجی و هەم شاعیر..." بەڵام هیچ شیعرێکی ئەم لە بەر دەس دا نیە تا بەراورد بکرێ چی بەم وتوە.

## کوڕی عوج

لە شیعرێکی تری دا کە هەجوی میرزا عەبدوڵا ئەکا، بە "شتورمورغ" ناوی ئەبا کۆمەڵێ وشە بەکارئەهێنێ کە تایبەتن بە گیانداری جۆراوجۆر و، دیارە ئەم باڵابەرز یان وەکو ئەو باسی کردوە زۆر درێژ بوە. جا سالم درێژییەکەی لێ کردوە بە عەیبێکی گەورە:

مو لە لەشما، وا لە داخا بو بە نوکی نەشتەر
دڵ لە سینەم دا دەسوتێ هەروەکو مۆمی فەنەر
وا بە شیتی، پەشم و ریشی خۆت لە ئاگر بۆچ ئەخەی
وش بە هۆش بە دورکەوە سوتاوی برۆ هەی بێ خەبەر

شاهۆ تەن، لەق لەق خەرام، گەردن سەقاقوش، سەرزەغەن
سابرێن ریش، نافە ئەژنۆ، پێ شتورمورغ، گوێچکە کەر
مور خەسڵەت، شێر هەیبەت، پەششە قوەت، فیلە تەن
سەر خەرەک، بەردوخ مو، نینۆک و لالە، سەر سوپەر
گوربە خو، ژیژک بەدەن، سوچڕ مەکان، لوت کەمتیار

چنگ چەکوش، مو پڕ شەپش، پاپاخ چوپوش ڕەنگ جانەوەر
نیل مل، خوراک عوامل، سینە تیسکن، شان چەوێڵ
قاچ چلاک، دیرەک بەدەن، بەرچیخ بازوی بێ هونەر

خەڵکی ئەم ئەیامە دیت دیارە بە قوچی قامەتت
گەر بە تەرکیبت حساب کەم، باوکت عوجە و تۆ پسەر
فەرع تۆ ئەسلەن حقیقت معلب و رحمی کەس نیە
راستی وایە کە تۆ جنسی مناری ئەک بەشەر
ئیمتیحانت چۆن بکەم گەر ناگری ئەندازەی قەدت
سەر لە خایەت ناسوێ پۆپەی چناری ماسیدەر
خۆ لە بەر ماوەی درێژی زۆر زەرەرتە گەر بنوێ
سواری سمتت بێ لە بەغدا لێرە نابێ باخەبەر
"بەسیەسی میرزا بوەخشە نائێژم ئیتر هەجو"
نەقدی لەهوم دا بە جنسی سەهو و زیلەت سەر بە سەر
(وەرگیراوە لە ژین، ژ. 931. 19 ئاغستۆسی 1948. )

## وەزعی قومارییان

قومار بە واتای جۆرێ لە یاری بۆ بردنەوە و دۆڕاندنی پارە و شتومەک. هەندێ کەس "ئالودە" ی ئەبێ و لێی ئەبێ بە خویەک ناتوانێ وازی لێ بهێنێ. هەندێ جار ئەم خوە ئەبێتە هۆی نابوتی دارایی و دۆڕاندنی سامان و سەرمایە و، ریسوایی کۆمەڵایەتی کەسەکە وماڵوێرانی خێزانەکەی.

قومار لە روی کۆمەڵایەتیەوە بە کارێکی ناشیرین و، لە روی شەرعیەوە دەزگای دینی حەرام و، لە روی قانونیەوە دەزگای حوکمرانی قەدەغەی کردوە. لە بەر ئەوە قومار بە ئاشکرا نەکراوە، بەڵکو بە نهێنی لە ماڵان یان لە هەندێ جێگەی تایبەتی دا کراوە.

لە رۆژگاری سالم دا ئەبێ قومارکردن لە ناو هەندێ کوڕ و کۆمەڵ دا بە نهێنی کرا بێ. باسی 3 جۆر قومار ئەکا: ئەرد، ئاس و گەنجەفە.

ئەرد یاری تاوڵەیە کە تا ئێستاش ماوە و بە ئاشکرا لە زۆر جێگە ئەکرێ.

گەنجەفە یاریەکی ئێرانی بوە بە وەرەق کراوە لە سەردەمی سەفەویەکان دا داهاتوە ئێستا نە لە ئێران و نە لە کوردستان نەماوە.

ئاس، بەو جۆرەی سالم باسی کردوە ئێستا نەماوە.

سالم شیعرەکەی بە پێشەکیەکی ئەدیبانە دەست پێ ئەکا، وەکو هەمو جار گلەیی لە زەمانە ئەکا:

لە دەست ڕەنگرێژی دەوران ڕەنگی چیهرەم زەعفرانێکە
حەدیقەی دڵ لە بەر بارانی غەم وەزعی خەزانێکە
لە تەبعی ماهی گەردون و بوخاری بەحری ئەندوهم
مەتاعی سینەی چاکم وەکو خامی کەتانێکە
کەمانداری فەلەک بۆ بەختی من صەیادی خوێنرێژە
لە دڵما خاری میحنەت سەربەسەر وێنەی سینانێکە

باسی قومار دەرکاندنی بابەتێکی نهێنیە. کەسانی بەشدار توشی کێشە و دەردەسەری و هەندێ جار ناوزڕان ئەکا. سالم خۆی ناکاتە بەرپرسی ئەم دەرکاندنە. بەڵکو ئەیخاتە ئەستۆی قەڵەمەکەی. وێنەیەکی جوانی قەڵەمی ئەو سەردەمە ئەکێشێ کە نوکەکەی دو لەت بوە، ئەو بە دوزمان ناوی ئەبا کە نیشانەی "فیتنەیی" ە:

به دڵسۆزی فەلەک ئیتر ئەرەستویی دەوام ناکا
قبوڵی مەرهەمی چۆن بێ، کە زەخمی من نیهانێکە؟
دڵ نازارم ئەما یان بەهانەم وەزعی گەردونە
فوغانی خۆم و دڵ یاران لە دەست پیر و جوانێکە
قەڵەم بێ کلکی کاتب، خۆ بە خۆ، مەشغوڵی نوسینە
لە کەشفی سیرڕی پەنهانا عەجایب دو زبانێکە
جوان بوم گەر لە غەم پیر و، جوان پیریم چ ئەزنیکە
لە دەست وەزعی قوماریان داد و شەکوام داستانێکە

قومارکەرەکان لە باتی ئەوەی کاری بە سود بکەن، یا خەریکی خواپەرستی بن. شەو تا ڕۆژ ئەبێتەوە خەریکی قومار و باسی قومارن:

لە باتی شوغڵ و تەسبیح و نماز و هاتوچۆی مەسجید
لە بەحسی نەرد و ئاس و گەنجەفە هەردەم بەیانێکە

قومارکەرەکان یاری تاوڵە ئەکەن. یەکێ ئەیباتەوە و یەکێ ئەیدۆڕێنێ. دۆڕاو پارەی پێ نیە، یان پێی نەماوە، بۆ ئەوەی درێژە بە یاریەکە بدا موستیلە و پێڵاوەکانی و شانە و خەنجەرەکەی لە بارمتەی هەندێ پارەدا دائەنێ و پارەکەش ئەدۆڕێنێ. ئەوەی لێرەدا سەرنج ڕائەکێشێ:

یەکەم، شانەیە کە ئەو سەردەمە پیاوانیش وەکو ژنان لەگەڵ خۆیان هەڵیان گرتوە بۆ داهێنانی ریش و قژی سەریان چونکە زۆری پیاوان ریشیان بەرداوەتەوە و، کاکۆڵ و پرچی درێژیان هەبوە.

دوەم، قرانە، کە دراوێکی ئێرانی بوە و، لەو کاتەدا لە سلێمانی، وەکو ئەم نوسیویێتی، بە دراوی ئێرانی سەودا کراوە:

لە نەرەی "بێنە دوشەش" یان لە چوار لا شەش جیهەت پڕ بو
لە دەنگی "مۆرە دەها دەی زوکە ها"، ئاخر زەمانێکە
گوشادی دا فلان مۆرە، مەبینە، با بدۆڕێنێ
حەریف تۆ بێنە دەی داشێ بە تەنیا هەر لە خانێکە
قرانی بەستە کەو، بەرنو، بڵێ سادەی حەریف زوکە
چ خۆشە مۆرە گەر بێنی لە ڕێی پێنج و سیانێکە
حەریفی نەوجەوان ئەسبابی پیری چەندە هەرزان کرد
نگین و کەوش و شانە و خەنجەری ڕەهنی قرانێکە

گەنجەفە یاریەکی ئێرانی بوە. لە سەردەمی سەفەویەکان دا داهاتوە. بە وەرەق کراوە. وەرەقەکان لە تەختەی داری تەنک دروست کراوە. لە سەر هەر وەرەقێ نیگاری لە سەر بوە. نیگارەکان بریتی بون لە هی شا، وەزیر، غولام...

سالم وێنەیەکی کۆمێدی و ناکۆکی کۆڕی قومارچییەکان ئەکێشێ. حاجی حسەین، کە باوەڕبارە ئەبێ کاری حەرام نەکا، کەچی ئەو چاوێری کۆڵانەکە ئەکا ئەوەکو پیاوەکانی دەزگای حوکمڕانی بێنە سەریان، یاریەکەیان لێ تێک بدەن و سزایان بدەن.

حەکیمیش وا لە خزمەت لۆتی‌یا جۆیایە بۆ بی بی
لە سەفحەی گەنجەفە و ئاسا حەکیمی لەوح خوانێکە
لە ترسی هەیبەتی رۆستەم وەکو تورانییان پڕ بیم
تەلایەداری رێ حاجی حسەینیش دیدەبانێکە
فلانیش لەوح خوانە وا لە پەهلویان تەماشا کەن
لە بەر تەصویری ئاسا نەقشی لۆتی تیرەشانێکە
وەرەق چەند رەونەقی سافە کە عەکسی چیهرە ئەنوێنێ
لە قیتعەی قۆقزی لۆتی ئەڵێی پۆزەی بەرانێکە

لەمیش دا دۆڕاو و براوە هەبوە سالم بە گاڵتە پێ کردنەوە باسی دۆڕانی جلوبەرگ: کەوا و کڵاو و فێست و. چەکی شەڕ: قەمە و قامچی... ئەکا، ئەمانە کە نیشانەی پیاوەتی بون.

یەکی خست وا حەکیم ئەوراق و. لۆتی غافڵە یاران
سێ ئاسی وا لە مستایە و دو شاهی پشتیوانێکە
کەوا و ئارەقچن و فێستی کەچەڵ قەبڵا بە نۆ شایی
قەمە و قەمچی و ئەسلیحەی حەربی کوللەن تۆپی نانێکە
(ئەم شیعرە لە دیوانەکەی دا نیە، لە ژین، ژ 893. وەرگیراوە)

بڵاوبونەوەی قومار بە نهێنی، ئەگەرچی لە سنورێکی تەسکیش دا بوبێ، لە شارێکی بچوکی دواکەوتوی کۆنەپارێزی ئاینپەروەری وەکو ئەو سەردەمەی سلێمانی دا نیشانەیە بۆ هەڵوەشانی رێکخراوەی بەها بەرزەکانی کۆمەڵ و. پەیدابونی توێژێکی پارەداری بێ بەندوباری کۆمەڵایەتی و دینی. هاتوچۆی کاروانی بازرگانی لە نێوان سلێمانی و بەغداد لە لایەک و. لە نێوان سلێمانی و کرماشان و تەوریز و تاران لە لایەکی ترەوە هەروەکو کاڵای بازرگانی، نەریتی شاری و رۆشنبیری ئەهێنێ، هەندێ رەوشتی نالەباریش لەگەڵ خۆی ئەهێنێ، کە ئەشێ قومار یەکێکیان بوبێ.

هەندێ توێژی کۆمەڵ، لە هەندێ هەلومەرجی نائاسایی دا، لە شوێنێکی وەکو ئەوسای سلێمانی دا، کە بە هۆی ململانێی بەردەوامی میرەکانی بابان و. شەڕی چەند بارەی رۆم و عەجەم لە ناوچەکەدا و. ناگیرکران و دەستاودەستی دەسەڵاتی شارەکە لە نێوان دو هێزی دوژمندا، کە نائارامی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابوری، لێ ئەکەوێتەوە، پەنا ئەبەنە بەر خۆدزینەوە لە گیروگرفتەکانی ژیان. هەندێک لە رێگەی دەروێشیەوە و هەندێکی تر لە رێگەی یاری بە هەمو جۆرەکانیەوە لەوانە قومار. مەیتۆشی. تلیاک کێشان.

شارێکی نائارامی وەکو سلێمانی کە سالم لە وەسفی دا ئەڵێ:

شارێکی پڕ لە زوڵم و مەکانێکی پڕ لە شین
جایێکی پڕ لە شۆڕ و وڵاتێکی پڕ لە شەڕ

شتێکی ئاسایی بوە، قوماریشی تێدا بڵاو بوبێتەوە، ئەگەرچی حەرام و قەدەغە و عەیبیش بوبێ.

لەم جۆرە شیعرانەی سالم دا دو شتی دیار سەرنج رادەکێشن:

یەکەم. هەندێ لەم شیعرانە لە روی دارشتنی هونەری و لە روی زمانەوانیەوە ناگەنە ئاستی هونەریی شیعرەکانی تری، ئاخۆ ئەم شیعرانە لە بنەرەت دا وەها دارێژراون یان لە نوسینەوەیاندا دەسکاری کراون و لە وشە و رستە و بەیتەکان دا ئاڵوگۆڕ کراوە؟ ئەوە مەگەر ساخکردنەوەی دیوانەکەی و بەراوردی چەند رونوسی جیاوازی شیعرەکان وەڵامی بداتەوە.

دوەم. سالم لە دوا بەیتی هەمو شیعرەکانی دا ناوی ئەدەبیی خۆی هێناوە، بەڵام لەم جۆرە شیعرانەدا ناوی خۆی نەبردوە. ئاخۆ ویستویەتی ناوی خۆی لەوانە بشارێتەوە کە برینداری کردون. یان پێی وا بوە ئەم جۆرە شیعرانە لە ئاستی پایەی ئەو و ناوی ئەدەبی ئەودا نین. ئەمەیان مەگەر خۆی وەڵامی بداتەوە.

لە شیعرێکی تردا کە دراوەتە پاڵ ئەو و لە هی ئەو ناچێ ئەڵێ:

لە دەس ئەم ئەسپە بۆزە بێ قەرارم — هەمیشە دڵ غەمین و داغدارم
لە بەر بێنی برینی لاشەویلەی — وەها گێژم، نەماوە ئیختیارم
وەرن کاروانی توجاریم ببینن — مەتاعم مشکیە، هەمبانە بارم
....
لە تاو کێم هێندە دەست و پەل دەشۆرم — دەڵێی ئەو سۆفیەکانی تۆبەکارم
ئەوەندە راست و چەپ فکریم لە زامی — بە بێ عیللەت ئەمیستاش خێل و خوارم
دەنوم جار جار لە ژێر سایەی چنارا — لە شلپەی دەنگی گوێچکەی گەشکەدارم
بۆ خۆم سەرگەشتە و ئەسپیش وەهایە — هەمیشە بۆیە من زویر و زگارم 81

